# کۆیلەکردنی ژنان

**جۆن ستیوارت میل**

**وەرگێڕانی**

**ڕەسوولْ سولْتانی**

**هەولێر - ٢٠١١**



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **کۆیلەکردنی ژنان**
- نووسینی: جۆن ستیوارت میل
- وەرگێڕانی: ڕەسوولْ سولْتانی
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- پیتچنین: وەرگێڕ
- بەرگ: وریا بوداغی
- ژمارەی سپاردن: (٧٥) لە ساڵی ٢٠١٠
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١١
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٥٥٥)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

پێشەكی ........................................................................................ ٩
كۆیلەكردنی ژنان (١٨٦٩) ............................................................... ١٧
بەشی یەكەم..................................................................................... ٢٣
بەشی دووهەم .................................................................................. ٦٧
بەشی سێهەم .................................................................................... ٩٧
بەشی چوارەم ................................................................................. ١٤٣

## ئەم وەرگێڕانە...

پێشکەشە

بە خوشکەکانم (لەیلا و چنوور)

و

فرمێسکە غەریبەکانی غوربەتم (باران).

# پێشەکی

جۆن ستیوارت میل ساڵی ١٨٠٦ لە شاری لەندەن لە دایك بوو. جیمز میلی باوکی، کوڕی پینەدۆزێکی لادێیی خەڵکی سکۆتلەندا بوو کە چەند کەسێکی خێرومەند خەرجی خوێندنی ئەویان لە زانکۆی ئێدینبۆرگ گرتبووە ئەستۆ.

دواتر جیمز میل چووە باشووری بریتانیا و دەستی کرد بە پیشەی رۆژنامەڤانی. ئەو دۆست و موریدی جێرمی بێنتام بوو. بێنتامیش نوێنەری هەڵکەتووی ئەخلاقیاتی سوودگەرا (یولیتاریانیزم) بوو. جیمز میل رۆشنبیرێکی جیددی و پەیت بوو و باوەڕی بە یەکسانیی مرۆڤەکان هەبوو. ئەویش وەکوو لیۆپۆلد موتزارت خۆی پەروەردە و راهێنانی کوڕە گەورەکەی گرتە ئەستۆ و بەو جۆرە بواری بۆ کوڕەکەی رەخساند کە هەر لە منداڵییەوە لە دەوری خەرمانی زانست و زانیارییەکانی ئەو گوڵ بچنێتەوە. جۆن کە لە ماڵەوە پەروەردە دەکراو رادەهێنرا هەر لە تەمەنی سێ ساڵییەوە لە ژێر چاوەدێریی باوکیدا دەستی کرد بە خوێندن و فێر بوونی زمانی یۆنانی و دواتر ماتماتیك و دوای ئەویش مێژووی لاتینی و لە تەمەنی دوازدە ساڵیشدا رووی کردە فەلسەفە و لۆژیك و زانستی ئەخلاق. پەروەردەی جۆن بە شێوەی دووبارە کردنەوەی رووکەشیانە نەبوو. ئەو لە کتێبی "ژیانی من" دا دەڵێ: باوکم قەت ئیزنی نەدەدا کە فێرکاری و پەروەردەم ((تەنیا لە چوارچێوەی پرۆڤە و لەبەرکردندا قەتیس بمێنێ. ئەو هەوڵیدەدا تێگەیشتن و درك پێکردن و فێرکردن، پێکەوە بن و ئەگەر لوابایە کەوتبانە پێش فێرکارییەوە. جۆن لە کاتی پیاسەکردن لە نێو ئینگتۆن گرین لەگەڵ باوکی دەکەوتە چەلەحانێ و ورده ورده فێر دەبوو کە چۆن بەڵگەهێنانەوە (استدلالی) هەڵە شیتەڵ بکاتەوە و سەبارەت بە هەر دوو لایەنی



یەك کێشە بکەوێتە لێکدانەوە و داوەریکردن، لەم شێوازەدا ئەوەندە چووە پێشێ کە بوو بە پێشەنگ و سەرقافڵەی ئەوانی . بۆیەش نووسراوەکانی جۆن ستیوارت میل زۆر جاران باشترین بەڵگاندنەکان دەدەن بەدەست دژبەرەکانییەوە. بەڵام باوکی جۆن، نەیتوانی لە رووی هەست و سۆزدارییەوە کوڕەکەی پەروەردە بکا. جیمز میل بە چاوی سووك دەیڕوانییە شیعرو هەست و خەیاڵ و پێی شەرم بوو هەست و سۆزی خۆی دەربڕێ. هەر بۆیەش کوڕەکەی بە خەمو پەژارەوە خووی بەم بارودۆخە گرتبوو کە بێجگە لە هەستێکی تەواو ئەمەگناسانە هیچ هەستێکی دیکەی بۆ باوکی نەبێ، باوکێك کە هیچ کات سۆز و خۆشەویستیی خۆی بەرامبەر بەو دەرنەبڕی.

جۆن لە تەمەنی بیستویەك ساڵیدا پاش چوار ساڵ کارکردن لە لای باوکی لە ئیندیاهاوس (ماڵی هیند) تووشی قەیرانی فیکری هات. ئەو لە ماوەی ئەم چوار ساڵەدا چەندین وتاری لە بلاڤۆك گەلی رادیکاڵی وەك: وۆست مینستر ریویو دا، بڵاو کردەوە. لە ئیندیاهاوس جۆن دۆستی باشی پەیدا کردبوون و بە بێ ویستی باوکی لەگەڵ چەند لاوێکی رادیکاڵی دیکە بە مەبەستی گفتوگۆ لە سەر ئابووریی سیاسی و لۆژیك و دەروونناسی شیتەڵکارانە، دەستیان بە پێکهێنانی چەند ئەنجوومەنێك کرد. ئەو لەو قۆناغەدا بەو شتە گەیشتبوو کە خۆی پێی دەگوت "ئەو شتەی دەکرا ناوی بنێی ئامانجی راستەقینەی ژیان"، واتە "تێکۆشان بۆ چاکسازیی جیهان". بەڵام دوای چەند ساڵ خۆی وتی کە "مەکینەی بەڵگەهێنانەوەی رووت" (کە زیاتر بە لایەنگرانی بێنتام دەگوترا) تاریفێکە راست خۆیشی دەگرێتەوە. میلی لاو لە پاییزی ١٨٢٦دا کوڵ و کۆی دامرکا و بەرامبەر بە هەموو شتێك کەمتەرخەم بوو. خۆی لەم بارەوە دەڵێ: ((لەو چوارچێوە زەینییەدا، بیرم لەوە دەکردەوە کە راستەوخۆ لە خۆم بپرسم ئەگەر وای دابنێین تەواوی ئامانج و ویستەکانم بێنە دی، واتە ئەو ئاڵوگۆڕانەی بە ئاواتیانەوەم لە ناوەند و بیر و باوەڕەکاندا پێکبێ، لە چاو تروکانێکا وەدیبێن، ئاخۆ دەبنە هۆی شادمانی و بەختەوەریم؟ لێرەدا بە هۆشیارییەکی شادیهێنەرەوە، لێبڕاوانە گوتم: "نا!" بەو جۆرە بوو دڵی من لە هەناومدا تێکقرما: ئەو بنەمایەی تەواوی

ژیانمی لە سەر بنیات نرابوو، بوو بە تۆزی بانان". بە باوەڕی هەموو ئەو کەسانەی میل ڕێزی دەگرتن، گەورەترین سەرچاوەی بەختەوەری ئەو چێژەیە کە لە هاودڵی و هاودەردی لەگەڵ مرۆڤەکان و لە خێر و خۆشییەکانی ئەواندا بە مرۆڤ دەبڕدرێ. ئەو دەڵێ ویرای ئەوەیکە منیش بڕوام بەو قسەیە هەبوو، بەڵام "تێگەیشتن لەوەی کە ئەگەر من فلانە هەستم بوایە شاد و خۆشحاڵ دەبووم، نەدەبووە هۆی پشکووتنی ئەو هەستە لە مندا".

ئەو، بەو ئاکامە گەیشتبوو کە خووگرتن بە شیتەڵکاری، ((تاك بەرەو پشتگوێخستنی هەست و سۆزداری پاڵ پێوە دەنێ)). مرۆڤ بە گرینگیدانی روو لە زیاد بەو پێوەندییە لۆژیکی و هۆکارییانەی لە نێو شتەکاندا بوونی هەیە و بە پشتگوێ خستنی پێوەندییە سۆزدارییەکان، رەگ و پنجی ئاوات و ئارەزوو، تەنانەت چاکەش لەخۆیدا وشك دەکا. جۆن ناخی بەتاڵ ببوو لە هێزی چێژوەرگرتن لە چاکە و خێرۆمەندیی گشتی و لەڕاستیدا لە چێژ وەرگرتن لە شتەکان. سەیر ئەوەیە پەروەردە و راهێنانی میل لە قوتابخانەی سوودگەرایی دا ببووە هۆی ئەوەیکە لە تێگەیشتن لە "چاکەی رووت" بێبەری بێ، کە لەم قوتابخانەیەدا باسی لێوە دەکرا. شەش مانگ دواتر یەکەمین دارمانی بێ هیوایی لە ناخیدا رووی دا. ئەویش لە کاتی خوێندنەوەی لێکدانەوەیەك دابوو کە نووسەری بەناوبانگی فەڕەنسی مارمۆنتل، لە سەر مەرگی باوکی کردبووی. میل لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم لێکدانەوەیەدا، کەوتە گریان و تێگەیشت کە هێشتا هێزی هەستپێکردن لە ناخیدا نەمردووە. وردەوردە توانایی چێژوەرگرتن لە ناخیدا سەری هەڵدایەوە. ئەگەرچی دیسانیش جاروبارە بێ هیوایی رووی تێدەکردەوە. لەمەودوا ئەو بە خۆ خەریك کردن بە خوێندنەوەی هونەر و شیعرەوە (بەتایبەت بەرهەمەکانی وردزورس) هەست و سۆزی خۆی بەهێز دەکردەوە. بەڵام هەروا لە سەر ئەم باوەڕە بوو کە بەختەوەری بریتییە لە تێکۆشان بۆ بەختەوەرکردنی خەڵك یا هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دەرەکی و ئەگەر هەرکە لە خۆمان بپرسین ئایا ئێمە بەختەوەرین یان نا، بەختەوەریمان لە دەست دەدەین. باوکی میل پێی وابوو



شیعر ئامرازێکە بە دەست خەڵکی دواکەوتۆوە، خەڵکێك کە بەر لەوەی بیر بکەنەوە بە هەست کار دەکەن، بەڵام میل ئێجگار هۆگری شیعر و شاعیری بوو. ئەوەش تەنیا جیاوازییەك نەبوو کە لەگەڵ باوکی هەیبوو. میل دوای مشتومڕێکی توند پێوەندی خۆی لەگەڵ "ئەنجوومەنی گفتوگۆ" پچڕاند، لەبەر ئەوەی کە تەواوی بیروباوەڕەکانی ئەو لەم کۆڕەدا کەوتبوونە بەرشاڵاوی هێرشەوە، دوای ئەوە بوو کە نکۆڵی کرد لە لایەنگری لە بێنتام. میل لەگەڵ لایەنگرانی کۆلریچ کە دژی سوودگەرایی بوون و هەروەها لەگەڵ "سەن سیمۆنە شێوە کۆمۆنیستەکان دۆستایەتی گرت". سەرەڕای ئەوە، لەگەڵ "کارلایل"یش ئاشنا بوو، کارلایل کەسێك بوو کە گاڵتەی بە سوودگەرایی دەهات و بە تێگەیشتنێکی "ماشێنانەی" دەزانی لە مرۆڤ.

ئەو شتانەی کارلایل لە نووسراوەکانیدا هێنابوونی، باوکی میل پێی دەگوتن "جۆش و خرۆشی شێتانە". میل ئەمجار پشتیوانیی لەو شتە دەکرد کە گۆتێ پێی دەگوت: "چەند رەهەندە بوون" و میل لە روانگەی باوکییەوە کەسێك بوو کە لە "پێوەرە راستەکان" دوور کەوتبۆوە. بەڵام ئەو ئەگەرچی رەخنەی لە بێنتام هەبوو کە مامۆستای باوکیشی بوو. بەو حاڵەشەوە، بە کردەوە چاکسازیی لە قوتابخانەی سوودگەراییدا پێکهێنا و تۆکمەی کرد، قوتابخانەیەك کە بە هەوڵی بێنتام و باوکی پێکهاتبوو.

ساڵی ١٨٣٠ کاتێك میل تەمەنی لە ٢٤ ساڵیدا بوو، لەگەڵ خاتوو هاریت تایلۆر دۆستایەتی گرت، دۆستایەتییەك کە ئەو بە "پڕبایەخترین دۆستایەتیی ژیانم" ناوی دەبرد. ئەو کات هاریت لە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا بوو، شیعری دەهۆنییەوە و وتاری دەنووسین. کارلایل لەبارەی ئەو ئافرەتە دەڵێ: "ژنێکی هەڵبزرکاو و بە هەست و سۆز و بە رواڵەت پەشێو، پاڵەوانی زیندووی چیرۆکە ئەڤینداریەکان". جان تایلۆری مێردی ئەو ژنە، بازرگانێك بوو کە لە هیچ بوارێکەوە یەکیان نەدەگرتەوە، نە لە بواری سۆزداری و نە لە بواری بیرکردنەوەدا. قەشەیەکی خوداپەرست بە ناوی ویلیام جانسۆن فۆکس، پێشنیاری پێکرد کە بە کەسێکی بناسێنێ لە باری هزر و فیکرییەوە هاودەمی بێ و بە هۆی ئەو قەشەیەوە بوو کە میل بۆ یەکێك لە میوانییەکانی

هاریت تایلۆر بانگهێشت کرا. کارلایل بەمجۆرە دەیگێڕێتەوە: "میل کە هەتا ئەو کاتە چاوی نەبڕیبووە هیچ بوونەوەرێکی مێینە، تەنانەت مانگایەکیش، کتوپڕ چاوی بە دوو چاوی ڕەش و گەش کەوت کە دەریایەك واتا تێیاندا شەپۆلی دەدا و ئەویش سەبارەت بە بابەتگەلێکی تێکچنراو بۆ ئەو ئافرەتە دەدوا".

هێندەی پێ نەچوو کە ئەم ژن و پیاوە گەنجە دەستیان کرد بە کتێب و نامە گۆڕینەوەو دیمانە نافەرمییەکانیان زیاتر بوون.

ئەوان زۆر گوێیان نەدەدا بەوەی کە خەڵك لەبارەیانەوە چ دەڵێن و تەنانەت ڕۆژەکانی پشوودانیش پێکەوە ڕایاندەبوارد. بەڵام دەکرێ بڵێین هاریت لەگەڵ مێردەکەی ڕووڕاست بوو سەبارەت بەوەی کە پێوەندیی ئەو و میل تەنها پێوەندییەکی فیکرییە. ئەم ئیدیعای ڕاستگۆیی و ڕووڕاستییە هەتا بیست ساڵ دواتریش کە مێردەکەی هاریت مرد و شووی بە میل کرد، هەر لە جێی خۆی بوو. میل بەر لە زەماوەند*ەکەیان بەڵگەنامەیەکی ئامادە کرد کە تێیدا چاوپۆشیی کرد لە هەموو ئەو مافانەی بە پێی دەستوور و یاسا بە نیسبەت هاوسەرەکەیەوە پێی دەبڕا.

میل تەنیا لە بەر دڵی هاریت، بەر لە زەماوەند و دواتریش، پێوەندیی خۆی لەگەڵ زۆربەی هاوڕێ دوور و نزیکەکانی و تەنانەت لەگەڵ بنەماڵەکەشی پساند. وێدەچێ میل چەندە ڕێز و حورمەتی بۆ باوکی بووە ئەوەندەشی ڕێز لە هاریت گرتبێ، حورمەتێك کە لە ناخی میل دا هێلانەی چێ کردبوو. میل گوتوویەتی: کە ئەو خەسڵەتە باشانەی هاریت هەیبوو ئەگەر تەواوی ناسیارەکانی هەر کام یەکێك لەو خەسڵەتانەیان بوایە بەختەوەر دەبوون، وردبینی لە لێکدانەوە و شیکردنەوە دا، ڕاوێژخۆش و بە گفت و لفت، بیزاریی لە خۆرافات، دەست و

* زەماوەند، زەماوەندکردن: لە سەرانسەری ئەم کتێبەدا بە واتای پێکهێنانی ژیانی هاوبەش هاتووە. من بەش بە حاڵی خۆم هاوسەرگیری بە وشەیەکی داتاشراوی نالەبار دەزانم و پێشموایە باووباپیرانمان لەوەپێش وتوویانە "فلانەکەس زەماوەندی کرد" واتە ژیانی هاوبەشی پێکهێنا. و.ك.



دڵئاوایی، تێگەیشتوویی، قسەخۆشی، دڵنەرمی و خاوەن هەست، دڵگری و جوانی، هەر هەمووی لەودا کۆببوونەوە. میل نەك هەروەك ئیلهامبەخش بەڵکو لە زۆر جێدا هاریت بە خوڵقێنەری باشترین ئەم بیرۆکە و بۆچوونانە دەزانێ کە لە بەرهەمەکانیدا هاتوون. هێندێ لە لێکۆڵەران پێیان وایە میل لە تاریف و پەسنی هەڵکەوتەیی و بلیمەتیی هاریتدا زێدەڕۆیی کردووە و زۆری پێوەناوە. بەڵام هێندێکی دیکە، بۆ وێنە مایکل پۆك، بە ناوبانگترین نووسەری بیۆگرافیی میل لە سەر ئەو باوەڕەیە کە میل هێشتا زۆر کەمی لە سەر وتووە و بە گوێرەی پێویست باسی نەکردووە. هاریت لە کتێبی "سیستەمی لۆژیك دا کە میل بڕێك دوای ناسینی ئەو دەستی بە نووسینی کرد هیچ بەشێکی نییە و لەوانەیە هاندەری میل بووبێ بۆ نووسینی ئەم کتێبە. بەڵام وێدەچێ لەمەودوا هاریت پشکێکی زیاتری بووە لە نووسراوەکانی میل دا، چونکە ئەو دووانە بەردەوام پێکەوە لە وتووێژ و گەنگەشە دا بوونە و بە یارمەتیی یەکتر گەلاڵەی بابەتەکانیان داڕشتووەو پێپیاندا چوونەتەوە. ئەو جیاوازییانەی لە چاپی یەکەمو دووهەمی بنەماکانی ئابووری سیاسیدا دەبینرێن هەمووی بە ڕواڵەت لە ئەستۆی هاریت بوون. میل خۆی لە بارەی کتێبی "لە ئازادیدا" کە سێهەمین بەرهەمی بە نرخێتی دەڵێ: "ئەو کتێبە بە واتای ڕوون و ڕاستەقینەی خۆی لە تەواوی ئەو کتێبانەی ناوی منیان بە سەرەوەیە زیاتر، بەرهەمی هاوبەشی ئێمەیە" و "لەوانەیە لە نووسینەکانی دیکەم تەمەن درێژتر بێ.... چونکی تێکەڵاوی و یەکبوونی زەینی من و ئەو ئەم کتێبەی کردۆتە دەقێکی فەلسەفی لەمەڕ حەقیقەتێکی تاقانە".
هاریت لە ساڵی ١٨٦٥ بە نەخۆشیی ئازارەباریکە مرد و میل بەو شێوەیە خەمی خۆی دەردەبڕێ "بەهاری ژینم گەییە کۆتایی". میل بە مەرگی هاریت، ملی بۆ خۆرافات ڕاکێشا و گومبەزێکی لە بەردی مەڕمەڕی گرانبایی بۆ ساز کرد و گەلێك پارچەنووسراوەی لە پەسنی ئەودا لە سەر نووسین کە تێیاندا لە ڕادەبەدەر

گەورەنوێنی (مبالغە) کرابوو. میل کۆخێکی لە ئەڤینیۆن کڕی بۆ ئەوەی بتوانێ هەموو رۆژێ بچێتە سەر گۆڕی هاریت، ئاخرییەکەشی لە تەنیشت هاریتەوە نێژرا.

دوای مەرگی هاریت، میل درێژەی بە نووسین و بەرهەمگەلێکی لە سەر سیاسەت و ئەخلاق و مافی ژنان نووسی، کە گرینگترینیان بریتی بوون لە: نامیلکەگەلێك لە سەر چاکسازیی سیستەمی پەرلەمانی، "تاوتوێی فەلسەفەی سێرویلیام هامیلتۆن، سوودگەرایی" (کە تێیدا روانگەی چەندایەتی بێنتام لەمەڕ چێژ وەرگرتن وەلاوەدەنرێ لەجیاتی جێگەی روانگەگەلێکی چلۆنایەتی دادەنرێ) و بەرهەمگەلێکیش لە داکۆکیی مافی ژناندا. میل بەشی هەرەزۆری تەمەنی خۆی لە کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵاتدا بە سەر برد و بڵاڤۆکی رێویێوی (کە زۆر زوو لەگەڵ گۆڤارەکەی باوکی، واتە ۆوست رێویێو تێکەڵ بوون) دەرکردو ماوەی پێنجساڵ سەرنووسەری بوو. ساڵی ١٨٦٥ بە زۆر قەبووڵی کرد بۆ نوێنەرایەتیی پەرلەمان ناوی خۆی بنووسی و یەکێك لە لایەنگرانی گوتی کە بەو پرۆژەیە و گەلاڵەگەلەی ئەو (میل) هەیەتی خوداش ناتوانێ یارمەتیی بدا. لە یەکێك لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی هەڵبژاردندا، کاتێك لە بەردەم بەشداربوان، کە زۆربەی هەرەزۆریان کرێکار بوون رایگەیاند کە داکۆکی لە مافی ژنان دەکا، خەڵك دایانە قاقای پێکەنین بەڵام کاتێك راستگۆیی و گوڕوتینی ئەویان بینی، وردەوردە هێور بوونەوە. دواتر یەکێك لە دژبەرەکانی میل پلاکاردێکی پێشانی جەماوەرەکە دا کە تێیدا رستەیەکی نامیلکەی "تێڕامانێ لە بارەی ریفۆرمی پەرلەمانی" هێنابۆوە کە دەڵێ: "بەگزادەکانی ئینگلستان هیچی درۆ ناکەن. بەڵام کرێکارانی ئینگلیستان هەموویان درۆزنن - هەرچەند بە پێچەوانەی کرێکاران هەندێ وڵاتان لەو کارەی خۆیان شەرمەزارن". جا بە راستی ئەو لە کتێبەکەیدا شتی وای نووسیبوو؟ میل بێ هیچ دڕدۆنگییەك و لەرێوە گوتی: "بەڵێ وایە". و جەماوەر،کە بە هۆی راستگۆیی و قسە لەروویی میل تێکرا چەپڵەیان بۆ لێدا. میل بە جیاوازیی سەدان دەنگ بە سەر رەقیبە کۆنەپارێزەکەیدا سەرکەوت و بوو بە ئەندامی پەرلەمان و سێ



ساڵی رکەبەرە شێلگیرانە داکۆکیی لە ئارمانجگەلێك کرد کە "هیچ کەس ئیتر نەیدەتوانی شان بداتە بەر باری داکۆکیلێکردنیان، چونکی یا زۆر پێشکەوتوانە بوون یا ئەوەی کە ئێجگار تاڵ". ئەو بە توندی دژایەتیی بڕیاری لە سێدارەدان (ئیعدام)ی دەکرد و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دادوەری جامائیکا سەبارەت بەو ئاکار و کردەوە وەحشیانەیەی لە بەرامبەر رەشپێستە نارازییەکاندا نواندوویەتی دەبێ لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێ. سەرەڕای ئەوانەش پشتیوانی، لە ریفۆرمی زەوی لە ئێرلەندا و لە مافی سیڤیلیی سۆزانییەکان و مافی دەنگدانی ژنان و بەشی هەرەزۆری چینی کرێکار دەکرد. لە کاتی ئەندامەتیی لە پەرلەماندا، ساڵی ١٨٦٧ "یاسای ریفۆرمی هەڵبژاردن" پەسەند کرا و مافی دەنگدان درا بە ٥٨ لە سەدی ئەو پیاوانەی لە هەر بیاڤێکی هەڵبژارداندا دەژیان و بەمجۆرە دەنگدەران رێژەیان گەیشتە دوو ملیۆن کەس. بێجگە لەوەش، لە سایەی هەوڵ و تێکۆشانەکانی (میل)دا بوو کە مافی دەنگدانی ژنان بوو بە مەسەلەیەکی جیددی. میل لە تەمەنی ٦٦ ساڵیدا مرد و دوا قسەکانی لە سەرەمەرگدا ئەوانە بوون: "تۆ دەزانی من کار و ئەرکی خۆمم بە جێ گەیاندووە". میل خۆی وا دەنواند کە لە کەشێکی بێ باوەڕ بە ئاییندا پەروەردە کراوە و هەوڵی دەدا نموونەیەکی سەرنجڕاکێشی ئەمجۆرە کەسانە بێ. بە راستی ئەو نموونەیەکی سەرنجڕاکێشی لە پیرۆزایەتیی نائایینی دەنواند.

ئێستاش دەچینە سەر ئەو بەرهەمەی جۆن ستیوارت میل تێیدا داکۆکیی لە مافی ژنان کردووە.

## کۆیلەکردنی ژنان (١٨٦٩)

میل لە سەر ئە باوەڕەیە کە شتێکی چاوەڕواننەکراو نییە ئەگەر کەسێکی وەکو ئاگۆست کۆنت کە پیاوانی بە سەرووتر لە ژنان زانیوە روو لە سەرەرۆیی و دیکتاتۆری بکا. ئاگۆست کۆنت کەسێکە کە سەردەمێك بۆ میل سەرنجڕاکێش و نموونە بوو. بەڵام میل، بە پێچەوانەی ئاگۆست کۆنت، هەر لە سەردەمی گەنجێتییەوە و تەنانەت بەر لە ناسینی هاریت تایلۆریشەوە، یەکێك بوو لە لایەنگران و پشتیوانانی بەگۆڕوتینی مافی ژنان. ئەو کاتەی تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، یەکەمین بەرهەمی فیمینیستی خۆی لە گۆڤاری ریویودا بڵاو کردەوە و بە توندی هێرشی کردە سەر جیاوازیخستن لە نێوان ژن و پیاودا. بەڵام پاش ناسینی هاریت بوو کە میل پرسی ژنانی خستە سەرووی هەموو مەسەلەکانی دیکەوە و لە بواری کاروباری کردەییدا بە گرینگترین مەسەلەی زانی. ئەو و زڕکچەکەی "ئەنجوومەنی نەتەوەیی مافی دەنگدانی ئافرەتان"یان دامەزراند، هەر خۆیشی ساڵی ١٨٦٦داوای لە پەرلەمان کرد مافی دەنگدان بۆ ئافرەتان لە بەرچاو بگرن. لە ئاخافتنێکی بە ناوبانگی پەرلەمانیشدا پێشنیاری کرد لەو یاسایەی ساڵی ١٨٦٧ دیسرائیلی بردبوویە پەرلەمان لەبری وشەی (پیاو) وشەی ((کەس)) دابنرێ. لە باسەکانی نێو پەرلەماندا ئەو کەڵکی لەو بەڵگەهێنانەوەیە وەرگرت کە لە کتێبی کۆیلە کردنی ژناندا هێنابوونی، چونکە وێڕای ئەوەی میل ساڵێك پاش هاتنەدەر لە پەرلەمان ئەم نامیلکەی بڵاو کردەوە، بەڵام چوار ساڵ بەر لە چوونی بۆ پەرلەمان نووسیبووی. میل لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە جیاوازیخستن لەنێوان ژنان و پیاواندا "بووەتە یەکێك لە گەورەترین کۆسپەکانی بەردەم پێشکەوتنی مرۆڤ". تێکۆشان بۆ گۆڕینی ئەم رەوشە لەگەڵ بەرگرییەکی زۆر توند بەرەوڕوو دەبێتەوە. چونکە بەکەمزانینی ژنان و باوەڕ بە سووکبوونیان نەك بنەمایەکی عەقڵی نییە،



بەڵکو لە هەست و سۆزدارییەوە سەرچاوە دەگرێ، هەر بۆیەش، ئەگەر بە شێوەی لۆژیکی و بەڵگەهێنانەوەی لۆژیکانەش رەتی بکەینەوە هێشتا بەلای لایەنگرەکانییەوە ئەو بۆچوونە قورسایی ئیعتیباری خۆی هەر هەیە. چونکە ئەوان پێیان وایە کە "سۆز و هەستیان لە سەر بنەمایەك دامەزراوە کە لە مشتومڕ و بەڵگە هێنانەوە بێبەرییە". لەوەها دۆخێکدا هەست و سۆز بە سانایی ئەم بۆشاییە پڕ دەکەنەوە کە لە لۆژیکدا هەن. میل بەرەنگاری ئەو بەڵگەهێنانەوەیە دەبێتەوە کە پشتقایمە بە دەنگی گشتی و دەڵێ ئەم سیستەمەی ئێستا کە ژنان بە کەم دەگرێ و بە سووکیان دەزانێ، تەنیا لە سەر تیۆرییەك دامەزراوە کە راستبوونەکەی نەسەلمێندراوە، لە بەر ئەوەی کە قەت نموونەیەکی ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتیی دیکە بە شێوەی کردەوەیی لە کۆمەڵگە دا زاڵ نەبووە هەتا لە رێگەی بەراوردکردنیانەوە بۆمان دەرکەوێ کامیان بە قازانجی خەڵکن. بەڵام هەر ئەم تیۆرییەش بەرهەمی بیر و تێڕامان و گریمانەکردن نییە، بەڵکو تەنیا نموونەیەکە کە بەڕوونی دەری دەخا کە چۆناوچۆن یاسا باوەکان دەکەنە شتێکی پیرۆز. لە سەردەمی کۆن دا، لاوازبوونی جەستەیی ژنان دەبووە هۆی ئەوەیکە کۆیلەی بەر دەستی پیاوان بن و پیاوانیش رەنگ و بۆنێکی یاساییان بەم کوێلایەتییە دابوو. بەڵام ئێستاکە، کە کۆیلەیەتیی پیاوان هەڵوەشاوەتەوە و لاچووە، کۆیلەیەتیی ژنان لە هەموو شوێنێك هەروا لە ئارادایە و هەڵنەگیراوە بەڵکو بڕێك کەمتر کراوە و ئێستا یاسای "بەهێز مافدارە" بە سەر پێوەندییەکانی ژن و پیاو دا زاڵە. ژن لە کڵێسە بەڵێن دەدا لە سەرپێچیکردن و لادان لە یاسادا نەبێ، لە هەموو شتێکدا گوێڕایەڵی مێردەکەیەتی، سامانی ژن بە مێرد دەبڕدرێ و بە پێی یاسا مێرد تەنانەت بۆی هەیە دەستدرێژییش بکاتە سەر ژنەکەی. ئەو راستییەی کە ئەم یاسا و دەستوورانە زۆرێك لە پیاوان بەکاری ناهێنن، نابێتە هۆی داپۆشران و کەمبوونەوەی کەموکورتیی ئەم یاسایانە. ئەوانەی داکۆکی لە دامەزراوگەلێکی کۆنەپەرستی وەك، کۆیلەداری و حکوومەتی توتاڵیتاری دەکەن، بەردەوام چاوەڕوانیی ئەوەیان لێمانە کە"ئەم دامەزراوگەلە لە باشترین حاڵەتدا بێنینە بەر چاو، ئەوجا داوەرییان لە سەر بکەین و وێنایەکی کە لەم دامەزراوگەلە دەکرێ

خۆشەویستیی باڵادەستەکان و سوپاس و پێزانین و ملکەچیی ژێردەستەکانە، بە واتایەکی دیکە، لە لایەکەوە دەسەڵاتدارێکی ژیر لە گۆڕێدایە کە بە هەموو تواناوە تێدەکۆشێ کاروبارەکان بە قازانجی ژێردەستان راپەڕێنی و لە لایەکیشەوە ئەو بندەستانەی کە بە بزەی سەرلێوانەوە سوپاسی دەکەن... کێ گومانی هەیە لەوەی کە لەوانەیە ژیانی ژێر دەسەڵاتی پیاوێکی دادپەروەر و خێرۆمەند پڕ بێ لە خۆشی و بەختەوەری؟ بەڵام یاساکان دەبێ جۆرێك دارێژرێن کە مرۆڤە خراپکارەکان لە هەڵە و لارێ بگێڕێتەوە.

بەڵگەهێنانەوەیەکی دیکەی کە بەڕای میل بە قەدرایی ئەو بەڵگەهێنانەوەی پێشوو ریاییکارانەیە، ئەوەیە کە ژنان بە ویست و دڵخوازی خۆیان، دەسەڵات و زاڵێتی دەدەنە دەست پیاوان. هەروەها پێگەی ژنان لە پێگەی چینە ژێردەستەکانی کۆمەڵگە جوێیە، لە بەر ئەوەی کە ژن لە رێگەی عەشق و خۆشەویستی و گەلێ جاریش لە رێگەی منداڵەکانییەوە لەگەڵ فەرمانڕەواکەی ﴿مێرد﴾ یەك دەگرێ. میل رای وایە کە حەزی سێکس لە نێوان ژن و پیاو و لاوازیی جەستەیی ژن و هەروەها حەزکردنی پیاو بەوەی کە ژن بخاتە ژێر فەرمانی خۆی، ئەویش نەك بە زەبر و زۆر بەڵکو بە ویستو داخوازی خودی ژنەکە، بوونەتە هۆی ئەوەی ژنان بەردەوام لە کەشێکی هەڕەشە و تەماح وەبەرناندا بژینو لەو حاڵەشدا، مۆراڵ و نەریتە زاڵەکان بە سەر کۆمەڵگە دا بەردەوام بانگەشە بۆ ملکەچی و لە سەرەخۆیی ژن دەکەن و پەرەی پێدەدەن. خەسڵەتگەلێك کە بوونەتە بەشێکی دانەبڕاو لە جوانیو دڵڕفێنی و بەهای ژن. ئەگەر هەر لە منداڵییەوە ئافرەتیان فێری ئەوە نەکردبایە کە حەزیان لەو شتانە نەبێ وا بۆ ژنان ناشێن وەکو خوێندن و کار و مافی دەنگدان و... بێگومان رێژەی ئافرەتانی خوازیاری ئەو شتانە ئێجگار زیاتر دەبوو.

میل دەپرسێ کە بۆچی دەبێ نیوەی نەژادی مرۆڤ تەنیا بە هۆی ژنبوونیان، کە ئەوەیش قەدەر تووشی کردوون بێبەش بن لەو کەرەسە و دەرفەت و ئیمکاناتەی بۆ پیاوان دابیندەکرێن؟ کچبوون یا کوڕبوون نابێ دەورێکی چارەنووسسازیان لە ژیانی



تاکەکاندا هەبێ، هەروەکو رەش بوون و سپیبوون یا بەگزادەیی و رەشۆکی نابێ وابن. بەڕای میل ئەگەر بە راستی پیاوان بۆ هێندێ کاروبار لە ژنان شیاوتر و لێهاتووترن چ پێویست دەکا ئەو هەمووە یاسایە پەسەند بکرێ و بە گوێی کۆمەڵگەدا بخوێندرێ کە ژنان فلانە کاریان پێ بەرێوە ناچێ. ئەگەر ژنان بە پێی سروشتی خۆیان باشاری دەرەقەتی هەندێ کار نایەن، ئیتر پێویست ناکا پێشیان پێ بگرین. هەڤڕکی و ئازادی دەری دەخەن کێ چ کارێکی لە دەست دێ.

بەڕای میل قسەی ئەوانەی کە دەڵێن ژنان رەگەزی رەسەن و سەرترن و دەبێ دوور بن لە مەیدانی هەڤڕکێ و ململانێ، قسەیەکی پووچ و خەڵەتێنەرە. ئەو دەڵێ کەسانێك بانگەشە دەکەن کە ژنان لە پیاوان سەرترن کە خۆیان دژی ئەوەن وەکو کەسانێکی شیاو و لێوەشاو لەگەڵ ژنان هەڵسوکەوت بکرێ. ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر بە راستی لە سەر ئەم باوەڕەن، ئەدی بۆچی ملکەچیی باشتر لە بەرامبەر خراپتر دا بەشتێکی تەواو سروشتی و بە قازانجی دەزانن؟ میل لە وەڵامی ئەوانەی ئیدیعا دەکەن ژنان بە شێوەی سروشتی لە خوار پیاوانن و لە پیاو کەمترن و "بە پێی سروشتیان" بۆ کاروباری نێو ماڵێ لێوەشاوەترن، بەوپەڕی گەرموگوڕییەوە دەڵێ: کە ئێمە بە هیچ کلۆجێ نازانین ژنان "بە پێی سروشتیان" چۆنن. "ئەوەی ئەمڕۆکە پێی دەڵێن سروشتی ژنانە، شتێکی تەواو دەستکردە، چونکە لە زۆر لاوە بەرهەمی سەرکوتە لە هێندێ لایەنیشەوە بەرهەمی هاندان و دڵگەرمی". ژنان بە هۆی ملکەچبوونیان لە هەمبەر ویست و داخوازی پیاوان، وا لە داهێنان و خولقاندن و بیر کردنەوە دوور کەوتوونەتەوە و هەست و سۆزدارییان بە شێوەیەك پەروەردە کراوە، کە ئیتر ناتوانین بڵێین سروشتی راستەقینەیان کامەیە. هەروەکو "ئەگەر نیوەی گیایەك لە گوڵخانەدا راگرین و نیوەکەی دیکەی لە نێو بەفردا" ناکرێ بڵێین سروشتی راستەقینەی ئەم گیایە چۆنە. ئەگەر ژنانیش دەستیان بە تەواوی ئەو ئازادی و پەروەردە و ئیمکاناتە رابگا کە پیاوان هەیانە ئەو کات دەکرێ بڵێین هەموو جیاوازییە رواڵەتییەکانی نێوان ژن و پیاو تەواو دەبن و ئەوەش لە

بەرژەوەندیی پیاوانیشدایە، چونکە دەسەڵاتی لە رادە بەدەر مرۆڤ بەرزەدەماخ لە خۆبایی دەکا و ئەوە زەماوەندی مرۆڤە یەکسان و هاوبیرەکانە کە بەختەوەریی راستەقینە بەرهەم دێنێ. میل سوورە لە سەر ئەوەی کە، بێبەری بێبەش بوونی ژنان لە "ئازدای" کە "دڵگەرمی" و "کەرامەت" بە مرۆڤەکان دەبەخشێ، لە لایەکەوە هێز و توانای ژنان بۆ گەیشتن بە رەزامەندی و بەختەوەری کەم دەکاتەوە و لە لایەکی دیکەوە ناهێڵێ نیوەی ئەو تواناییانەی لە بەر دەستی مرۆڤایەتیدان بپشکوێن و گەشە بکەن.

دیارە ناکرێ بڵێین نامیلکەی "کۆیلەکردنی ژنان" بێ کەموکۆرییە و دژوازیی (پارادۆکس) تێدا نییە. بۆ وێنە میل لە لایەکەوە "پەروەردە" دەخاتە سەرووی "سروشتەوە" و دەڵێ لە هەلومەرجی ئێستادا ئێمە ناتوانین لە سروشتی ژنان تێبگەین، بەڵام جاری وایە جۆرێك قسە دەکا وەك بڵێی ئەو دەزانێ ژنان بە پێی سروشتیان خاوەنی چ جۆرە تایبەتمەندی و خەسڵەتگەلێکی دەروونین. ئەم دژیەکییە بە تایبەتی لەو شوێنەدا دەردەکەوێ کە ئەو هەوڵدەدا بڵێ کە بۆچی ژنان لە بواری نووسەری و شێوەکاری و فەلسەفەدا لە پیاوان دواکەوتووترن، یا لەو شوێنەی کە دەڵێ هێزی "درکی شهودی"ی ژنان زیاترە لە ئی پیاوان. (میل خۆی لە گۆڤاری "ئیدنبۆرگ ریویو"دا هاوار دەکا کە: "پێمان دەڵێن پیاو لە ژن باشترە یا ژن لە پیاو؟ وەها ئیدیعایەك پڕیەتی لە عەقڵی شهودی و گەمژەیی شهودی. قسەیەکی قۆڕ و بێ جێیە ئەگەر بڵێین ئەمیان بەهێزترە و ئەویان کەمتواناتر، ئەمیان داوێنپاکترە و ئەوی دیکە خراپەکارتر. کابرای سەرسووڕماو دەبێ لە بەردەم ئەو بانگەشە قۆڕانەدا چ بکا؟") بەڵام دەبێ بزانین کە ئەو دژیەکبێژییانەی کە لەم باسەدا زۆر باون و ئەوانەش کە لە نامیلکەکەی میلدا بەدی دەکرێن نابنە هۆی ئەو وردبینییەی میل لە ئاشکراکردنی دژیەکبێژیی دژبەرەکانیدا دەکاری دەکا، هەروەها لەو گەرموگوڕییەی لە گەنگەشە و مشتومڕەکانیدایە کەم ناکاتەوە. رەخنەکانی فرۆیدیش لە ئیعتیباری بیروبۆچوونەکانی میل کەم ناکەنەوە. فرۆید کە ئەو نامیلکەیەشی وێڕای بەرهەمەکانی



دیکەی میل وەرگێڕاوە لە نامەیەکدا بۆ دەسگیرانەکەی خۆی کە یەکێکە لە لایەنگرانی میل، رەخنە لە بیروبۆچوونەکانی میل دەگرێ. فرۆید دەڵێ هەر چەشنە پێشکەوتن ریفۆرمێك لە رەوشی ژناندا بکرێ پێگەی سروشتیی ئەوان هەر ئەوەیە کە هەیە.... "سروشت وای بە نەسیبی ژنان کردووە کە لە گەنجێتیدا بە هۆی دلڕفێنی و جوانییانەوە خۆشەویست و لە بەر دلان و لە سەردەمی بە ساڵ چووییشدا هاوسەرێکی بەڕێز و ئازیز بن". ئەو بەراوردکردنی رەوشی ژنان لەگەڵ رەوشی کۆیلان بە کارێکی هەڵە دەزانێ و بە راوێژێکی میهرەبانانەوە دەڵێ:"هەر کچێك، جا چ مافی دەنگدان یا مافەیاساییەکانی دیکەی پێدرابێ و چ پێی نەدرابێ، کاتێك پیاوێك دەستی ماچ دەکاو حازرە سەروماڵی خۆی بە فیدا بکا، دەتوانێ لەم بوارەوە رێگەی راست پێشانی میل بدا". ئەم قسە بە رواڵەت چەور و شیرینانە لە ناخیاندا هەڵگرێ پەیام و واتای مەترسیداری زاڵبوون و دەسەڵاتی بێ سنووری پیاوانن بە سەر ژندا. جیاوازیی نێوان ئەو زەماوەندکردنەی فرۆید باسی دەکا لەگەڵ ئەو شتەی میل مەبەستێتی مەودای زەوی و ئاسمانە. فرۆید دەڵێ ئەگەر (( ژنە خۆشەویست و ئازیزەکەم)) پێ بنێتە گۆڕەپانی هەڤرکی و ململانێ، لە بەری دەپاڕێمەوەو تکای لێدەکەم مەیدانی خەبات چۆڵبکا و پەنا بەرێتە بەر "چالاکی و تێکۆشان لە ماڵی بێ قڕە و کێشەی مندا". لێرەدا بە روونی بۆمان دەردەکەوێ کە چ جیاوازییەکی گەورە لەنێوان بۆچوونەکانی فرۆید و بیروڕای راستگۆیانەی (میل)دا هەیە کە بەوپەڕی راستگۆیی بۆ هاریتی نووسیون و تێدەگەین کە روانگەی دەروونناسییانەی میل چەندە بەرزترە لە روانگەی جێگرە بەناوبانگەکانی."جین ئۆگریدی".

## بەشی یەکەم

مەبەستی من لەم وتارەدا ئەوەیە کە بیر و باوەڕێك بێنمە گۆڕێ و شیبیکەمەوە کە هەر لەو کاتەی وا لە مەیدانی راوبۆچوون بۆ پرسە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دەستم بە چالاکی کردووە لە سەری سوور بووم. ئەم باوەڕە بە تێپەڕبوونی کات نەك هەر لاواز نەبووە و بەرەو داکشان نەگۆڕاوە، بەڵکو ئەوەندەی دیکەشی لە خەرمانی تێفکرین و بیرکردنەوە و ئەزموون کەوتۆتە سەر و منیش دەمەوێ بەوپەڕی روونی و بێ گرێ و گۆڵی بنەماکانی ئەم باوەڕە شیبکەمەوە. بەڕای من ئەو رێساو بنەمایەی کە چوارچێوەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان ژن و پیاو دیاری دەکا و بە پێی ئەو، رەگەزێك بەشێوەیەکی قانونی دەبێتە کۆیلەی رەگەزێکی دیکە، هەر لە بنەماوە هەڵەیە و دەبێ لە جێگەی ئەو رێسایە، رێسایەکی دیکە دابنێین کە لەسەر بنەمای یەکسانیی بێ ئەملاوئەولای ژن و پیاو دامەزرابێ و هیچ کامیان نەخاتە سەرووی ئەوی دیکەوە و هیچیان بەبێ هێز و کەمتوانا دانەنێ.

لەو زمانەی کە بۆ شەرح و راڤەی ئەم ئەرکە هەڵمبژاردووە، دەردەکەوێ کە دەستم داوەتە چ کارێکی سەخت و بڕست بڕ. بەڵام تووشی هەڵە دەبین ئەگەر پێمان وابێ دژواری و سەختییەکانی کارەکە سەرچاوەی لە ئاڵۆزی و کەموکوڕیی ئەو بنەمایانە دایە کە بیرو رای منیان لە سەر دامەزراوە. دژواریی کارەکەمان ئەو دژوارییانەن کە لە هەمووی ئەو بابەت و مەسەلانەدا ئامادەییان هەیە کە مرۆڤ لە کاتی رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵیاندا ناچارە بکەوێتە دژایەتیی کۆمەڵێك ئیحساسات و سۆزەکانەوە.

ئەگەر دژی ئەو باوەڕانەی رەگاژۆیان کردۆتە نێو هەست و ئیحساساتی خەڵکەوە، بەڵگە و ئیستدلالی تۆکمە و بەهێز بخەینە روو، نەك هیچ خەسارێکی وێناکەوێ،



بەڵکو تۆکمەتر و بەهێزتر دەبێ، چونکە ئەگەر بیروباوەڕێك بە پێی پاسا و و بەڵگە و ئیستدلالێ کەوتبێتە بەر دڵی خەڵك و قەبووڵکرابێ، دەکرێ هیوای ئەوەت پێی بێ کە هەڵوەشاندنەوەی ئەم بەڵگە و ئیستدلالە، کەلێن دەخاتە نێو بنەماکانی. بەڵام ئەو کاتەی بیروباوەڕێك تەنیا لە سەر هەست و ئیحساسات دامەزرابێ، بەو رادەیەی کە لە گەنگەشە و چەلەحانێدا لاواز دەنوێنێ، لایەنگرانی زیاتر دێنە سەر ئەوە کە سۆزەکانیان لەسەر بنەمایەك دامەزراوە کە پێویستیی بە بەڵگەهێنانەوە نییە و ئەگەر هەستی سۆزداری هەر وا شەقڵ نەشکاو بمێنێتەوە، لە بواری بەڵگاندنیش بەڵگەهێنانەوەشدا مەتەرێزگەلێکی نوێ هەڵچندرێن بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو کەلێنانەی کەوتوونەتە کۆنە ماڵەکەوە. لەم بوارەشدا ئیحساساتی خەڵکی، بە هۆی زۆر شتەوە، توندترین و لە مێژینەترین ئیحساساتێکن کە دامەزراو و ناوەندە کۆنەکانیان تەنیوە و بەهێزیان دەکەن. ئێمەش نابێ سەرمان لەوە سوور بمێنێ کە گۆڕانکارییە مەزنە مۆدێرنەکان لە بواری رۆحی و کۆمەڵایەتیدا ئەم هەست و ئیحساساتانەی لە چاو ئەوانی دیکە کەمتر تووشی لەرزۆکی و گۆڕان کردووە. هەروەها نابێ پێمان وابێ، کۆنترین نەزانییەك کە پیاوان باوەڕیان پێی بووە، لاوازتر و بێ بنەماتر بووە لەو نەزانین و گەمژەییانەی خۆیان لێ دەرباز کردووە.

ئەوانەی هێرش دەکەنە سەر بیرۆباوەڕێکی تا رادەیەك گشتی، لە هەموو لایەکەوە کارێکی تاقەتبڕیان لە ئەستۆیە. ئەوانە دەبێ زۆر بە تواناو ئێجگار بە شانس و بەخت بن کە یەکێك گوێ بۆ قسەیان راگرێ. کێشەی سکالاکاران لە دادگە ئەوەیە کە چ بڕیارێکیان بۆ دەردەچێ، بەڵام کێشەی ئەوانە پێکهێنانی دادگایە و ئەگەر هات و دادگایەکیان بۆ پێك بێ، لۆژیکێك لە بەر چاو دەگرێ کە تەواو لەو لۆژیکەکانەی دیکە جیاوازە. لە دادگاکانی دیکە گریمانە لە سەر بێتاوانییە و دەبێ تاوانبارێتی بسەلمێندرێ.

ئەگەر یەکێك تۆمەتبارە بە کوشتنی کەسێك، نابێ خۆی بێ تاوانێتی خۆی بسەلمێنێ، ئەوانەی ئەویان تۆمەتبار کردووە دەبێ تاوانبارێتیی ئەو بسەلمێنن. ئەگەر

بۆچوونێکی جویێ لە سەر واقیعی ڕووداوێکی مێژوویی لە گۆڕێدابێ و خەڵك زۆریان بەلاوە گرینگ نەبێ (وەکو گەمارۆی شاری ترۆی)، چاوەڕوانی دەکرێ لەو کەسانەی بڕوایان وایە ئەو ڕووداوە بە ڕاستی هەبووە، بۆ سەلماندنی قسەی خۆیان بەڵگە بخەنەڕوو، ئەوانەی کە وا بیرناکەنەوە پێویستیان بە هێنانەوەی بەڵگە نییە و ئەوەندەیان لێ چاوەڕوانی دەکرێ کە گوێ بدەنە قسەی بەرامبەرەکانیان و ئەگەر لاوازی و کەموکۆرییەکیانی بینی، ئاماژەی پێ بکەن و دەری خەن کە بێ بنەمایە. لە کاروباری ڕۆژانەشدا ئەو کەسانە دەبێ بەڵگە بۆ شتەکان بێننەوە کە بیروڕایەکی بە پێچەوانەی ئازادییان هەیە، واتە ئەوانەی باوەڕیشیان بە قەدەغەکردن یا بەرتەسککردنەوە هەیە. جا چ بەرتەسککردنەوەی ئازادیی هەموان بە گشتی لە ئاکار و کرداردا، چ بێبەشکردنی کەسێك یا کۆمەڵێك. خەڵك لە فلانە پوان (ئیمتیاز)، یا جیاوازی خستن لە نێوان تاکەکاندا بۆ هەبوونی وەها پوانێك بە واتایەکی دیکە گریمانەی پێشوویی، لایەنی ئازادی و بێ لایەنی (سەربەخۆیی) دەگرێ. هەمووی دێتەوە سەر ئەم باوەڕە کە، نابێ ئاستەنگ و بەرتەسککردنەوەیەك لە گۆڕێدا بێ مەگەر بە پێی بەرژەوەندیی گشتی بێ. یاساش نابێ جیاوازی بکا لەنێوان تاکەکانداو دەبێ هەموان بە چاوێك سەیر بکا، مەگەر ئەوەی کە لە بەر هێندێ لایەنی پۆزەتیڤ، چ لە بواری دادپەروەری یا لە بواری سیاسیدا، مێتۆدێکی دیکە ڕەچاو بکرێ. بەڵام ئەوانەی باوەڕیان بەم وتە و بیروباوەڕانەی من هەیە هیچ شتێکیان لەم یاسا بەڵگەنەویستانە دەست ناکەوێ. هیچ شتێکی بۆ من تێدا نییە کە بڵێم: کە ئەوانەی پێیان وایە پیاوان مافی دەسەڵاتداریێتان بە سەر ژناندا هەیە و ژنان ناچارن گوێڕایەڵی پیاوان بن، یا ئەوانەی باوەڕیان وایە پیاوان شیاوی حکوومەت کردنن نەك ژنان، دەکەونە لایەنی سەلماندنی مەسەلەکە (دەبێ گریمانەکەیان بسەلمێنن)، یا بۆ سەلماندنی بانگەشە خۆیان بەڵگە و هۆکاری تۆکمە بێننەوە و ئەگەر ئەوەشیان لە دەست نایە ئیدی واز لەم بانگەشە بێنن و مل ڕاکێشن.

هەروەها قسەیەکی خۆڕاییە ئەگەر بڵێین ئەوانەی ژنان لەو ماف و ئازادییانە بێبەش دەکەن کە بۆ پیاوان بە ڕەوا زانراون، لە ڕاستیدا لەگەڵ دوو گریمانەی بەڵگەنەویست



کەوتوونەتە دژایەتییەوە، چونکە هەم دژایەتیی ئازادی دەکەن و هەم جیاوازیکردن بە ڕەوا دەزانن. هەر بۆیەش بۆ سەلماندنی ئیدیعاکەیان دەبێ تۆکمەترین هۆکار و بەڵگە بێننەوە و ئەگەر نەیانتوانی شك و گومانەکان بڕەوێننەوە، قسەکەیان وەرناگیرێ. تەواوی ئەو ئیستدلالگەلەی هێنامانەوە لە سکاڵێ و سکالای ئاساییدا، لەو داکۆکییانەن کە دادگا وەریاندەگرێ، بەڵام لەم بابەتە تایبەتییە دا وەرناگیردرێن. من بەر لەوەی بەو هیوایە بم کە کاریگەریم لە سەر بیروڕای خەڵك هەبێ، دەبێ وڵامی تەواوی ئەو قسانە بدەمەوە کە دژبەرانی بیروڕای من کردوویانن، هەروەها دەبێ تەواوی ئەو بەڵگە و هۆکارانە بێنمەوە بیر خۆم کە ئەوان هێناویانەتەوە، بە واتایەکی دیکە لایەنی عەقڵپەسندی ئەم هۆکار و بەڵگانە بدۆزمەوە و وەڵامیان بدەمەوە سەرەڕای سەلماندنی ناڕاستیی هەمووی ئەو بەڵگانەی کەوتوونەتە لایەنی سەلمێنەریی مەسەلەکەوە، ناچار دەبم منیش بۆ سەلماندنی مەسەلەیەکی باش و پۆزەتیڤ بەڵگەی باوەڕپێکراو و جێی متمانە بێنمەوە. تەنانەت ئەگەر لە دەرەقەتی تەواوی ئەو شتانەش دەربێمو بەرامبەرەکەم بخەمە بەردەم کۆمەڵێك بەڵگەهێنانەوەی بێ وەڵام و تەنانەت تاقە هۆکار و بەڵگەیەکیشی بێ وەڵام نەهێڵمەوە، دیسانیش دەبێ لە بیرمان نەچێ کە هیچم نەکردووە، چونکە شتێکی کە لەلایەکەوە لە ئاستێکی جیهانیدا کاری پێدەکرێ، لە لایەکی دیکەشەوە دەریایەکی بێ بەستێنی هەست و سۆز و کەفوکوڵ لە خۆیدا حەشار داوە، و پێدەچێ تەواوی پێشداوەرییەکان بە قازانجی ئەو تەواو بن. پێشداوەریگەلێك کە لەوە بەهێزترن بکرێ بە هۆکار و بەڵگەهێنانەوە لە بیر و مێشکی خەڵك بسڕدرێنەوە، مەگەر ئەوەی کە خەڵکەکە لە ڕووی ئاوەزمەندییەوە لەو پەڕی تێگەیشتوویدابن.

من ئەم گرفتانەم بە مەبەستی کرووزانەوە و پاڕانەوە نەخستوونەتە بەر باس، چونکە ئەوەش خۆی کارێکی خۆڕاییە. هەر کات بمانەوێ بە چەکی عەقڵ و ئاوەز بەرەنگاری کەفوکوڵ و ئینتیما کردەییەکانی خەڵك بینەوە، ئەم گرفتانە ئاسایین. بە دڵنیاییەوە ئێمە کاتێك دەبێ "چاوەڕوانیی ئەوەمان لە خەڵك هەبێ کە هەست و سۆزەکان و کەفوکوڵیان وەلا بنێن و پشت بە هێزی عەقڵ و ئاوەز ببەستن و ئەو

بنەچە کردەییانە وەلا بنێن کە لە سەری پەروەردە کراون و بەشی هەرە مەزنی سیستەمی ئێستای جیهانی لە سەر دامەزراوە". کە زۆرینەی ئادەمیزادەکان لە باری درك و تێگەیشتنەوە لەوەی هەن پەروەردەتر و پوختەتر بووبێتن، بەتایبەتی ئەگەر چاوەراونیمان هەبێ کە ئەوان، ئەو دەمەی لەگەڵ بەڵگەهێنانەوەیەکی پێچەوانەی بیروڕای خۆیان تێکەوتن و بە هێزی لۆژیك دەروەستی نەهاتن، ملی بۆ رابکێشن. بەو پێیە من لە سەر ئەوە مشتومڕ لەگەڵ خەڵکی ناکەم کە بۆچی هۆکار و بەڵگەهێنانەوە بە هەند وەرناگرن، بەڵام من لە سەر ئەوەی کە ئەوان بایەخێکی زۆر بە داب و نەریت و ئیحساساتی رەشۆکان دەدەن بە توندی دژایەتییان دەکەم. بە تایبەت ئەو مەیل و گرۆییە ناڕەوایانەی لە سەدەی نۆزدەمدا پەرەیان گرتووە و لە راستیدا دژکردەوەیەکن بەو شتانەی لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ئارادا بوون، یەکێکیان ئەوەیە کە هەوڵدەدەن هەڵەهەڵنەگرییەك، بدەنە پاڵ توخمە ناعەقڵێنییەکانی گەوهەری مرۆڤ، کە لە سەدەی هەژدەهەمدا دەیاندایە پاڵ توخمە عەقڵانییەکان. لە سەدەی هەژدەهەمدا پلەی خودایەتییان بە "ئاوەز" بەخشیبوو و ئێمە ئێستاکە وارسکە (غریزە)مان لە جێگەی داناوە و هەرچی لە ناخی خۆماندا بەدیی دەکەین و بۆمان ناچێتەوە سەر بنەمایەکی عەقڵانی دەیدەینە پاڵ وارسکەوە. ئەم بت پەرستییە کە لە سەدەی هەژدەهەم زیاتر سووکایەتیی تێدایە و پڕزیانترین بت پەرستیی سەردەمی ئێمەیە و هەنووکە بە توندی پشتیوانی لە گشتێتی ئەم دیاردەیە دەکرێ ، لەوانەیە لە نێو نەچێ هەتا ئەوەی کە جێگەی خۆی نەدا بە سایکۆلۆژییەکی عەقڵانی لۆژیکی، سایکۆلۆژیایەك کە تیشك بخاتە سەر ئاخێزگە و سەرچاوەی زۆربەی ئەو حەز و گرۆییانەی هەنووکە ئێمە بە ویستی سروشت و خوای لە قەڵەم دەدەین. تا جێیەك کە پێوەندی بەم باسەوە هەبێ، من ئەو هەڵومەرجە نەخوازراوە قەبوڵدەکەم کە ئەم پێشداوەرییە بەسەرمدا دەیسەپێنێ. من گومانم لەوەدا نییە کە نەریت و کەفوکوڵ و ئیحساساتی خەڵك بەرەنگارم دەبنەوە، مەگەر ئەوەی کە بیسەلمێنم کە هەبوونی فلانە نەریت لەم یا لەو سەردەمەدا، نیشانەی



راست و دروست بوونی نییە و سەرچاوەی هێز و تۆکمەییەکەشی ناچێتەوە سەر لایەنە شەریف و مەزنەکانی سروشتی مرۆڤ، بەڵکو لەوانەیە رەگ و ریشەی لە لایەنە چەپەڵەکانی سروشتی ئەو دابێ. من مل بۆ ئەوە رادەکێشم کە داوەریکردن (قضاوت) لە دژی من هەبێ، مەگەر ئەوەی کە بتوانم بیسەلمێنم دادەوری دادگاکەی من لەگەڵ دژبەرەکانم رێککەوتووە، ئەگەر لەو کارەشدا سەرکەوم سەرکەوتنەکەم شتێکی زۆر گەورەش نییە، چونکە سەڵماندنی ئەم مەسەلەیە ساکارترین ئەرکێکە، کە لە ئەستۆمدایە.

لە هێندێ شوێندا گشتیبوونی رێکارێك گریمانەیەکی قایمە بە نیشانەی ئەوەی کە ئەم رێگە چارەیە بەرەو ئامانجگەلێکی جێی پەسند و دڵخواز رێنوێنیمان دەکا، یا ئەوەی کە لە رابردوودا کردوویەتی. وەها رێگەچارەیەك ئەو کاتە متمانەی پێدەکرێ کە وەکو ئامرازێك بۆ گەیشتن بە وەها ئامانجگەلێك لە قەڵەم بدرێ و هەر کاتێك خەڵك ئەزموونیان کرد و بۆیان دەرکەوت کە ئەم رێکارە باشترین و کاریگەرترین مێتۆدە بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، ئیتر لە هەوڵی پاراستنی دا دەبن. ئەگەر زاڵێتی و دەسەڵاتدار بوونی پیاوان بە سەر ژناندا بەرهەمی بەرواوردێکی هۆشیارانە بوایە لەنێوان مێتۆدە جۆراوجۆرەکانی پێکهێنانی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا و ئەگەر دوای ئەوەی کە شێوازە جۆراوجۆرەکانی رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکانیان ئەزموون بکردایە (بۆ وێنە، دەسەڵاتدارێتیی ژنان بە سەر پیاواندا، یەکسانیی ژن و پیاو، تێکەڵاوێك لەم دووانە و هەر جۆرە پێوەندییەکی دیکەی کە دەکرێ بیری لێ بکەیتەوە) و دوای ئەزموونکردنی تەواوی ئەم مێتۆدانە بڕیاریاندابایە و هاتبانە سەر ئەوەی کە ژنان لە هەموو بارێکەوە دەبێ گوێڕایەڵی پیاوان بن و هیچ بەشدارییەکیان لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا نەبی و بە پێی یاسا دەروەست بن بەوەی کە لە ژیانی تایبەتی (خصوصی)دا گوێڕایەڵی ئەو پیاوانە بن وا چارەنووسی خۆیان پێیەوە گرێداوە و ئەگەر ئەوەش سەلمێندرابا کە ئەم پێوەندییانە بەختەوەریی هەردووکیانی لێدەکەوێتەوە، لێرەدا دەکرا بێینە سەر ئەم باوەڕە کە هەڵبژاردنی وەها سیستەمێك،

لەو کاتەدا بە پێی بەڵگە و ئەزموونەکانی سەردەمی خۆی، باشترین و گونجاوترین سیستەم بووە. بەڵام بەم جۆرەش، زۆربەی ئەم هۆیانەی لە سەرەتادا پاساوێك بۆ ئەم مێتۆدە بوونە، لە رەوتی زەماندا کەم بایەخ بوون و وەلادەنران. ئەویش شتێکە، کە زۆربەی واقیعە گرینگە کۆمەلایەتییەکان دەگرێتەوە. سەرەتا دەبێ ئاگاداری ئەوە ببین کە سیستەمی هەنووکەیی (سەردەمی میل) کە خەڵك بە گشتی پشتیوانیی لێدەکەن و رەگەزی لاواز ناچار دەکا بێ ئەملاوئەولا گوێڕایەڵی رەگەزی بەهێزتر بێ، تەنیا و تەنیا پشتی بە تیۆرییەوە قایمە. چونکە هیچ کات سیستەمێکی دیکە تاقی نەکراوەتەوە و بەو پێیە ناکرێ بۆ سەلماندنی راستی و ناڕاستیی ئەم سیستەمە پشت ببەستن بە ئەزموون بە واتای شتێکی دژ بە تیۆری. دوای ئەوە دەبێ لەوەش ئاگادار بین کە قەبووڵکردنی ئەم سیستەمە نادادپەروەر و نایەکسانخوازە بە هیچ شێوەیەك، بەرهەمی بیروڕا و تێفکرین، یان بەرهەمی بیروڕا کۆمەلایەتییەکان و ئاکامی هیچ بیروبۆچوونێکی ئەوتۆ نییە کە بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی یا ئەوەی کە باشتربوونی رەوشی کۆمەلایەتی لە بەر چاو بووبێ. ئەم سیستەمە راست هەڵقولاوی رەوشێکە، کە لە کازیوەی مێژووە و لە سەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە هەبووە. هەر ئافرەتێك (لە بەر ئەو بەها و بایەخەی پیاوان پێیان داوە هەروەها بە هۆی لاوازیی جەستەییەکەی لە چاو پیاوان) بە شێوەیەك لە شێوەکان دیلی بەردەستی پیاوێك بووە. سیستەمە حقوقی و سیاسییەکان لە سەرەتای دەرکەوتن و سەرهەڵدانیاندا تەنیا جەخت لە سەر ئەو پێوەندییانە دەکەنەوە کە لە نێوان تاکەکاندا هەن. ئەو سیستەمانە، واقیعە کۆمەلایەتییەکانی پێشوو دەکەن بە یاسا و دەنگی کۆمەڵگەشی بۆ وەردەگرن، مەبەستی سەرەکیشیان ئەوەیە کە ئەو دژایەتی و کێشە بێ یاسا و رێسایانە لابەرن کە بە پێی بەهێزی و توانای جەستەیی دانراون و ﴿ئەوان﴾ بە کەڵکوەرگرتن لە ئامراز و مێتۆدگەلی گشتی و بە شێوەی رێکخراو مافی تاکەکان دیاری بکەن و داکۆکییان لێ بکەن. ئەوانەی لە رابردوودا بە زەبر و زەنگ ناچار بوون ملکەچ بن، ئێستا کە ملکەچی و گوێڕایەڵییەکەیان بوّتە



شتێکی یاسایی. کۆیلەداری کە لە سەرەتادا بە زەبر و زەنگ دەکرا، وردە وردە خرایە چوارچێوەی گرێبەستێکەوە کە، کۆیلەدارەکان بە دڵیان بوو. چونکە ئەوانە (کۆیلەداران) بۆ پاراستنی ماڵ و مڵکی خۆیان، کە کۆیلەکانیش بەشێك بوون لێی، دەبوایە یەکگرتوو بن و هێزێکی هاوبەش پێك بێنن لەسەرەتاییەکاندا، بەشی هەرەزۆری پیاوان، و هەموو ژنان، کۆیلە بوون. و دەبوایە چەند سەدەیەك بە سەر دابێ و زەوی دەورودووکانی جۆراوجۆر ببینێ، سەردەم و قۆناخگەلێك کە لە بواری کولتوورییەوە لە لوتکەی پشکووتن دابوو، تاکو بیرمەندگەلێك سەرهەڵدەن کە بوێرن بە دڕدۆنگییەوە بڕواننە کۆیلەداری لە هەر شێوازێك بێ و لە سەر پێویستبوونی کۆمەلایەتییەکەی بکەونە باس و لێداون و مشتومڕ.

ئەم بیرمەندانە وردە وردە سەریان هەڵدا و (لە سایەی پێشکەوتنی گشتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە) کۆیلایەتیی پیاوان، لانیکەم لە ولاتانی ئەورووپای مەسیحیدا، هەڵوەشێندرایەوە (ئەگەرچی لە یەکێك لەم ولاتانەدا ئەوە تازە چەند ساڵێکە ئەم شتە رووی داوە)[1] * و کوێلایەتیی رەگەزی مێوینەش وردە وردە شێوازێکی هێورتری وەرگرتووە و بووەتە جۆرێك لە بەستراوەیی. بەڵام ئەم بەستراوییە، بەجۆرەی ئێستا کە هەیە، نەریتێکی رەسەن نییە کە بە پێی دادپەروەری و بەرژەوەندیی کۆمەلایەتییەوە لاپەڕەیەکی نوێی هەڵدابێتەوە. ئەم بەستراوەییە درێژەی کوێلایەتییەکەی جارانە. بەڵام هەر ئەو هۆکارانەی کە ئاکار و مێتۆدە گشتییەکانی هێورتر (معتدلتر) کردۆتەوە و کاریگەریی بووە لە سەر تەواوی پێوەندییە کۆمەلایەتییەکان و دادپەروەریی کۆمەلایەتیی بە سەر داسەپاندوون، گەلێك ئاڵوگۆڕ و چاکسازیی لە کوێلایەتیی کۆندا پێکهێناوە، کەچی هێشتا شوێنەوارێك لە ئاخێزگەی دڕندەییانەی ئەم کوێلایەتییە هەر ماوەتەوە. بەو پێیە، هەبوونی ئەم کوێلایەتییە هیچ پاکانە و پاساوێك هەڵناگرێ و تەنیا خاڵێك کە دەکرێ بۆ

[1] - مەبەست سەردەمی نووسەرە: وەرگێڕ.

داکۆکیکردن لێی بگوترێ ئەوەیە کە هێشتا لە لاپەڕەی مێژوودا نەسڕدراوەتەوە و ئێستاش درێژە بە بوونی خۆی دەدا، لە حاڵێکدا زۆربەی ئەم دیاردانەی کە هەر لەو سەرچاوە قێزەونەوە سەریان هەڵداوە، هیچ شوێنەواریان لێنەماوەتەوە. هەر بۆیەش خەڵکی ئاسایی سەریان سوڕ دەمێنێ کاتێك دەبیستن نایەکسانیی مافەکانی ژن و پیاو جگە لە یاسای مەزنایەتیی "بەهێزترەکان"*[1] سەرچاوەیەکی دیکەی نییە.

هەر ئەم راستییەی کە، یاسای زۆرەملێ جێی پەسندی خەڵك نییە، دەری دەخا کە ژیارو، هەروەها باوەڕە ئەخلاقییەکانی تۆرەمەی مرۆڤ، لە هێندێ بواردا بەرەو پێگەیشتن هەڵچوون. ئێمە هەنووکە لە دۆخێکداین ﴿سەردەمی نووسەر (وەرگێڕ)﴾ یا وردتر بڵێین، ئەمێستاکە یەك دوو وڵات لە پێشکەوتووترین وڵاتانی جیهان، لە دۆخێکدان، کە بە هیچ جۆرێك وەکو پرەنسیپێکی رێکوپێککەری کاروبارەکان ناڕواننە یاسای مەزنایەتیی بەهێزترەکان و هەڵگری نین، هیچ کەسێك بە راشکاوی داکۆکیی لێ ناکا و هیچ کەسێك بۆی نییە لە پێوەندیی نێوان مرۆڤەکاندا بەکاری بهێنێ هەر کات کەسێك توانی کەڵکی لێوەرگرێ رواڵەتێکی دڵخوازی پێدەدا و ئیدیعا دەکا بەرژەوەندیی گشتیی تێدایە. لە بەر ئەوەی کە ئێستا رواڵەتی کاروبار و دۆخەکە وایە، خەڵك خۆیان دەخەڵەتێنن و دەڵێن دەسەڵاتی زۆرەملێ کۆتایی هاتووە و باوی نەماوە و یاسای مەزنایەتیی (سەرتریی) بەهێزەکان ناتوانێ هۆکاری هەبوونی ئەو شتە بێ کە هەتا ئێستا لە ئارادا بووە. ئەوانە پێیان وایە.، تەواوی ئەو ناوەند و دامەزراوانەی لە رابردوودا سەریانهەڵداوە، تەنیا لە بەر ئەوەی کە لەگەڵ جەوهەر و سروشتی مرۆڤ یەکدەگرنەوە و پاراستنیان بە قازانجی خەڵك بووە، هەتا ئێستا (کە سەردەمی ژیاری پێشکەوتوویە) خۆیان راگرتووە و نەفەوتاون. خەڵك هێزی مەزن و لە بڕان نەهاتوویی ئەو نەریتانە ناناسن کە لایەنگری لە دەسەڵات دەکەن، خەڵك نازانن کە بۆخۆشیان بە چ سەرسەختییەك لەم نەریتانەدا چەقیان بەستووە. خەڵك نازانن کە حەز و گرۆیی و کەفوکوڵی پاك و بێ خەوش هەروەها دزێوی خاوەن دەسەڵاتەکان لە پاراستنی ئەم

١- یاسایەکە کە بە پێی ئەو مەزن ئەو کەسەیە کە بەهێزترە



نەریتانەدا چ رۆڵێکی بووە، خەڵك نازانن لەنێوچوونی دامەزراوە بێ کەڵکەکان چ درەنگ و بەکاوەخۆ مسۆگەر دەبێ و ئەستەمە لە یەك قۆناغ و سەردەمدا لە یەك دانە بەولاوەتریان بکەوێتەوە بەر هەڕەشەی تێداچوون، کە دیارە ئەم یەکەشیان لاوازترەکەیانە، واتە ئەوەیان کە، زۆر کەم بنجی کوتاوەتە نێو خووخدەی خەڵکەوە، خەڵك تێناگەن کە زۆر بە دەگمەن هەڵکەوتووە، ئەوانەی دەسەڵاتی یاساییان هەیە و بە هۆی ماڵ و سامانەوە بەو دەسەڵاتە گەیشتوون، بەر لەوەی هێزێکی دیکە لە تەختی دەسەڵات بیانخاتە خوارەوە، بە ویستی خۆیان دەسەڵات وەلا بنێن و دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم دەستاودەستکردنەی دەسەڵات قەت بۆ ژنان نەهاتۆتە پێش. ئەم راستییە، وێڕای تایبەتمەندییە دانسقەکانی زاڵ بە سەر کۆیلەکردنی ژناندا، دڵنیامان دەکا لەوەی کە، ئەم ئاڵقەیە لە سیستەمی رەوایی لە سەر بنەمای زۆرەملێ، دوایین ئاڵقەیەکە کە لەنێو دەچێ- هەڵبەت ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە زاڵمانەترین لایەنی کۆیلەکردنی ژنان، لە چاو لایەنەکانی دیکەی، زۆر زووتر چاکسازیی تێدا کراوە و باشتر کراوە. ئەم لایەنە تایبەتەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە لە سەر بنەمای زۆرەملێ دامەزراوە، سەدان ساڵ لە نێو نەریتگەلێکدا بەردەوام بوو کە خۆیان لە سەر بنچینەی یەکسانی و دادپەروەری دامەزرابوون، لەوانەیە بە دڵنیاییەوە بکرێ بڵێین ئەوەیان (کۆیلە کردنی ژنان) لایەنێکی ریزپەر و ناوازە بووە لە چییەتی (ماهیت)ی گشتیی یاسا و نەریتەکان، بەڵام هەتا ئەو دەمەی ئاخێزگە و چاوگەی کۆیلەکردنی ژنان دەرنەکەوێ و لە مشتومڕ و گەنگەشە و بەڵگاندن بەڵگەهێنانەوەدا چییەتیی راستەقینەی دەرنەکەوێ، لایەنە پێك ناکۆکەکانی لەگەڵ ژیاری نوێ دەرناکەوێ و هەست پێناکرێ. هەروەکو یۆنانییەکانیش هەستیان بەوە نەدەکرد کە ئەم کوێلایەتییەی لە ماڵێدا و لە نێو خۆیاندا باو بوو، لەگەڵ ئەوەی کە خۆیان بە خەڵکێکی ئازاد و سەربەست دەزانی دژایەتیی هەبوو.

راستییەکەی ئەوەیە کە خەڵکی ئێستا و دوو یا سێ نەوەی پێشوو، واتای مرۆڤایەتییان بەو شێوەیەی لە سەردەمانی بەراییدا هەبوو، تەواو لە بیر چۆتەوە و تەنیا کەسانێکی دەگمەن و کەم، ئەویش ئەوانەی مێژوویان بە وردی خوێندۆتەوە، یا

ئەوەی کە بۆ ماوەیەك لەو شوێنانەی دونیادا ژیاون کە هێشتا خەڵکەکەی وەکو پێشینیانیان دەژین، دەتوانن لە دۆخی کۆمەڵگەکانی رابردوو تێبگەن.

خەڵك نازانن کە لە رابردوودا یاسای "حەق بەو ئەوکەسە هەقە کە بەهێزترە" رێسای ئاسایی و باوی ژیان بووە و لە بەر چاوی خەڵك باسی لێوەکراوە و جێبەجێ کراوە. من لە لێکدانەوەی ئەم دۆخەدا بە تەوس و توانجەوە قسە دەکەم نە بە رووهەڵماڵدراوی- ئەگەرچی لەو قسانەدا ئەوە دەردەکەوێ کە شتێك لە ژیانی پێشیناندا هەبووە کە بۆ ئەوە دەبێ لێی شەرمەزار بن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە خەڵکی ئەو کات بێجگە لە هێندێ فەیلەسووف، یا پیاوچاکان، ئەم جۆرە لە ژیان و حاڵ و باڵی خۆیان نەڕوانیوە و وەها تێڕوانینێکیان نەبووە. مێژوو پێمان دەڵێ کە بەشی چینە جۆراوجۆرەکانی خەڵك لە ژیان و ماڵ و سامان و ئەوەی بەختیاریی ماددیی مرۆڤ دابیندەکا، تا چ رادەیەك بەستراوەیی بەو هێز و دەسەڵاتەوە هەبووە کە بوویانە، ئەوەش وێنایەکی روونمان لەو پێوەندییە زاڵمانەیە بۆ دەخاتەڕوو کە لەنێو مرۆڤەکاندا باو بووە. هەروەها مێژوو شایەتی دەدا، کە تەواوی ئەوانەی بەرەنگاری دەسەڵاتدارانی خاوەن چەك دەبوونەوە، دەستیان بۆ کارێکی پڕ مەترسی دەبرد چونکە نەك هەر یاسای سەرکوت و زۆرەملێ، بەڵکو تەواوی یاساکانی دیکەش و هەموو چەمکە زاڵە کۆمەڵایەتییەکان، دژی ئەوان بەکاردەهێندران و دەسەڵاتداران ئەوانەیان نەك هەر بە جەنایەتکار، بەڵکو بە چەپەڵترین جەنایەتکار دادەنا و سزایەکیان بۆ دەبڕینەوە کە مرۆڤ هەر نەتوانێ بیری لێبکاتەوە. یەکەم نیشانەی لاواز کە لە گفت و بەڵێنی باڵادەستەکان (چینی سەروو) سەبارەت بە لەبەرچاوگرتنی مافی ژێردەستەکان، دەرکەوت. ئەو کاتە بوو کە چینی باڵا دەست، بە مەبەستی بەرەوپێشبردنی کاروبارەکانیان، دنە دران کە هێندێ گفت و بەڵێن بدەن بە ژێردەستەکانیان. ئەم بەڵێنانە، تەنانەت ئەو کاتەی کە سوێند و ئایەتیش بۆ بەڕێوەبردنیان دەخورا، لە سەدە و سەردەمەکاندا بە بیانووی جۆراوجۆر پشتگوێ دەخران و مافی ژێردەستان بەردەوام پێشێل دەکرا، بەڵام ئەم چەشنە کردەوانە زۆر



جاران، دەبووە هۆی ئازاری ویژدانی باڵا دەستەکان، مەگەر ئەوانەی کە باوەڕێکی ئەوتۆیان بە ئەخلاق نەبووە. کۆمارەکانی کەونار، کە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانەوە، لە سەر بنەمای جۆرە پەیمان و گرێبەستێك دامەزرابوون، یا بەرهەمی پێکهاتنی چەند کەسێك بوون کە لە باری هێز و دەسەڵاتەوە زۆر لێك جیاواز نەبوون، لە ریزی یەکەمین نموونەگەلێك دان کە پێوەندیی نێوان مرۆڤەکان تێیاندا بە پێی یاسایەك بێجگە لە یاسای زۆرەملێ، بەڕێوە دەچوون. ئەگەرچی هەر لەم نموونانەشدا یاسای زۆرەملێ و زەبر و زەنگ، بە تەواوی هێزەوە لەنێوان ئاغا و رەعیەتدا هەر بووە، سەرەڕای ئەوەش، پێوەندی نێوان وڵاتێك و وڵاتانی ژێردەستی ئەم وڵاتە و هەروەها پێوەندی نێوان وڵاتە سەربەخۆکانیش لە سەر بنەمای زۆرەملێ و زەبر و زەنگ دادەمەزرا. (مەگەر ئەوەی کە بە شێوەیەکی دیکە پێکهاتبان)، وەلانانی یاسای زۆرەملێ، تەنانەت لە بیاڤی زۆر بەرتەسکیشدا، بووە هۆی ئەوەی کە هێندێك لەو هێزە شاراوانەی لە سروشتی مرۆڤدان، بپشکوێن. چونکە ئەم رەوشە نوێیە هەلی بۆ پشکووتنی هەست و تواناگەلێك رەخساند کە زۆر زوو دەرکەوت کە تەنانەت بۆ بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیش (ماتریاڵییەکان) بەهایەکی مەزنیان تێدا شاراوەتەوە و پێویست ناکا بیانخولقێنی، بەڵکو تەنیا دەبێ بەهێز بکرێن. ئەگەرچی کۆیلەکان وەك ئەندامانی گەل و وڵات چاو لێنەدەکران، بەڵام یەکەمین جار لە وڵاتانی ئازاد دا بوو کە کۆیلەکان هەستیان بەوە کرد کە دەبێ وەکو مرۆڤ مافەکانیان لە بەر چاو بگیردرێن. من باوەڕم وایە کە رەواقییەکان، یەکەمین کەسانێك بوون کە بە گوێی خەڵکیاندا دەخوێند کە لە رووی ئەخلاقییەوە، لە هەمبەر کۆیلەکانیاندا بەرپرسن (هەڵبەت یاساکانی "جوولەکان" لەم بارەوە، وەپێش رەواقییەکان کەوتوون). پاش سەرهەڵدانی مەسیحییەت، لە دونیای تیۆرییدا کەس بەم باوەڕە نامۆ نەبوو، دوای بەهێزبوونی کڵێسەی کاسۆلیکیش، بەردەوام هەبوون کەسانێك کە دژایەتییان لەگەڵ کوێلایەتی کردووە. بەڵام سڕینەوە و لابردنی کوێلایەتی قورسترین ئەرکێك بوو کە کەوتبووە سەر شانی مەسیحییەت و هیچ کات دەرەقەتی نەهات. کڵێسە زیاتر لە

هەزار ساڵ ئالاهەڵگری دژایەتیکردنی کوێلایەتی بوو بەڵام هیچ سەرکەوتنێکی بە دەست نەهێنابوو. بە ئاکام نەگەیشتنی هەوڵی کڵێسە لە بەر ئەوە نەبوو کە کاریگەری لە سەر بیر و زەینی خەڵك نەبوو. هێزی کڵێسە ئێجگار زۆر و سەرسووڕهێنەر بوو، کڵێسە دەیتوانی پادشا و بەگزادەکان ناچار بکا کە گرانبهاترین ماڵ و مڵکی خۆیان پێشکەشی کڵێسە بکەن. کڵێسە دەیتوانی هەزاران کەس هانبدا کە لە هەڕەتی لاوێتیدا و لەو دەمەیدا، کە دەیانتوانی چێژ لە هەموو شتەکانی دونیا وەرگرن، خۆ بخزێننە قوژبنی پەرستگەکانەوە و لەکەمدەستیدا رۆژوو بگرن و بە هیوای رزگاری ستایشی خوا بکەن. کڵێسە دەیتوانی سەدان هەزار کەس لە رێگەی زەوی و دەریاوە، لە ئاسیا و ئەورووپاوە کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی گیانی شیرینیان بکەن بە فیدای رزگاری "بیت المقدس". کڵێسە دەیتوانی پاشاکان ناچار بکا لە ژنە ئازیزەکانیان جویێ ببنەوە- ئەگەر رایگەیاندبایە کە ژنەکانیان دەکەونە ریزی خزمانی پلە حەوتەمیان (بە پێی لێکدانەوەکانی ئێمە پلەی چواردەهەم). کڵێسە تەواوی ئەو شتانەی لە دەست دەهات، بەڵام نەیدەتوانی نەهێڵێ پیاوان پێکەوە بە شەڕ نەیەن و هەروەها نەیدەتوانی ئاغاکان ناچار بکا کەمتر رەعیەت و هاوولاتییانی خۆیان بچەوسێننەوە. کڵێسە نەیدەتوانی خەڵك ناچار بکا دەست لە ملهوڕی و توندوتیژی هەڵگرن، جا چ لە گۆڕەپانی خەباتدا و چ لە دەربڕینی شادمانی و کەفوکوڵدا. خەڵك هەرگیز گوێیان لەم چەشنە ئامۆژگارییانە رانەدەگرت، مەگەر ئەوەی کە هێزێکی لە خۆیان قورستر و زاڵتر، سەرکەوتبا. شەڕەکان تەنیا ئەو کاتە بەرتەسك دەبوونەوە کە پادشاکان بەهێزتر دەبوون. پاش ئەوە، تەنیا پادشا و خوازیارانی تەخت و تاج پێکەوە بەشەڕ دەهاتن، دەسەڵاتی زاڵمانەی بەگزادە و دەوڵەمەندان کاتێك لە سەر وەرزێڕ و کاسبکاران کەم بۆوە کە بۆرژوازیی دەوڵەمەند و شەڕخواز، نیشانیدا کە دەتوانێ لە پەنای ئەو شارانەدا کە لە رووی عەسکەرییەوە قایمن، هەروەها بە کەڵکوەرگرتن لە پیادە نیزامی ناشارەزا بەڵام بە باشی رێکخراو بەرەنگاری پیشەگەر بەڵام شوالیە (شا سواران)ی بێ سەرەوبەرە بێتەوە و بیان بەزێنێ. دەسەڵاتی



دەرەبەگان هەتا ئەو کاتە درێژەی کێشا کە هەژاران ئەوەندە بەهێز بوون کە توانییان تۆڵەی خۆیان لە زاڵمان بستێننەوە. لە ئەورووپاش دەسەڵات و ئۆتۆریتەی ئەریستیۆکراتەکان هەتا شۆڕشی فەڕەنسا، هەر وا لە ئارادا بوو، بەڵام لە بریتانیا رێکخستنی رێکوپێك و بەهێزی چینە ئازادیخوازەکان بووە هۆی ئەوەی کە، یاساگەلی دادپەروەرانە و ناوەندگەلی سەربەخۆ لە سەرانسەری وڵاتدا دامەزرێن و ئۆتوریتەی ئەشراف زووتر کۆتایی پێ بێ.

زۆربەی خەڵك نازانن کە تۆرەمەی مرۆڤ لە بەشی هەرە مەزنی ژیانی خۆیدا یاسای زۆرەملێی کردۆتە سەرچەشنی ئاکار و کرداری خۆی. ئەگەر جاروبارەش جگە لەوە بووە، ئەوا بەرهەمی دۆخێکی ناوازە و پێوەندیگەلێکی ناباو بووە. ئەوەش کە کاروباری کۆمەڵگە، بە گشتی و لانیکەم بە رواڵەت، بە پێی ئەم یا ئەو یاسا ئەخلاقییە رێکوپێك دەکرێ و بەڕێوە دەچێ، رەوشێکی نوێیە، بە لای خەڵکەوە ئەستەمە ئەوە بێننە پێش چاو کە ناوەند و نەریتگەلێك لە کۆمەڵگەدا هەبن کە جگە لە سەر بنەمای یاسای زۆرەملێ، لە سەر هیچ بنەمایەکی دیکە دانەمەزرابن و چەندین سەدە و سەردەمیش خۆڕاگرن، بە بێ ئەوەی کە سەقامگیربوونیان، تەنانەت لە قۆناغی سەرەتاییشدا، بە سەرنجدان لەڕای گشتی پێکهاتبێ.

هەتا کەمتر لە چل ساڵ لەمەوبەر ﴿سەردەمی نووسەر١٩٨٦- وەرگێڕ﴾، بریتانییەکان بە پێی یاسا بۆیان هەبوو مرۆڤەکان وەکو کالایەك، بکەنە کۆیلە هەر ئەوان، لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بۆیان هەبوو مرۆڤەکان بڕفێنن و بیانبەن و هەتا سنووری مەرگ کاریان پێ بکەن. زۆر کەس ئەم شێوە بەکارهێنانەی هێز و زۆرەملێیەیان ئیدانە دەکرد، تەنانەت ئەو کەسانەی بە هەر شێوەیەکی دیکە بەرامبەر بە دەسەڵاتدارێتیی و چەوساندنەوەی بێ سنوور کەمتەرخەمییان دەنواند. بەڵام هەر ئەم کۆیلەدارێتییە، بە هەموو تایبەتمەنییەکانییەوە، ئەگەر بە شێوەی بێ لایەنانە لێی بڕوانین، دژایەتییەکی زۆری لەگەڵ باوەڕ و هەست و سۆزی مرۆڤەکاندا، هەتا ئەم دواییانەش، هەر وەکو زۆر کەس لە بیریانە، لە بریتانیای مۆدێرن و مەسیحیدا

کۆیلەداری، کارێکی یاسایی بوو. لە نیوەی ئەمریکای ئەنگلۆ- ساکسۆنیشدا، هەتا سێ چوار ساڵ لەمەوبەر،کۆیلەداری نەك هەر لە ئارادا بوو، بەڵکو لە هەرێمە کۆیلەدارەکاندا، بازرگانیکردن بە کۆیلەوە، تەنانەت بەخێوکردنی کۆیلە بۆ بازرگانی، باو بوو. بەڵام کۆیلەداریێتی شتێك بوو کە هەست و سۆزی خەڵکی دەورووژاند و رایدەپەڕاند. جگە لەوەش، هیچ نەبێ لەبەریتانیا، بە دەگمەن رێدەکەوت کەسێك پیشتیوانی لێ بکا یا لە هەبوونی، قازانجێکی بە نەسیب ببێ. هەر بۆیەش، کۆیلەداریێتی جیاواز بوو لەو کەڵئاوەژۆییانەی لە زۆرەملێ وەردەگیران. پاڵنەر خواستی کۆیلەداریێتی تەنیا بەدەستهێنانی ماڵ و سامان بوو و تێکەڵاوی هیچ شتێکی دیکەش نەببوو جلوبەرگی فریودەری نەکردبووە بەری. ئەوانەش کە قازانجیان لێی دەبینی بەشی هەرە بچووکی خەڵك بوون، لەکاتێکداکە ئەو کەسانەی هیچ قازانج و بەرژەوەندییەکیان تێیدا نەبوو، بە پێی هەستی سروشتیی خۆیان، بە توندی لێی بێزار بوون. هەڵبەت دیارە ناکرێ وەها نموونەیەك بکەینە بەڵگە بۆ ئەوانی دیکە و بیگشتێنین. بەڵام سەبارەت بە بەردەوامبوونی درێژماوەی پادشایەتیی رەها (مطلقة) دەکرێ چ بڵێین؟ هەنووکە لە بریتانیا نزیك بە هەمووی خەڵك ئەوەیان قەبووڵە کە سەرەڕۆیی عەسکەری، نموونەیەکە لە دەسەڵاتی یاسای زۆرەملێ و هیچ چاوگە و پاکانە و پاساوێکی دیکەی نییە. بەڵام ئەو جۆرە حکوومەتە جگە لە بریتانیا لە نێو تەواوی نەتەوەکانی ئەورووپادا باوی هەیە یا لانیکەم تازە باوی نەماوە و تەنانەت ئێستاکەش لە نێو هەموو چینەکاندا، بەتایبەتی ئەوانەی نانێکی لێ دەخۆن، گەلێك لایەنگری هەن. رەوشی هەموو سیستەمە ریشەدارەکان، تەنانەت ئەو دەمەی دڵخوازی کەس نین، بەم چەشنەیە و تەنانەت ئەگەر لە هەموو قۆناغە مێژووییەکاندا نموونەگەلێکی گرینگ و ناسراوی پێچەوانەی ئەم سیستمانە بەدی بکرێ و لانیکەم تەواوی ئەم نموونانەش لە نێو دیارترین و بەختەوەرترین کۆمەڵگەکانیشدا باویان هەبێ، دیسانیش دۆخەکە هەر بەجۆرەیە کە گوتمان. دەسەڵاتدار لە حکوومەتی توتاڵیتاردا، تەنیا کەسێکە کە، راستەوخۆ لە دۆخەکە قازانجی پێدەگا. ئەوە خەڵك و



ئەوانی دیکەن کە گوێڕایەڵی ئەون و ئەم بارودۆخە ئازاریان دەدا. هەموان لەوەی کە هەوساری دەسەڵاتی سەرەڕۆیان لە لغاو دابێ و کۆیلەی بن، بە پێی سروشت بە گوێرەی پێویست، هەست بە سووکایەتی دەکەن، بێجگە لەو کەسەی کە لە سەر تەختی دەسەڵات پاڵی داوەتەوە و ئەو کەسەش کە بڕیارە جێی بگرێتەوە. بەڵام مەسەلەکە لە دەسەڵاتی پیاوان بە سەر ژناندا تەواو جیاوازە! من بەر لە کاتی خۆی قسە لە سەر لایەنی ئەرێنی و نەرێنیی ئەم دۆخە ناکەم. ئێستا، دەمەوێ ئەوە بخەمە روو کە زاڵبوونی پیاوان بە سەر ژناندا، ئەگەرچی جێی پەسەند و پاساوهەڵگر نییە، بەڵام هێندێ تایبەتمەندیی تێدایە کە، لە چاو ئەو دەسەڵات و هێژموونیانەی هەتا ئێستا خۆیان راگرتووە، ئەویان (هێژموونی پیاوان بە سەر ژناندا) دەخاتە پێگەیەکی تۆکمەتر و قایمترەوە و بوار بۆ بەردەوامبوونەکەی خۆشتر دەکا. دەسەڵات تاکەکان لەخۆبایی دەکا و بێگومان بەکارهێنانی هێز بەرژەوەندیی کەسێنی (شخصي) بۆ ئەوان تێدایە، بەڵام خاڵی سەرنجڕاکێش لە سەر هێژموونی پیاوان بە سەر ژناندا ئەوەیە کە ئەم دەسەڵات و هێژموونییە تایبەت نییە بە چینێکی تایبەت، بەڵکو ئەوە خاڵی هاوبەشی هەموو پیاوەکانە. لە هەر چین و توێژێك بن، ئەم ئۆتۆریتەیە، لەو جۆرە ئۆتۆریتە و دەسەڵاتداریێتییانە نییە کە لە روانگەی زۆربەی لایەنگرانییەوە، جێی پەسەند و لە بەر دڵان و لە هەمان کاتدا خەیاڵی (ئەریستراکت) بێ. هەروەها وەکو ئامانجە سیاسییەکانیش نییە کە زۆر جار باڵە سیاسییەکان تووشی کێبڕکێ و بەرەنگاری دەکەن، کەچی جیا لە رێبەرەکانیان کەمتر قازانجی خەڵکی تێدایە. ئەم ئۆتۆریتەیە لەگەڵ تاکەکان دێتە نێو خێزانەوە و لە چەقی هەر بنەماڵەیەك کە لە ژێر دەستی پیاو دایە، جێ دەگرێ و هەر کوڕێك کە بە هیوای پێکهێنانی خێزانە چاوەڕێی وەها رۆژێکە. هەر پیاوێك، لە هەژارەکەیەوە بگرە تا دەگاتە دەسترۆیشتووترینەکەیان، وەکو یەك ئەم ئۆتۆریتەیە بەڕێوەدەبەن و یا دەبێ بەڕێوەی بەرن و ئەم دەسەڵات سەپاندنە تایبەتمەندییەکی دیکەشی هەیە کە دڵگرتری دەکا: هەر کەس حەزی لە زاڵبوونە، پێی خۆشە بە سەر کەسێکدا زاڵبێ کە لە هەموو کەس

لێی نزیکترە: بەسەر کەسێکدا کە هاوژینێتی، بە سەر کەسێکدا کە زۆر خاڵی هاوبەشیان هەیە. بە سەر کەسێکدا کە ئەگەر لە ژێر دەسەڵاتیدا نەمێنێ لەوانەیە ئەوپەڕی ناکۆکی لە سەلیقە و هۆگرییەکانیدا بێتە ئاراوە. ئەگەر لەو شوێنانەدا کە ئۆتۆریتە بە ئاشکرا لە سەر بنەمای زۆرەملێ دامەزراوە و زۆر بە کەمی پشتیوانیی خەڵکی بەرەو خۆی راکێشاوە، ئاوا بە هێوری و هێمنی و بەم دژوارییە لێی دەرباز بوونە، دەرباز بوون لەم ئۆتۆریتەخوازییە، زۆر ئەستەمترە، ئەگەرچی، ئاخێزگەکەی بە هیچ شێوەیەك مرۆڤانەتر و نە پاساوهەڵگرتر نییە. ئەوەشمان دەبێ لە بەرچاو بێ کە لێرەدا کەسی زاڵ و دەسەڵاتخواز، واتە نێرینە، بوارێکی بۆ رەخساوە کە بۆ ئەوانی دیکە دەست نادا. هەر بۆیەش بەلای ئەمەوە دامرکاندنەوەی هەرچەشنە دژبەرییەك، کارێکی ئاسانترە لە چاو ئەوان. لێرەدا هەر کام لە ژێردەستان لە بەر چاو یا بە واتایەکی دیکە، راستەوخۆ لە ژێردەستی ئەربابی خۆیدایە و پێوەندیی نێوان ئەو و ئاغاکەی زۆر نزیکترە لە پێوەندی نێوان ئاغا و خزمەتکارەکانی دیکە. ئەو (ئافرەت) ناتوانێ بە مەبەستی دژایەتیکردنی ئاغاکەی (پیاو)، لەگەڵ کەسێکی دیکەدا یەك بگرێ و لە هیچ جێیەك ناتوانێ بەرەنگاری بالادەستی و زاڵێتیی ئەو ببێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو حەز و پاڵنەری تێیدایە کە خۆشەویستی و دڵۆڤانیی ئاغاکەی ببزوێنی و خۆ لە ئازاردانی ببوێرێ. لە رەوتی خەبات لە پێناوی ئازادیدا هەموو کەس دەزانێ کە رێبەرەکانی لەوانەیە لە ئاکامی هەڕەشە یا تەماح وەبەرناندا دەست بۆ خەیانەت بەرن و دەست لە خەبات هەڵگرن، بەڵام لە بابەت ژنانەوە، هەر کام لە ئەندامانی چینی ژێردەست، بەردەوام لە بەردەم تەماح وەبەرنان و هەڕەشە دان. لە خەباتی سیاسیدا، ژمارەیەکی زۆر لە رێبەران، لەگەڵ بەشێکی یەکجار زۆری لایەنگران، دەبێ زۆربەی کەرەسە و دەرفەت و خۆشییە شەخسییەکانی خۆیان وەلانێن. بە درێژایی مێژوو، هەر کات سیستەمێکی زاڵم و چەوسێنەر لە گۆڕێدا بووە و خەریکی چەوساندنەوەی خەڵك بووە، سیستەمی دەسەڵاتدارێتی پیاوانیش بە سەر ژناندا هەر بووە. من هێشتاکە نەمسەلماندووە کە ئەو سیستەمە هەڵە و زاڵمانەیە،



بەڵام هەر کەسێك کە بتوانێ بیر لەو شتە بکاتەوە بۆی دەردەکەوێ کە ئەم سیستەمە" بێ جێ بێ یا بە جێ، لە دەسەڵاتدارێتییەکانی دیکە کۆنترە. لە کاتێکدا کە ئێستاش لە زۆربەی وڵاتاندا شێوازگەلێکی دەسەڵاتدارێتی پاساوهەڵنەگر لە ئارادان و ئەگەر لە برەویش کەوتبێتن زۆر لە مێژ نییە، ئەوە جێی سەرسووڕمانە کە ببینی ریشەدارترین دەسەڵاتدارێتییەکان، واتە دەسەڵاتی پیاو بە سەر ژندا، لە جێیەك گۆڕانی بە سەر داهاتبێ. هەروەها ئەوەش جێی سەرسووڕمانە کە ئەمڕۆکە، لە پانتاییەکی هەراوتردا دژی ئەم سیستەمە بەمجۆرە نارازییەتی دەردەبڕدرێ و قسەی لە دژ دەکرێ.

هێندێ کەس نارەزامەندی دەردەبڕن و پێیان وایە، پێك گرتنی دەسەڵاتدارێتیی پیاوان بە سەر ژناندا، لەگەڵ ئەو دەسەڵاتدارێتییە دزێوانەی کە هەتا ئێستا من ئاماژەم پێ کردوون، کارێکی دادپەروەرانە نییە، چونکە دەسەڵاتدارێتییەکانیتر دەسەڵاتدارێتیی ملهوڕانەن و بەرهەمی زۆرەملێ رەها و بێ سنوورن، کەچی ئەمەیان شتێکی سروشتییە. بەڵام ئایا هیچ چەشنە دەسەڵاتدارێتییەك هەبووە کە بە لای ئەو کەسانەوە وا بەرژەوەندییان تێیدایە، سروشتی و ئاسایی نەنوێنێ؟ سەردەمانێك دابەشکردنی مرۆڤ بە سەر دوو چینی ئاغا و کۆیلەدا، کە یەکەمینیان لە چەندایەتیدا کەم و دووهەمینیان ئێجگار زۆر بوون، تەنانەت بە لای زاناترین کەسانیشەوە، شتێکی سروشتی بوو، ئەویش سروشتی ترین دۆخی شیاو. گەورە بیرمەندێکی وەك ئەرەستو، کە رۆڵێکی ئەوتۆی لە پێشخستنی بیر و هزری مرۆڤدا هەبوو، کۆیلەداری دەپەرژێنێ و بێ ئەوەی هیچ گومانێکی لە راستبوونیدا هەبێ، ئەویش لە سەر بنەمای ئەو گریمانەیە پاساوی بۆ کۆیلەداری دەهێنایەوە کە ئۆتۆریتە و دەسەڵاتی پیاوان بە پێی ئەو بە سەر ژناندا سەپاوە، ئەو گریمانەیە بریتییە لەوەی: مرۆڤ بە پێی سروشتی خۆی بە سەر دوو چیندا دابەش دەبێ: سەربەست و کۆیلە. یۆنانییەکان هەر بە پێی سروشتی خۆیان ئازاد و سەربەست بوونە و خەڵکانی توران و ئاسیاش کۆیلە. بەڵام چ پێویست دەکا بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی ئەرەستو؟ ئایا کۆیلەدارانی وڵاتانی باشووری ئەمریکاش لە سەر ئەم باوەڕە نین؟ ئایا ئەم بیروباوەڕە ئاوێتەی دەمارگرژی و

لێکدانەوەی پێشوەخت نەبووە، ئاوێتەی دەمارگرژیی باوی نێو هەموو ئەوانەی کە بڕوایان بەو تیۆری و بۆچوونگەلە هەیە وا پاکانە بۆ حەز و ئارەزووەکانیان دەکەن و ڕەوایی بە قازانج و بەرژەوەندییەکانیان دەبەخشن؟ ئایا ئەوان زەمین و زەمان بە شایەت ناگرن کە دەسەڵاتی سپی پێستەکان بە سەر قولەڕەشەکاندا، شتێکی سروشتییە و نەژادی ڕەش بە پێی سروشتی خۆیان هەڵگری ئازادی نین و بەس بۆ کۆیلەیی خولقاون؟ هێندێك تەنانەت ئەوەندە چوونەتە پێش کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئازادیی کرێکاران شتێکی ناسروشتییە و لەگەڵ سیستەمی سروشت ناتەبایە و تیۆرداڕێژەرانی "پاشایەتیی ڕەها"ش بەردەوام ئیدیعای ئەوەیان کردووە کە ئەوە تەنیا شێوەی سروشتیی حکوومەتکردنە، لە بەر ئەوەی کە ئەوان پێیان وایە سەرچاوەی سیستەمی پاشایەتی دەگەڕێتەوە بۆ باوکسالاری و باوك فۆرمی سەرەتایی و خۆڕسکی کۆمەڵگەیە، کە پێوەندییەکانی نێوان باوك و کوڕانی پێکدەهێنا و لە کۆمەڵگە سەرتربووە و سروشتیترین جۆری ئۆتۆریتە و دەسەڵاتە. تەنانەت دەکرێ بڵێین یاسای زۆرەملێ، بەڕای ئەوانەی کەڵکیان لێ وەردەگرت، هەمیشە سروشتیترین شێوەی بەکارهێنانی دەسەڵات بووە. ڕەگەزە سەرکەوتووەکان لە سەر ئەو باوەڕە بوون، ئەوە یاسای سروشتە کە شکستخواردوان دەبێ گوێڕایەڵ و پێملی سەرکەوتوان بن، یا وەك خۆیان لێکیان دەداوە، نەژادی لاوازتر و شەڕنەزانتر دەبێ ملکەچی نەژادی بەهێزتر و چاونەترستر بێ. ئەگەر وردە ئاشنایەتییەکمان لەگەڵ ژیانی خەڵکی سەدەکانی نێوەڕاست هەبێ، دەزانین کە زاڵبوون و دەسەڵاتی ئەشراف و نەجیبزادەکان بە سەر خەڵکانی ژێردەستیاندا، بە لای خۆیانەوە شتێکی تەواو سروشتی بووە و بەلای کەسێکی چینی ژێردەستیشەوە، ئیدیعای یەکسانی و بەرامبەری لەگەڵ پیاوماقووڵان یا خۆ لەوان بە زیاتر زانین، شتێکی تەواو ناسروشتی بووە. بە واتایەکی دیکە، ژێردەستەبوونی ئەو چینەی وا کۆیلە بووە، بەلای تاکەکانی ئەم چینەشەوە زۆر ناسروشتی نەدەنواند. ڕەعیەت و کاسبکارانی ئازادکراو، سەرەڕای ئەوەی کە بە دژوارترین خەبات ئازادییەکانی خۆیان بە دەست هێنابوو، بەو حاڵەشەوە هیچ کات



نەیان دەویست بەشداری دەسەڵات بن، تەنیا شتێکی کە دەیانویست ئەوە بوو کە، کەمتر بچەوسێندرێنەوە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ناسروشتیبوون بە واتای ناباوبوونە و هەر شتێکی کە باو بێ سروشتی دەنوێنێ. چەوساندنەوەی ژنان بە دەستی پیاوان نەریتێکی جیهانییە و سروشتییە لادان لەو نەریتە ناسروشتی دەنوێنێ. ئەوەی کە هەست و بیروباوەڕ چەندە لە ژێر کاریگەریی نەریت و ڕێسا باوەکان دایە، دەکرێ لە ڕێگەی ئەزموونەوە بسەلمێندرێ. ئەو خەڵکەی لە وڵاتانی دوور لە ئێمەوە دەژین، کاتێك بۆ یەکەمجار لە مەڕ بریتانیاوە شت دەبیستن، بەرلە هەموو شتێك ئەوە سەرنجیان ڕادەکێشێ کە شاژنێك دەسەڵاتداری بریتانیایە، ئەوە بەلای ئەوانەوە ئەوەندە ناسروشتی دەنوێنێ کە ناتوانن باوەڕی پێ بکەن. لە حاڵێکدا ئەم شتە بە لای بریتانییەکانەوە هیچ شتێکی سەیر و ناسروشتی نییە، لە بەر ئەوەی کە خوویان پێوە گرتووە کەچی هەر ئەو خەڵکە بە لایانەوە ناسروشتییە کە ژنان لە ڕواڵەتی سەربازییدا دەرکەون، یا ئەوەی کە ببنە ئەندامی پەرلەمان. لە حاڵێکدا، لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی فیۆدالەکاندا دۆخەکە ڕاست پێچەوانە بوو: شەڕ و سیاسەت بۆ ژنان یاساخ و ناباو نەبوو، هەر بۆیەش ناسروشتیی نەدەنواند، لەو کاتدا سروشتی بوو کە ژنانی سەر بە چینەکانی بەرز کەسایەتییەکی پیاوانەیان هەبێ و بێجگە لە هێزی جەستەیی لە هیچ شتێکدا لە پیاوان کەمتر نەبن. ئەوەی کە ئوستوورە یۆنانییەکان لە سەر ژنە ئەفسانەییەکانی ئامازۆن دەیخەنە ڕوو (کە بە ڕای یۆنانییەکان نەك ئەفسانەیی، بەڵکو ڕاستەقینە بوون) نیشاندەری ئەوەیە کە بە لای یۆنانییەکانەوە سەربەخۆیی ژنان بە دەگمەن وەك شتێکی ناسروشتی چاوی لێ کراوە لە چاو خەڵکانی دیکەی چاخی کەونارا، ڕەوشی ژنە سپارتییەکانیش هەر سەلمێنەری ئەم ڕاستییەیە، هەڵبەت ئەو ژنانەش بە پێی یاسا بە ڕادەی ژنانی ناوچەکانی دیکەی یۆنان لە خوار پیاوانەوە بوون و بە کەمتر گیرا بوون، بەڵام بە کردەوە ئازادتر بوون و وەکو پیاوان پەروەردە دەکران و لە پرۆڤەی جەستەیی و ڕاهێناندا بەشدارییان دەکرد و هەر ئەوەش گەلێك بەڵگەی دەخستنە ڕوو سەبارەت بەوەی کە: ئەوە سروشت نەبوو کە وای

کردبێ ژن ئەم کارانەی لە دەست نەیە. لەم پێوەندییەدا دەکرێ کەمتر شك بۆ ئەوە بچێ کە ئەفلاتوون بەشی زۆری وانەکانی خۆی لە کۆمەڵگەی سپارتە وەرگرتبوون، ﴿وانەگەلێك﴾ کە یەکسانیی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ژن و پیاویشی لەخۆ دەگرت. بەڵام دەڵێن دەسەڵاتی زاڵی پیاو بە سەر ژناندا جیاوازیی هەیە لەگەڵ هەموو جۆرەکانی دیکەی زاڵێتی و دەسەڵاتکردن، لەبەر ئەوەی کە لە سەر بنەمای زۆرەملێ نییە و ژنان بە دڵخواز وەری دەگرن و قەبووڵی دەکەن، ژنان هیچ لێی نارازی نین و ڕەزامەندیش دەنوێنن. لە وەڵامی ئەم ڕەخنەیەدا، لە پێشدا دەبێ بڵێین کە گەلێك ژن هەن مل بۆ ئەم دەسەڵات و زاڵێتییەی پیاو ڕاناکێشن. لەو کاتەوە وا ژنان توانیویانە لە ڕێگەی نووسینەکانیانەوە هەست و بیر و باوەڕی خۆیان (کە تەنیا شێوەی دەربڕینێکە، کە کۆمەڵگە پێی دوان) بە خەڵك بگەیەنن، ژمارەیەکی زۆر لەوان نارەزایەتیی خۆیان بە نیسبەت ئەو ڕەوشە کۆمەڵایەتییەی بەسەریاندا، سەپاوە، دەربڕیوە. هەر لەم دواییانەدا هەزاران ژن بە ڕێبەرایەتیی کۆمەڵێك ژنی بە ناوبانگ و جێی متمانەی کۆمەڵگە، داوایان لە پارلمان کردووە کە مافی دەنگدانیان پێ بدرێ. ویستێکی دیکەی ژنان، کە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ پەرە دەگرێ و خەستتر دەبێتەوە و بێگومان دەروازەکانی سەرکەوتنیان بۆ دەخاتە سەر گازەرای پشت، ئەوەیە کە وەکو پیاوان ڕێگەی خوێندنیان پێ بدرێ، هەر لەو بوارانەدا کە پیاوان تێیدا دەخوێنن و ڕاست بەو شێوەیەش. هەر لەو حاڵەشدا، ساڵ بەساڵ زیاتر دەخوازن لەو بوارانەدا چالاکی بنوێنن کە هەتا ئێستا لێیان یاساغ و قەدەغە بووە. هەرچەند لەم وڵاتە، بەپێچەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە بۆنە و ڕێوڕەسمی جۆراوجۆردا بۆ پەرەپێدان و پڕۆپاگەندەکردن بۆ مافی ژنان، کۆڕ و سیمینار پێك نایەن و هیچ حیزبێك و ڕێکخراوێکیش ئەرکی داکۆکی کردن لە مافی ژنانی وەئەستۆ نەگرتووە، کەچی ژنان خۆیان ئەنجوومەن و کۆمەڵە گەلێکیان پێکهێناون کە مەبەست و ئامانجگەلێکی کەمتر و بەرتەسکتریان لە پشتە و ئەوەیش گەیشتنە بە مافی دەنگدان لە هەڵبژاردنەکاندا. ئەویش تەنیا لە بریتانیا و ئەمریکا نییە کە ژنان کەم و زۆر بە



کۆدەنگی، دەستیان کردبێ بە دەربڕینی نارەزایەتی دژی ئەو ڕەوشە ناڵەبارەی بەسەریاندا سەپاوە. لە فەڕەنسا و ئیتاڵیا و سوییس و رووسیاش ئەو شتە لە ئارادیە. کەسیش تێناگا، ژمارەی ئەو ژنانەی ئاوا بیر دەکەنەوە بەڵام بێ دەنگن چەندەیە، بەڵام بە پێی دەرکەوتە و بەڵگەکان دەکرێ لەوە تێبگەین کە بە ڕاستی ئەگەر توێژی ئافرەتیان ئاوا تۆخ ڕانەهێنابا و پەروەردە نەکردبا کە نکۆڵی لە تواناکانی تایبەت بە ڕەگەزی خۆیان بکەن، چەندەها ژن ئێستا هەڵگری ئەم ئایدیا و بۆچوونە دەبوون. با ئەم خاڵەشمان لە بەر چاو بێ کە هیچ چینێك لە دەسپێکی بزووتنەوەی خۆیدا خوازیاری ئازادیی تەواو نابێ.

ئەو کاتەی سیمون دیمونتفۆرت (Simonde Montfort سەردارێکی بریتانی ١٢٠٨ - ١٢٦٥) بۆ یەکەمجار داوای لە نوێنەرایەتی خەڵك کرد بێنە پەرلەمان، ئەرێ هیچکامیان بیریان لەوە دەکردەوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان خەڵکەکەیان دەنگ بە پەرلەمانێك دەدەن کە مافی ئەوەی دەبێ وەزارەتخانەکان هەڵوەشێنێتەوە و لە بواری کاروباری وڵاتدا فەرمان بە شا بدا؟ وەها ڕەوشێك تەنانەت بە بیری بەرزەفڕترین کەسیشیان نەدەهات. هەڵبەت لەو کاتدا، نەجیبزادەکان وەها ویستێکیان هەبوو، بەڵام جەماوەر بێجگە لەوەی کە لە دەست ماڵیات وەرگرتنی سەرەڕۆیانە و زوڵم و ستەمی نێردراونی شا ڕزگارییان بێ هیچ داخوازییەکی دیکەیان نەبوو. بە پێی یەکێك لە یاسا سروشتییە سیاسییەکان، ئەو خەڵکەی دیلی دەسەڵاتێکی کۆن و لە مێژینەن، لە سەرەتادا گلەیی و گازەندەیان لەکردەوەی زاڵمانەی ئەو سیستەمە هەیە، نەك لە خودی دەسەڵاتەکەی. زۆرن ئەو ژنانەی لە دەست هەڵسوکەوتی مێردەکانیان وەزاڵە هاتوون. خۆ ئەگەر گلەیی و هاوار و گازەندەکانیان نەبوایەتە هۆی خراپتربوونی هەڵسوکەوتی مێردەکانیان، بێگومان جار بە جار زیاتر دەبوون. ئەم مەسەلەیە کە نایەڵێ هەوڵ و تێکۆشانی ئەوانەی دەیانەوێ هەم ئۆتۆریتەی پیاوان بپارێزرێ و هەم کەڵکی خراپی لێ وەرنەگیرێ، سەربگرێ. ﴿دەبینین﴾ کاتێك دادگەیەك دەیسەلمێنێ کە ژنێك لێی دراوە دیسانیش دەینێرێتەوە هەر ئەو شوێنەی وا لە ژێر دەسەڵاتی پیاوێك

دایە کە ئەم تاوانەی کردووە، تەنیا ژنان و منداڵێنن کە تووشی وەها رەوشێك دێن. هەر بۆیەش ژنان، تەنانەت ئەگەر بکەونە ژێر سامناکترین ئازار و ئەشکەنجەی رۆحی و جەستەییش، هێشتا ناوێرن پەنا بەرنە بەر رێساگەلێك کە بۆ پشتیوانیکردن لەوان دانراون. تەنانەت ئەگەر ژنێك لەوپەڕی تووڕەیی و گرژیدا، یا بە دنەدرانی دراوسێ، پەنابەرێتە بەریاسا، یاسادانەر هەوڵدەدا تا ئەو جێیەی بۆی دەلوێ تاوانەکانی مێردەکەی کەمتر لە قاو بدا و لەو سزایەی کە شیاوێتی رزگاری بکا.

هۆکارە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەست دەدەنە دەستی یەك و سەرهەڵدان و نافەرمانیی گشتیی ژنان لە دژی پیاوان دەکەنە شتێکی دوور لە چاوەڕوانی. جیاوازیی رەوشی ژنان لە رەوشی چینەکانی خوارەوە (ژێردەستەکان) تا رادەیەکە کە خاوەنەکانیان شتێکی زیاتر لە خزمەتی بێ خەوش و پاکیان لێ دەخوازن. پیاوان هەر ئەوەندەیان لە ژنەکانیان ناوێ کە گوێرایەڵیان بن، بەڵکو خوازیاری سۆزداری و هەست و دلۆڤانیشیانن. پیاوان بە تێکڕا، بێجگە لە (دڕەندەترینیان) دەخوازن، ژنەکانیان، ئەوان بە نزیکترین کەسی خۆیان بزانن. پیاوان کۆیلەیەکیان دەوێ نەك بە زۆرەملێ بەڵکو بە ویست و رەزامەندیی خۆی ﴿کۆیلە- ژن﴾ ملی بۆ کوێلایەتییەکەی راکێشابێ. تەنیا کۆیلەیەکی رووتیشی ناوێ بەڵکو کۆیلەیەکی دڵخواز و خۆشەویستی گەرەکە. هەر بۆیەش هەرچی لە توانایان دایە دەیکەن بۆ ئەوەی زەین و مێشکی ژنان داگیر بکەن و بیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. ئەرباب و ئاغاکانی دیکە، لە ترس وەبەرنان و تۆقاندن بۆ گوێڕایەڵکردنی کۆیلەکانیان، کەڵك وەردەگرن، جا چ ترس لە خۆیان بێ یا لە سزا ئایینییەکان. بەڵام خاوەنەکانی ژنان شتێکی زیاتر لە گوێرایەڵییان، لێیان دەوی و بۆ وەدەست هێنانی ئەو شتەش کەڵك لە تەواوی ئیمکاناتەکانی پەروەردە و راهێنان وەردەگرن. ژنان بە تێکڕایی لە یەکەم ساڵەکانی تەمەنیانەوە بەو باوەڕەوە پەروەردە دەکرێن و ئەوەیان لە مێشکی دەئاخنن کە کەسایەتیی دڵخوازی ئەوان یەکسەر دژەدیوی کەسایەتیی پیاوانە. ئەوان نابێ بە ویست و ئیرادەی خۆیان کار بکەن بەڵکو دەبێ ملکەچی ویستی پیاوان بن. نەریت و



مۆراڵە باوەکان پێیان دەڵێ کە ئەرکی سەرشانی ژن ئەوەیە بۆ ئەوانی دیکە بژی و لە خۆبوردوو بێ و هەموو بوونی خۆی بکاتە دلۆڤانی و ئەو هەستەوەری و ئیحساساتەی ئێستا لە نێو ژناندا باوە، ئەو شتە پشتڕاست دەکاتەوە. ئەم دلۆڤانی نواندنەش دەبێ بۆ یەکێك بێ کە کەسانی دیکە بۆی دەستنیشان دەکەن کە بریتین لەو پیاوەی لەگەڵی لە پێوەندی دایە و ئەو منداڵانەی دەبنە هۆی پێوەندییەکی زیادی و دانەبڕاو لەنێوان ئەو و مێردەکەیدا. لە پێوەندیی نێوان ژن و پیاودا دەبێ سێ شتمان لە بەر چاو بێ: یەکەم ئەوەی کە یەکتر ویستنێکی سروشتی لەنێوان دوو رەگەزی (نێر و مێ) دا هەیە. دووهەم ئەوەی کە ژن بە تەواوی چاو لە دەستی پیاوە، بە جۆرێك کە هەر ئیمتیاز و دڵخۆشییەکی کە هەیەتی یا دیاریی مێردەکەیەتی یا بە پێی ویستی مێردەکەی پێی بڕاوە. سێهەم ئەوەی کە هەرچی ژن لە ژیانی تایبەتی خۆیدا گەرەکێتی و هەروەها تەواوی ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانی، تەنیا و تەنیا لەڕێگەی مێردەکەیەوە دەستەبەر دەبن. هەنووکە بە سەرنجدان بەم سێ شتە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەگەر دڵڕفێنیی ژنان بەلای پیاوانەوە نەبوایە بە ئەستێرەی رێپێشاندەریان، بێگومان پەرجوو (معجزە)یەك دەخوڵقا. پیاوانیش کە بۆ زاڵبوون بە سەر ژناندا وەها ئامرازێکی کاریگەریان بە دەستەوەیە، وارسکەی (غریزە) خۆپەرستییەکەیان وایان لێدەکا بە مەبەستی چەوساندنەوە و کۆیلەکردنی ژنان کەڵکی لێوەرگرن. بە جۆرێك کە وابنوێنن کە لە راستیدا جوانی و دڵڕفێنیی ژن لەوە دایە، گوێڕایەڵ و بێ دەنگ بێ و خاوەنی ئیرادەی خۆی نەبێ و جڵەوی خۆی دابێتە دەست پیاوەوە. نەژادی مرۆڤ توانیوێتی کۆت و بەندەکانی دیکە بپسێنێ و خۆیانی لێ رزگار بکا، بەڵام ئەگەر ئاغاکانی دیکە وەها ئامرازێکیان پێ بایە و بۆ پاراستنی قازانجی خۆیان ئاوا لەهەوڵدا بوایەن و توانیبایان رۆحی کۆیلەکانی خۆیان ملکەچ بکەن، بێگومان ئێستاشی لەگەڵ بێ مرۆڤ هەروا کۆیلە دەمایەوە. ئەگەر ئامانجی ژیانی هەر کەسێکی رەشۆکی ئەوە بوایە کە بکەوێتە بەر دڵی فلانە ئەشرافزادە، ئەگەر ئامانجی هەر گەنجێکی رەعیەت ئەوە بوایە کە دڵخوازی خاوەنەکەی بێ و ئەگەر هاونشینی و نزیکایەتیکردن و وەدەستهێنانی

دڵی ئاغا پاداشتێك بوایە بۆ ژێردەستەکان، ئەو کات هۆشیارترین و بەرزەفڕترین کەسەکان بە گیان تێدەکۆشان باشترین پاداشتەکان وەدەست بێنن. ئەو دەمەی وا ژێردەستەکان پاداشتیان وەردەگرتن ئەگەر لەنێو حەز و مەیلەکانیاندا تەنیا ئەو حەز و ئاواتانە وەدی هاتبان کە لەگەڵ ویست و حەزی خاوەنەکان تەبا بوایەن، چینی ژێردەست جگە لەو بەشە لە ئاوات وحەز و ئارەزووەکانی کە لەگەڵ ئی خاوەنەکەی یەکیاندەگرتەوە، دەستی لە هەموو خولیاو ئاواتی خۆی هەڵگرتبایە، ئایا ئەمڕۆکە، تەواوی پێوەندییەکانی نێوان رەعیەت ئاغا، خەڵکی ئاسایی و نەجیبزادەکان، چەشنی پێوەندیی نێوان ژن و پیاو نەدەبوو؟ ئایا هەموو خەڵك، جگە لە چەند بیرمەندێك لێرە و لەوێ، نەدەهاتنە سەر ئەو باوەڕە کە چاوگەی ئەم پێوەندییانە لە سروشتی مرۆڤ دایە و ئێجگار پێویستن و نەگۆڕن؟ ئەوەی ئاماژەمان پێ کرد دەریدەخا کە نەریت، تەنانەت ئەگەر گشتگیر و جیهانیش بێ، بەڵگە نییە بۆ راستبوون و گونجاوبوونی ئەو شتەی کە هەیە و لە ئارادایە و ناتوانین بەپێی ئەو شتە لایەنگری لە بارودۆخ و رەوشێك بکەین کە لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە ژنان دیل و کۆیلە دەکا. بەڵام دەکرێ لەوەش زیاتر بچینە پێش و بێینە سەر ئەو باوەڕە کە رەوتی مێژوو و ئینتیما هەنووکەییەکان لە کۆمەڵگەی پێشکەوتنخوزای مرۆییدا، نەك لایەنگریی لە سیستەمی نایەکسانیی مافی ژن و پیاو ناکا، بەڵکو بە توندی لەبەرانبەریدا هەڵوێست وەردەگرێ و لە رەوتی بەرەو پێشڤەچوونی مرۆڤدا، لە رابردووە تاکو ئێستا، هەروەها لەو رەوتە دا کە چاوەدێری ئینتما مودێڕنەکانە، دەردەکەوێ کە ئەم بەرماو و خشتوخاڵەی سەردەمی کۆن لەگەڵ داهاتووی مرۆڤایەتی ناتەبایە و دەبێ لە لاپەڕەی رۆژگار بسڕدرێتەوە. با ئێستا بزانین تاقانە تایبەتمەندیی جیهانی مودێڕنەن چییە؟ بە واتایەکی دیکە، چ شتێکە دەبێتە هۆی جیاوازی لەنێوان دامەزراوە کۆن و مودێڕنەکان و بیروبۆچوونە کۆمەڵایەتییە کۆن و مودێڕنەکان و بە گشتی لەنێوان ژیانی مودێڕن و کۆندا؟ جیاوازیی نێوان ژیانی مودێڕن و کۆن لەوە دایە کە ئێستا چی دیکە مرۆڤەکان بە پلە و پایە و پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆیانەوە لە دایك نابن و کۆمەڵە داوێکی پتەو



نایانبەستێتەوە بە شوێنێکەوە کە لێی لە دایك بوون، بەڵکو مرۆڤی ئەمڕۆ ئازادن بۆ ئەوەی تواناکانیان وەگەڕ بخەن و کەڵك لەو کەرەسە و ئامرازانە وەرگرن کە لە بەر دەستیانە و بە ئامانجی خۆیان بگەن. بەڵام کۆمەڵگەی رابردوو لە سەر بنەمایەکی تەواو جیاواز دامەزرابوو. هەموو خەڵك هەر لە یەکەم رۆژی لەدایکبوونیانەوە پێگەی کۆمەڵایەتییان دیار بوو، گەلێ جاریش یاسا ناچاری دەکردن هەر لەو پێگەیەدا بمێننەوە هەروەها بە پێی یاسا مافی ئەوەیان نەبوو کەڵك لە ئامرازگەلێك وەرگرن کە دەبێتە هۆی گۆڕانی پێگەی کۆمەڵایەتییان. هەروەکو چۆن هێندێ کەس بە رەشی لە دایك دەبن و هێندێك سپی، هێندێکیش بە کۆیلەیی لە دایك دەبن و هێندێکیش شاریڤان و ئازاد. هێندێ بەگزادە لە دایك دەبن و هێندێکیش رەشۆك، کەسانێك ئاغاوات دەهاتنە سەر دونیا و کەسانێکیش رەعیەت. کۆیلەیەك یا رەعیەتێك بەبێ ئیزنی خاوەنەکەی هیچ کات بۆی نەبوو ئازاد بێ. لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپاش، خەڵکی ئاسایی هەتا کۆتایی سەدەکانی نێوەڕاست نەیاندەتوانی بێنە ریزی ئەرستۆکراتەوە و کاتێك بەو مافانە گەیشتن کە دەسەڵاتی پادشاکان پەرەی گرتبوو. لە نێو ئەریستۆکراتەکانیش، میراتی باوك بە کوڕە گەورەکەی ماڵ دەبڕا. زۆری پێ چوو هەتا ئەو یاسایە جێی گرت کە باوك کوڕە گەورەکەی خۆی لە میرات بێبەش بکا. لە نێو چینە زەحمەتکێشەکاندا، تەنیا ئەوانەی لە نێو ئەندامانی توێژێکی (صنف) تایبەت دا لەدایك بوونە یا ئەندامانی ئەو توێژە بە ئەندام وەریان گرتووە، بە شێوەی یاسایی ئیزنی ئەوەیان هەبووە کاری تایبەت بەو توێژە وەئەستۆ بگرن و هیچ کەس نەیدەتوانی بە بێ ئیزنی یاسایی، کە ئەویش بە تێپەڕکردنی چەند قۆناخ دەردەچوو، کارێکی وا بگرێتە ئەستۆ کە بە گرینگ دەزانرا. کەم نەبوون ئەو بەرهەمهێنەرانەی کە بە هۆی ئەوەی کە بە شێوەی نوێ و پێشکەوتوانە هێندێ کاریان کردووە، لەپێش چاوی خەڵك سووکایەتییان پێکراوە و سزا دراون. بەڵام ئێستا لە ئەورووپای مودێڕندا، بەتایبەتی لەو بەشانەدا کە لە هەموو بوارێکەوە پێشکەوتنیان بە خۆوە بینیوە دۆخەکە تەواو جیاوازە. یاسا و دەسەڵات کاریان بەوە نییە کە چ کەسێك دەبێ فڵان

ئەرکی کۆمەڵایەتی یا پیشەیی وەئەستۆ بگرێ یا نابێ وەئەستۆ بگرێ و یا ئەوەی کە دەبێ چۆناوچۆن کاروباری خۆی راپەڕێنێ. ئەم جۆرە کارانە ئەسپێردراون بە هەڵبژاردنی ئازادانەی کەسەکانەوە. تەنانەت ئەو یاساگەلەی وا کرێکارێك ناچار دەکەن کە ماوەیەك وەکو بەردەست (شاگرد) کار بکا، لە وڵاتی ئێمەدا لابردراون. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەرکات پێویست بە فێربوونی کار هەبێ، هەر ئەم پێویستییە تاك ناچار دەکا فێری کار بێ. لەرابردوودا ئەو بیروڕایە باو بوو کە پێی وابوو، سنووری هەڵبژاردن بۆ تاك دەبێ لەو پەڕی بەرتەسکی دابێ و تا ئەو جێیەی دەلوێ، عەقڵ و ئاوەزێکی باڵاتر پێی بڵێ چ بکا و چ نەکا، ئەگینا بەهەڵەدا دەچێ. بەڵام لە چاخی مودێڕندا باوەڕی باو، کە بەرهەمی ئەزموونی هەزاران ساڵەیە، پێمان دەڵێ ئەو کاروبارەی راستەوخۆ پێوەندییان بە هۆگری تاکەوە هەیە، ئەگەر بە پێی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆی دیاری نەکرێن هیچ کات بە جوانی راناپەڕێندرێن و هەر چەشنە هەوڵێکیش بۆ رێکوپێککردنی ئەم کارانە بە دەستی کەسانی "خاوەن سەلاحییەت" بێگومان خەساری لێدەکەوێتەوە. مەگەر ئەوەی کە ئەم راپەڕاندنە بە مەبەستی پشتیوانی لە مافی ئەوانی دیکە بێ. ئەم بۆچوونە لە پرۆسەیەکی هێمن و شێنەییدا بیچمی گرتووە و تەنیا کاتێکیش لە هێندێ بواردا ئەو بۆچوونە پەسەند کرا کە کارکردن بە بۆچوونە کۆنەکە ئاکامێکی کارەساتباری لێکەوتبۆوە، بەڵام هەنووکە تیۆری مودێڕن (لە بەشی پیشەسازیدا) لە پێشکەوتووترین وڵاتەکاندا برەوی گرتووە و دەکرێ بڵێین پەسەندی هەموو ئەو کۆمەڵگەیانەیە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان بانگەشەی پێشکەوتن دەکەن. تیۆریی مودێرن پێی وانییە هەموو مێتۆدەکان وەکو یەك بە کەڵکن، یا هەموان تواناییەکی وەك یەکیان بۆ راپەڕاندنی کارێك هەیە. بەڵکو پێی وایە کە ئەگەر تاکەکان ئازادیی هەڵبژاردنیان هەبێ، باشترین شێواز و مێتۆدەکان دەگرنەبەر و هەر کارەی بە دەستی شیاوترین کەس رادەپەرێ. کەس ناڵێ کە دەبێ یاسایەك پەسەند بکرێ کە تەنیا پیاوانی بەشان و باهۆ بتوانن ببنە ئاسنگەر و ئازادیی هەڵبژاردن و رکاربەری، خۆبەخۆ دەبێتەهۆی ئەوەی کە پیاوانی بەهێز ئەم کارە



وەئەستۆ بگرن و لاواز و کەم هێزەکانیش کارێك بگرنە ئەستۆ کە لەگەڵ توانای جەستەییان یەك بگرێتەوە. بە پێی ئەو بۆچوونە دەردەکەوێ کە ئەگەر لە پێشدا بمانەوێ لە سەر بنەمای هێندێ گریمانەی گشتی دەستنیشانی بکەین کە هێندێ کەس بۆ فلانە کار شیاون و هێندێ کەس لە دەستیان نایە، کارێکی پووچ و خۆڕاییمان کردووە. ئێستا هەموان تێگەیشتوون و کۆکن لە سەر ئەوەی کە، ئەگەرچی لەوانەیە گریمانەیەك بڕێکیش راست بێ، بەو حاڵەشەوە هیچ گریمانەیەك بێ هەڵە نابێ. تەنانەت ئەگەر گریمانەیەك لە زۆربەی بوارەکانیشدا راست دەربچێ، کە ئەوەش دەگمەنە، دیسانیش هێندێ شتی ریزپەر و ناوازە هەن کە ئەم گریمانەگەلە نایانگرنەوە و ئەگەر ئیزن نەدەین ئەم کەسانە بۆ قازانجی خۆیان و کەسانی دیکە کەڵك لە تواناکانیان وەرگرن، هەم ناهەقیمان لە کۆمەڵگە کردووە هەم لەم کەسانە. لە لایەکی دیکەوە، لەو بوارانەدا کە تاك بەڕاستی شیاو نییە بۆ کارێك، پاڵنەر ئاساییەکانی مرۆڤ بەسن بۆ ئەوەی نەیەڵن لەم بوارەدا هەوڵ بدا یا پێداگر بێ لە سەری.

ئەگەر ئەم پرەنسیپە گشتییەی زانستە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان راست نەبێ و ئەگەر خەڵك بە راوێژ کردن لەگەڵ ناسیارەکانیان نەتوانن تواناکانی خۆیان لە یاسا و دەسەڵات باشتر دەستنیشان بکەن، زۆری پی ناچێ جیهان لەو بنەمایانە پاشگەز دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر هەمان سیستەم و دۆخی جاران. بەڵام ئەگەر ئەوە راست بێ، دەبێ جۆرێك هەڵسوکەوت بکەین کە نیشان بدەین باوەڕمان پێیەتی، کەواتە نابێ ئەوەمان قەبووڵ بێ کە، کچ بوون و رەش بوون و رەشۆکی بوون، پێگە و پلە و پایەی کەسەکان لە تەوای ژیانیان دا دیاری دەکەن، بە واتایەکی دیکە، نابێ قبووڵ بکەین کەئەم هۆکارانە خەڵك لە پێگەی باڵێ‌ی کۆمەڵایەتییان بێبەری بکەن و کارە گرینگەکان تەنیا بۆ تاقمێکی دیاریکراو بن نەك بۆ هەموو کەس. تەنانەت ئەگەر ئەم باوەڕە زێدەرۆیانەیەمان قەبوولبێ کە ئێستا هەموو کەس خاوەنی ئەو پلە و پایە و پێگەیەن کە بە هەموو شێوەیەك شیاوی ئەوەن، دیسانیش هەر بە پێی ئەو شتەی باسمان کرد، مەرج و لەمپەرە

یاساییەکان بۆ ئەندامەتی لەپەرلەماندا بە زیانی خەڵك و کۆمەڵگە دەشکێتەوە. تەنانەت ئەگەر لە ماوەی دوازدە ساڵاندا، ئەم مەرج و لەمپەرانە، تەنیا یەك کەسی شیاو و لێهاتوو لێ بخەن، دەبێتە هۆی خەسارێکی قەرەبووهەڵنەگر، بەڵام ئەگەر هەزاران کەسی نەشیاو کەمتوانا وەلابنرێن، قازانجێکی لێ ناکەوێتەوە. چونکە ئەگەر پرۆگرامی هەڵبژاردنەکانیش ژمارەیەك لە کەسانی کەمتوانا پەراوێز بخەن، هێشتا کەسانی کەمتواناى دیکە زۆرن. لە راستیدا، لەتەواوی کاروبارە گرینگ و دژوارەکاندا، ژمارەی ئەوانەی کە کاریان لە دەست دێ کەمترن لەوەی کە پێویستە، تەنانەت ئەگەر ئاستەنگێکیش لە بەردەم خەڵکدا بۆ هەڵبژاردنیان نەبێ. کەواتە بەرتەسککردنەوەی سنووری هەڵبژاردن دەبێتە هۆی بێبەشبوونی کۆمەڵگە لە کەسانی کارامە، بەبێ ئەوەی کە رێگەی لە کەسانی بێ کەڵك گرتبێ.

ئێستا (سەردەمی نووسەر- وەرگێڕ)، لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، یاسا و دامەزراوەکان تەنیا لە دوو شتدا، ئەویش بە هۆی تایبەتمەندییە زگماکییەکان جیاوازی لە نێوان مرۆڤەکاندا دەنێن، یەکەمیان پێوەندی بە ژنانەوە هەیە، کە بە هۆی ژن بوونیان، لە تەواوی ژیانیاندا بێبەش دەکرێن لەوەی کە بێنە گۆڕەپانی هێندێ لە هەڤرکییەکانەوە، دووهەمیشان پێوەندی بە پاشایەتییەوە هەیە. ئێستاش کە ئێستایە پاشایەتی میراتە. هیچ کەسێکی دیکە ئەگەر لە بنەماڵەی پاشا نەبێ ناتوانێ بەو پلە و پایەیە بگا و هیچ کەس، تەنانەت ئەگەر لە بنەماڵەی پاشاش بێ، لە رێگەی میراتەوە نەبێ ناتوانێ پاڵ وەتەختی پاشایەتی بدا، بەڵام پلەباڵاکانی دیکە و پوانە کۆمەڵایەتییەکان، لەبەر دەستی هەر هەموو ئەندامانی رەگەزی نێرینەدا هەن و لە راستیشدا زۆریان بەس لە رێگەی ماڵ و سامانەوە وەدەست دێن و هەموو کەسیش دەتوانێ ببێتە خاوەنی ماڵ و سامان، هەروەکو زۆربەی دەوڵەمەند و ساماندارەکان، کوڕی چینە هەژار و دەستکورتەکان بوونە. بەو پێیە، ئەگەرچی زۆربەی خەڵك مەگەر بە رێکەوت ئەگینا بۆیان ناڵوێ بە پلە و پایە بگەن، بەڵام هیچ پیاوێك نییە کە یاسا رێگەی گەیشتن بە پلە و پایەی لێ بگرێ. نە یاسا و نە بیروڕای گشتی، هیچ کامیان



لەمپەری دەستکرد ناخەنە سەر لەمپەرە سروشتییەکان. بەڵام پلەی پاشایەتی، هەروەکو پێشتریش گوتمان، جوێ کراوەتەوە. بەڵام هەموو کەس هەست بە ناوازەبوونی ئەم شتە دەکا و تێدەگا کە ئەم رەوشە لە جیهانی مودێڕندا شتێکی نائاسایی و نەگونجاوە و دژایەتیەیە لەگەڵ نەریت و بنەماکانی ئەم جیهانەدا و تەنیا بە قازانج پەرستیی دوور لە رێساکان، دەکرێ پاساو بدرێ. خۆ ئەگەرچی بیری بەرژەوەندیخوازییش لە روانگەی خەڵکی نەتەوە جۆراوجۆرەکانەوە پلە و بەهای جیاوازی هەیە، بەڵام بوونیان وەکو واقیعێك نکۆڵیی لێ ناکرێ. لەم بابەتە ناوازەیەدا، کە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی هەیە، لە بەر هێندێ هۆکاری بنەڕەتی لە بری ئەوەی کە پێداگری لە سەر کێبەرکێ و هەڤرکی بکرێ، جەخت لە سەر رەچەڵەك و بنە و بنەچك کراوەتەوە. بەڵام هەموو گەلانی ئازاد و سەربەست هەوڵیانداوە لەم بابەتەوە، بە شێوەی جەوهەری ئەو پرنسیپە رەچاو بکەن کە بە رواڵەت لێی دابەزیون، چونکو گەلێ ئاستەنگیان بۆ ئەم پلەیە داناوە، ئاستەنگگەلێك کە دروستکراون بۆ ئەوەی دەسەڵات کردن لە پادشا وەرگرنەوە لە حاڵێکدا ئەو کەسەی بە کردەوە فەرمانڕەوایی دەکا واتە وەزیری بەرپرس و وڵامدەر، ئەم پلەوپایەی خۆی لە گۆڕەپانی کێبرکێدا وەدەست هێناوە و هیچ کام لە شاریڤانانی نێرینە و باڵق، بە بڕیاری یاسا لەم گۆڕەپانە دەرناکرێن. کەواتە، ئەو بێبەشکردنانەی کە تەنیا لەبەر ژن بوونیان، بە سەر ژندا سەپاون تەنیا چەند وێنەیەکی هەڵاوردنی یاسایین لە سیستەمێکی حقوقیی مودێڕندا. بێجگە لەوە بۆ هیچ شتێکی دیکە، کەسێك تەنیا لە بەر خاتری هەبوونی تایبەتمەندییە سروشتییەکانی خۆی لە نیعمەت و پێدراوە کۆمەڵایەتییەکان بێبەش ناکەن. هەروەکو دەشزانین نیوەی نەژادی مرۆڤ مێوینەن و ئەوەش راستییەکە لە هیچ هەلومەرجێکدا نەدەگۆڕدرێ و نەدەکرێ پشتگوێ بخرێ. تەنانەت ئەو ئاستەنگانەش کە ئایین بە سەر تاکەکانی دا دەسەپێنێ، (لەوە گەرێین هەنووکە ئەو بێبەشییانە لە بریتانیا و بە گشتی لە ئەوروپا، بە دەگمەن ماون) ئەوەندە بڕناکەن کە بە هۆی گۆڕینی ئایین، تاکەکان لەم یا لەو کار بێبەش بکەن.

کەواتە، ملکەچکردنی و چەوساندنەوەی ژنان لە بواری کۆمەڵایەتییەوە، لەنێوان تەواوی دامەزراوە کۆمەڵایەتییە مودێڕنەکاندا، واقیعێکی دانسقەیە و دابەزین و پاشەکشەیەکی ئاشکرایە لە یاسا بنەماییەکانی ئەم دامەزراوانە. ئاسەوارێکە لە شێوە و چۆنێتی بیرکردنەوە و کردەوەی جیهانی کەونارا، کە لە هەموو بارێکەوە سواو و بێ بایەخ بووە لە شتێکدا نەبێ، کە ئەویش لە ئاستی جیهانیدا گرینگی هەیە. وەك بڵێی خانووە بەردینەیەکی سەر بە چاخی کەونارایە یا پەرستگەیەکی گەورەی ژوپیتێرە و جێی کلێسەی سێن پۆلی گرتۆتەوەو هەموو رۆژێ خەڵك تێیدا رازونیازێ دەکەن و ژمارەیەك کلێسەی دیکەش بە دەورەیەوەن، بەڵام خەڵك تەنیا ئەو کاتانەی بە رۆژوون یا لە کاتی جێژناندا روو لەوان دەکەن . ئەگەر چاوەدێرێکی بە ویژدان و تێگەیشتووی خاوەن مەیلو بۆچوونی مرۆڤ دۆستانە، بڕوانێتە لێکدژیی روون و ئاشکرای نێوان واقیعە کۆمەڵایەتییەکان و واقیعەکانی سەردەم، هەروەها لێکدژیی قووڵی نێوان ئەم واقیعانە لەگەڵ بزووتنەوەیەکی پێشکەوتنخواز کە لە شانازییەکانی جیهانی مودێڕنەیە و هەموو دیاردە پێك ناکۆك و لێکدژەکانی راماڵیوە و سڕیونێتەوە، بێ گومان ئەو چاوەدێرە وەکو بابەتێکی گرینگ بۆ تێفکرین و لێوردبوونەوە لێیان دەڕوانێ. ئەم لێکدژییە لە یەکەم قۆناخدا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لایەنی دزێو و خراپی جیهانی مودێڕن لە بەر دیدی چاودێرەکە ببێتە شتێکی گرینگ و دامەزراوە و نەریتە دڵخوازەکانیشی لە بەر چاو سووك بن. بەڵام کەمترین کاریگەریی ئەم لێکدژی و ناتەباییە ئەوە دەبێ کە چاودێر وەکو بابەتێکی هەمەلایەن و گشتگیر لە بەر چاوی دەگرێ و لە ئاستی ناتەبایی نێوان ویستی پاشایەتی و کۆماریخوازیدا هەڵی دەسەنگێنێ. کەمترین داخوازیی ئێمە دەبێ ئەوە بێ کە پێیان وانەبێ ئەم مەسەلەیە بە پێی راستییەکان و بیروڕای باو، شتێکی بە کۆتایی و بە ئاکام گەیشتووە. دەبێ دەرگەی وتووێژ لە سەر ئەم بابەتە هەر لە سەر پشت بێ و مەسەلەکە بە دادپەروەری و بەرژەوەندییەوە گرێ بدەنەوە. بڕیاریان لە سەر ئەم بابەتەش هەر وەك بڕیاریان لە سەر هەر شتێکی دیکەی کە پێوەندیدارە بە رەوشی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە، بە



مەرجێك هەموو لایەنەکانی بە وردی لێکدرابێتەوە دەتوانێ دەسکەوتی مەزنی بە دواوە بێ بۆ هەموو مرۆڤایەتی نەك بۆ ئەم یا ئەو رەگەز. باس و لێدوانیش لەم بارەوە دەبێ شتێکی جیددی بێت و پەنجە لە سەر بنەما و چاوگەکان دابنێ و خۆ لە قسەی ناروون کۆوێژی نەدرێ. بۆ وێنە، ئەوەی دەگوترێ ئەم سیستەمەی ئێستا باشترین سیستەمی سەردەمە، باسێکی گشتی و بێ ئاکامە. لە شوێنێ کە تەنیا رەوشێك ئەزموون کراوە و هیچ رەوشێکی دیکە دەرفەتی دەرکەوتن و سەرهەڵدانی نەبووە، چۆن دەکرێ بە پێی ئەزموون باس لەو دوو رەوشە بکەین؟ ئەگەر بڵێین بۆچوونی وەك یەکیی رەگەز تەنیا پشتی بە یەك تیۆرییەوە بەستووە، لەوەڵامدا دەڵێین دوکتۆرین و بۆچوونی دژەکەشی هەر وایە. تەنیا شتێکی بە پێی ئەزموون سەلمێنراوە ئەوەیە کە مرۆڤ لە وەها سیستەمێکدا توانیوێتی بژی و بەو ئاستە لە پێشکەوتن و بەختەوەری بگا کە بە چاو دەیبینین. بەڵام بەو حاڵەشەوە ئەگەر سیستەمێکی جیاواز لەوە هەبوایە ئایا پێشکەوتنەکانی مرۆڤ زیاتر دەبوون یا دادەبەزین، لێرەدا ئەزموون هیچ وەڵامێکی پێ نییە بیداتەوە. لەلایتریشەوە، ئەزموون پێمان دەڵێ کە هەرکاتێ مرۆڤ لە پێناو پێشکەوتندا هەنگاوێکی هەڵهێناوە، ئەم هەنگاوە لەگەڵ پێشکەوتنی پێگەی کۆمەڵایەتی ژناندا هاوتەریب بووە. هەر بۆیەش مێژوونووسان و فەیلەسووفەکان رایان وایە کە رەوشی کۆمەڵایەتیی ژنان باشترین تاقیکاری و قایمترین پێودانگە بۆ هەڵسەنگاندنی رادە و ئاستی شارستانییەتی هەر کۆمەڵگە و هەر چاخێك. لەو سەردەمانەی وا مرۆڤ لە پێشکەوتن و هەڵچوندابووە، رەوشی ژنان بەرەو باشی چووە و نزیك بۆتەوە لە یەکسانی لەگەڵ پیاوان. دیارە ئەوەش بە تەنیا خۆی، نیشاندەری ئەوە نییە کە پێشکەوتنی بەردەوام، بێ هیچ شتێ دەبێتە هۆی یەکسانیی تەواو لەنێوان ژن و پیاو، بەڵام هیچ گومانێك لە راستیی ئەو گریمانەیە دا نییە کە پێوەندیی راستەوخۆ هەیە لەنێوان پێشکەوتن و باشبوونی رەوشی ژناندا. ئەو بۆچوونەش کە ئەوە سروشتی دوو رەگەز (ژن و پیاو)ە کە لەگەڵ ئەرك و پێگەی ئێستایان رێکیان دەخا و ئەم ئەرك و پێگەیەیان بۆ دەکاتە شتێکی شیاو و گونجاو، بۆچوونێکی بێ هودە و بێ سەمەرە.

من به پێی عەقڵی بێ خەوش و جەوهەری زەینی مرۆڤ ناتوانم ئەوە قەبووڵبکەم کە یەکێك بتوانێ لە سروشتی ئەو دووانە تێبگا یا ئەوەی کە سروشتی ئەم دووانە رێگەی ناسینی هەبێ. سروشتی ئەو دووانە تا ئەو جێیەی پێوەندی هەنووکەییان پێکەوە هەیە، لە ناسین نایە. ئەگەر پیاوان لە کۆمەڵگەیەکی بێ ژن و ژنان لە کۆمەڵگەیەکی بێ پیاو دا ژیابایەن، یا ئەوەی کە ئەگەر کۆمەڵگەیەك پێك هاتبایە تێیدا ژن لە ژێردەستی پیاودا نەبوایەن، ئەو کات دەمانتوانی باس لەو جیاوازییە ئەخلاقییانە بکەین کە لەوانەیە لە سروشتیانەوە سەرچاوە دەگرن. ئەوەی کە لە راستیدا پێی دەڵێن سروشتی ژنانە، شتێکی تەواو دەستکردە، چونکە لە هێندێ لایەنەوە بەرهەمی سەرکوت و داپڵۆسین و لە هێندێ لایەنیشەوە بەرهەمی هاندان و دڵدانەوەیە. پێویستە ئێمە بە راشکاوی بەبێ هیچ نیگەرانییەك باس لەوە بکەین کە هیچ کام لە چینەکانی خوارووی کۆمەڵگە بە هۆی ئەو پێوەندییە تایبەتەی لەگەڵ ئاغاکەیان هەیانبووە، گۆڕان بە سەر سروشت و تایبەتمەندییە سروشتییەکانیاندا نەهاتووە. چونکە کۆیلەکان ئەگەرچی لە زۆر بوارەوە سەرکوتی زیاتریان لە سەر بوو، بەڵام ئەوەی لە ناخیان دابوو، واتە ئەو بەشەی کۆت و زنجیر نەیدەگەیشتێ هەر وەکو خۆی دەماوە و لەکەمترین و یەکەمین دەرفەتی رەخساودا بەپێی یاسای تایبەت بە خۆی گەشەی دەکردەوە. بەڵام ژنان هەر وەکو گوڵی نێو گوڵخانەیەك پەروەردە دەکرێن و بەردەوام بەشێك لە توانا دەروونییەکانیان بە فیدای ئاغاکانیان (پیاو) دەبێ. گیایەك بێننە بەر چاوتان کە، لایەکی لەگوڵخانە و لە هەلومەرجێکی زۆر گونجاو دایە و بە باشی پێی رادەگەن و بە باشترین شێوە هەڵدەدا، لایەکی دیکەشی لە زستانێکی تۆف و بەند و سەرمادا بە ئانقەست لە سەهۆڵ گیراوە و دەرفەتی گەشە و هەڵدانی نییە و لایەکیشی بە ئاگرێکەوە بێ و ببێتە خەڵوز، رەوشی ژنان لە وەها گیایەك دەچێ. پیاوانیش بەبێ ئەوەی بزانن کە ئەوان وەها دۆخ و رەوشێکیان پێکهێناوە و ئەو تێگەیشتنەش دەگەڕێتەوە بۆ مێشکی دوور لە راڤە و لێکدانەوەیان، پێیان وایە شێوەی ئاسایی و



سروشتیی گەشە و هەڵدانی ئەو گیایە هەر ئەوەیە کە دەیبینن و ئەگەر نیوەی لە گوڵخانە و نیوەکەتری لە بەفردا نەبێ دەژاکێ.

لە نێو تەواوی ئەو گرفت و لەمپەرانەی رێگرن لە بەردەم پێشکەوتنی بیروهزری مرۆڤ و نایەڵن بیرورا مەنتقییەکان لەمەڕ ژیان و دۆخی کۆمەڵایەتییەوە جێ بگرن، خراپتر و ترسناکتر بەهەموویان، گرینگی پێ نەدان و ناتێگەیشتوویی لە رادە بەدەری مرۆڤە بە نیسبەت ئەو هۆکارانەی کاریگەرییان لە سەر کەسایەتیی مرۆڤ هەیە. پێیان وایە مەیل و توانای سروشتیی مرۆڤ هەر ئەوەیە کە هەیە و ئەم بۆچوونە هیچ کەموکورتی ناهێنی و ناگۆڕدرێ، تەنانەت ئەگەر تێگەیشتنیش لەو هەلومەرجەی مرۆڤەکانی تێدا گەورە بوونە بە روونی ئەوەیان بۆ بسەلمێنێ کە ئەوانە بۆچی بەمجۆرەن. زۆر کەس پێیان وایە ئێرلەندییەکان بە شێوەی سروشتی تەمبەڵن، چونکە بۆ وێنە: دیتوویانە وەرزێرێکی ئێرلەندی وەبن قەرز کەوتووە بەڵام هیچ خۆی ماندوو ناکا. کەسانێکیش هەن کە پێیان وایە فەڕەنسییەکان شیاوی ئەوە نین ئازادییان هەبێ، بە تاوانی ئەوەی کە زۆر جاران دژی دەسەڵاتدارانێك (کە بۆ بەڕێوەبردنی یاسا هەڵبژێردراون بەڵام یاساکەیان پێشێل کردووە) راپەڕیون. یا ئەوەی کە زۆر کەس پێیان وایە تورکەکان سروشتێکی راستگۆیانەتریان هەیە، چونکە ئەوان بەس یۆنانییەکانیان تاڵان کردووە، بەڵام یۆنانییەکان کڵاویان لە سەر ئەوان ناوە. هەر بەو شێوەیەش، زۆرن ئەوانەی دەڵێن بە هۆی ئەوەی کە ژنان جیا لە چەند کەسایەتییەکی ناسراو، سیاسەتیان بە لاوە گرینگ نییە، کەواتە بە پێی سروشتی خۆیان لە پیاوان کەمتر دڵیان بۆ بەرژەوەندیی گشتی لێدەدا. بەڵام مێژوو، کە لە چاو رابردوو ئێستا قووڵتر لێی تێدەگەین، وانەیەکی دیکەمان فێردەکا و ئەویش ئەوەی کە سروشتی مرۆڤ بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەکەوێتە ژێر کارتێکەریی هۆکارە دەرەکییەکان و تەنانەت ئەو بەشە لە تایبەتمەنییەکانی مرۆڤ کە لە هەموان زیاتر گشتییەتیان هەیە و یەکپارچە دیارن، بەتوندی لەبەردەم گۆڕانی قووڵ دان بەڵام خەڵك لە خوێندنەوەی مێژوو زیاتر ئەو شتانە بەدیدەکەن کە پێشتر لە زەینیاندا بووە، هەروەکو لە

سەفەریشدا وایە و ئەو تاقمەی شتی زۆر لە مێژوو وەردەگرن، ئەو کەسانەن کە بە خەرمانێك گریمانە و لێکدانەوەی پێشوەختەوە مێژوو ناخوێننەوە. هەروەکو دیتمان دژوارترین پرسیاری ئێمە ئەوەیە جیاوازییە سروشستییەکانی نێوان ژن و پیاو کامانەن؟ لە بارودۆخی ئێستای کۆمەڵگەدا وەدەستهێنانی زانیارییەکی ورد و هەمەلایەن لە سەر ئەم بابەتە ئەستەمە و کردەنی نییە. لە حاڵێکدا هەموان لێبڕاوانە لە سەر ئەم بابەتە دەدوێن، بەڵام یا ئەو مێتۆدە بە هێند وەرناگرن کە تاکە رێگەی گەیشتن بە زانیارییە لەمەڕ ئەو مەسەلەیەوە یا ئەوەی کە یەکسەر وەلای دەنێن. تاوتوێکردنی چۆنێتی کاریگەریی ژینگە و هەلومەرجەکان لە سەر مرۆڤ و ناسینی یاسا و رێساکانی ئەم کاریگەرییە، پێویستی بە خوێندنەوەیەکی شیکارانەیە و گرینگترین بەشی دەروونناسی لەوە پێکدێ. لە بەر ئەوەی جیاوازیی ئەخلاقی و زەینییەکانی نێوان ژن و پیاو هەر چەندەش گەورە و نەگۆڕ بنوێنن، بەس بە هۆکارگەلێکی نیگەتیڤ دەکرێ بڕیار لە سەر سروشتی بوونیان بدرێ و ئێمە دەتوانین تەنیا ئەو جیاوازییانە بە شتێکی سروشتی بزانین کە دەستکردبوونیان شتێکی مەحاڵە و کردەنیی نییە. بە واتایەکی دیکە، ئەگەر تەواوی تایبەتمەندییەکانی هەر کام لەو دوو رەگەزە (کە دەکرێ بە پێی پەروەردە و راهێنان و هەلومەرجە دەرەکییەکان روون بکرێنەوە) لابەرین. ئەو جیاوازییانەی کە دەمێننەوە، لەوانەیە سروشتی بن و تەنیا کەسێك دەتوانێ بڵێ کە تەنانەت جیاوازییەك کە لەنێوان ژن و پیاودا وەکو بوونەوەرێکی ئەخلاقی و ئاوەزمەند، هەیە (بەبێ لە بەر چاو گرتنی جەوهەرەی ئەو جیاوازییە) کە خاوەنی قوولترین زانستی پێوەندیدار بە یاساکانی فۆرمگرتنی کەسایەتی بێ، لەوێوەکە هەتا ئێستا هیچ کەس وەها زانستێکی وەدەست نەهێناوە (چونکە، جیا لە مرۆڤ، بوونەوەرێك نادۆزینەوە کە بە پێی بایەخ و گرینگی خۆی ئەوەندە بە کەمی موتالای لە سەر کرابێ)، هیچ کەس بۆی نییە لەم بارەیەوە لێبڕاوانە بدوێ. لە بارودۆخی ئێستادا (سەردەمی نووسەر-وەرگێڕ) هەرچی بڵێین لە گریمانە و گومان بەو لاوە نییە، و راستی و دروستیی گریمانە و گومانەکانیش بەوەوە گرێدراون کە چەندە زانستین،



زانستێك کە ئێمە لە سەر دەروونناسی و بەکارهاتنی لە ناسینی پرۆسەی بیچمگرتنی کەسایەتیدا دەستەبەرمان کردووە.

زانیاری و تێگەیشتنی ئێمە سەبارەت بەو مەسەلە سەرەتاییە کە هەر لە ئێستادا جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو چین، زۆر رووکەشی و سەقەتن، چ بگا بەوەی بزانین ئەم جیاوازییانە چۆن دروستبوونە. پزیشکان و دەروونزانان تا رادەیەك بە دڵنیاییەوە دەزانن جیاوازییە جەستەییەکانی نێوان ژن و پیاو چین و ئەو راستییەش بێگومان بۆ دەروونزانان شتێکی گرینگە بەڵام زۆر دەگمەنن ئەو پزیشکانەی دەروونزانیشن. بیروبۆچوونی پزیشکانیش سەبارەت بە تایبەتمەندییە زەینییەکانی ژنان هیچ لە بیروبۆچوونی خەڵکی ئاسایی گرینگتر نییە. ئەوە شتێکە کە هیچ کات هیچی لێ تێناگەین، مەگەر ئەوەی کە ژنان بۆ خۆیان، واتە تەنیا ئەوانەی بە باشی ئەو تایبەتمەندییانە بناسن، دەست بکەن بە توێژینەوە لەم بوارەدا، ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین ژنان هەتا ئێستا زۆر بە کەمی لەم بارەیەوە دواون. ئەو بڕە لێدوانانەشیان زیاتر بۆ پێخۆشبوونی خەڵك بووە و لە راستگۆیی بە دووربوونە. ئەو جۆرە لێدوان و ئەو قسەکردنانە نیشانەی نەزانی و ناتێگەیشتوویین و دۆزینەوەی ژنانی نەزانیش هیچ شتێکی ئەستەم نییە. لە هەموو جیهان نەزانی تا رادەیەکی زۆر یەکسانە. دەکرێ بە دڵنیاییەوە بیروڕا و هەستی کەسێکی نەزان لە رووی بیروباوەر و هەستی ئەوکەسانەوە دەستنیشان بکەین کە بەدەورییەوەن بەڵام تێگەیشتن لەو هەست و باوەڕانەی لە سروشت و توانا تاکەکەسییەکانەوە سەرچاوە دەگرن شتێکی سووك و سانا نییە. زۆر بە کەمی و دەگمەن لێرە و لەوێ پیاوگەلێك هەن کە تەنانەت کەسایەتیی ژنانی بنەماڵەکەی خۆیانیان بڕێك بە جوانی ناسیبێ. مەبەستی من ناسینی تواناکانیان نییە، چونکە هیچ کەس لەم بوارەدا هیچ نازانێ و تەنانەت ژنان خۆشیان تواناکانی خۆیان ناناسن، لە بەر ئەوەی هیچ کات دەرفەتی پشکووتنیان نەبووە. مەبەستی من ناسینی بیروڕاو هەستەکانیانە کە بەڕاستی هەیانە. زۆرن ئەو پیاوانەی پێیان وایە ژنان بە تەواوی دەناسن، چونکە لەگەڵ چەند دانەیەکیان و لەوانەیە لەگەڵ چەندین ژن،

پێوەندیی عاشقانەیان هەبووە. ئەگەر وەها کەسێك، کەسێکی وردبین بێ و ئەزموونەکانی ئەم بوارەشی لە رووی چۆنایەتی و چەندایەتییەوە جێی سەرنج بن، لەوانەیە هێندێ شتی بچووك بەڵام گرینگ لە سەر سروشتی ژنان فێر بووبێ. بەڵام ئەگەر ئەم رەهەندەی کەسایەتیی ژنان بە شێوەی گشتی بگرینە بەر چاو، ئەوانەی هیچ شتێك لەم بارەوە نازانن زۆر کەمترن لەوانەی خۆیان بە زانا دەزانن، لە بەر ئەوەی کە ئەم لایەنانە لە چاوی کەمتر کەسێك شاراوەیە. گونجاوترین کەسێك کە پیاو دەتوانێ بۆ ناسینی ژنان لێی ورد بێتەوە، هاوسەرەکەیەتی. لە بەر ئەوەی دەرفەتی موتاڵای لە سەر ئەو ئێجگار زیاترە و لایەنی هاوڕایی و هاودڵیی تەواویش شتێکی زۆر دەگمەن نییە و بەڕای من، تەواوی زانیاریی جێی پەسەندی ئێمە لە سەر ژنان لەم ژێدەر و سەرچاوەیەوە وەرگیراون. بەڵام بە وەها خوێندنەوەیەك، زۆربەی پیاوان تەنیا دەتوانن لایەنێك شەنوکەو بکەن و لەم رووەوە دەکرێ بە سەرنجدان بە بیروبۆچوونەکانی پیاوێك لەمەڕ هاوەسەرەکەی تا رادەیەکی زۆر لە تایبەتمەندییەکانی هاوسەرەکەی تێبگەین و وەها خوێندنەوەیەك، تەنانەت لە ئاستی خوێندنەوەی بابەتێکی دیاریکراویشدا ئاکامێکی لێناکەوێتەوە، مەگەر ئەوەی کە ژن خاوەن کەسایەتییەکی شیاوی خوێندنەوە بێ و پیاویش دوو تایبەتمەندیی گرینگی هەبێ: سەرەتا ئەوەی کە داوەرێکی بە توانا و چاوکراوە بێ، دووهەم ئەوەی کە کەسایەتییەکی دڵسۆز و دڵۆڤانی هەبێ و هەروەها ئەوەندە لەگەڵ هاوسەرەکەی تێکەڵاویی و سازگاریی هەبێ کە بتوانێ زەینی بخوێنێتەوە وکەسایەتییەکەی جۆرێك بێ کە هاوسەرەکەی لە دەربڕینی ویست و مەبەستەکانی خۆی لە لای مێردەکەی شەرم نەکا. من رام وایە کە وەدیهاتنی وەها هەلومەرجێك زۆ ئەستەمە و تەنانەت مومکین نییە. زۆر جار دێتە پێش کە ژن و پیاو لە هەموو کاروباری بابەتیانەدا، هەستی وەك یەك و هۆگری و حەزی هاوبەشیان هەیە، بەڵام زۆر ئەستەمە یەکیان بتوانێ بچێتە نێو جیهانی دەروونی ئەوی دیکەوە، وەك بڵێی ئەم دووانە بە حاڵ یەکتر دەناسن. تەنانەت ئەگەر خۆشەویستییەکی راستەقینەش لەنێوان ژن و پیاودا هەبێ، دیسانیش دەسەڵات و



ئۆتۆریتەی یەکیان و ملکەچکردنی ئەوی دیکەیان دەبێتە هۆی ئەوەی کە متمانەی تەواویان بە یەکتر نەبێ. لەوانەیە بە ئانقەست هیچ شتێك لە یەکتر نەشارنەوە، بەڵام «هێشتا» هێندێ شت بە نهێنی دەمێنێتەوە.

دیاردەیەکی لەم چەشنە لەنێوان دایکان و باوکان و منداڵەکانیشیاندا بەدیدەکرێ و هەموانیش دیتوویانە. گەلێك زۆرن ئەو باوك و کوڕانەی کە بە راستی یەکتریان خۆش دەوێ، بەڵام باوك ئاگاداری هیندێ لەولایەنانەی کەسایەتیی منداڵەکەی نییە کە ئاواڵەکانی وەك رۆژی روون لێی ئاگادارن. راستییەکەی ئەوەیە کە ئەگەر ئێمە ببینە چاودێری کەسێك، ئەستەمە بتوانین پێوەندییەکی تەواو راستگۆیانە و رووناان لەگەڵی هەبێ. وەها کەسێك لە بەر ئەوەی کە دەترسێ نەکا لە بەر چاوی پشتیوان و هاوڕێکەی بکەوێ، تەنانەت ئەگەر کەسایەتییەکی پتەویشی هەبێ دیسانیش هەر لە خۆوە هەوڵدەدا باشترین رەهەندی هەبوونی خۆی یا ئەو لایەنەی کە پێی وایە بەدڵی پشتیوانەکەیەتی «مێرد»، بۆی دەخاتە روو، هەر بۆیەش بە دڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن یەکتر جوان بناسن کە سەرەڕای پێوەندییەکی دۆستانە لە نێوانیاندا هیچ کام بە سەر ئەوی دیکە دا زاڵ نەبن و پێوەندییەکی یەکسانیان لەنێوان دابێ. ئێستا سەرنج بدەنە پێوەندیی نێوان ژن و مێرد، ژن نەك هەر لە ژێر دەسەڵاتی پیاو دایە، بەڵکو وافێرکراوە کە بە ئەرکی خۆی دەزانێ، ئەو شتانە دەستنیشان بکا مێردەکەی حەزی لێی نییە و ئیتر ئیزن نەدا کارێکی وابکا مێردەکەی پێی ناخۆش بێ. هەمووی ئەو شتانە دەبنە هۆی ئەوەی کە زانیاری و ناسینی پیاو لە سەر ئەو تاقە ژنەی کە دەرفەتی خوێندنەوەی لە سەر کەسایەتییەکەی هەیە زانیارییەکی دروست و تەواو نەبێ. جا ئەگەر ئێستا ئەم خاڵەش لە بەر چاو بگرین کە ناسینی ژنێك بە مانای ناسینی ژنانی دیکە نییە، تەنانەت ئەگەر پیاوێك چەندین ژنی سەر بە توێژێك و وڵاتێکیش بناسێ ناکرێ ناسین و زانیارییەکانی خۆی بەسەر ژنانی چین و توێژەکانیتر و وڵاتانی دیکەشدا بگشتێنی و تەنانەت ئەگەر بتوانێ ئەوەش بکا، دیسانیش بەس ژنانی قۆناخێکی مێژوویی ناسیوە، «لێرەوە» دەتوانین بەو دەرئەنجامە

بگەین کە زانیاری و ناسینی پیاوان لە سەر ژنان تەنانەت لەو بیاڤەشدا کە ژنانی تێدا بوون و هەن نەك لە بیاڤی پان و بەرینتر لەوەدا کە دەتوانن ببن، تێگەیشتنێکی زۆر سەقەت و رووکەشیانەیە و هەرواش دەبێ، مەگەر ئەوەی کە ژنان خۆیان ئەو شتانە بڵێن کە پێویستن و دەبێ بیڵێن. هێشتا کاتی وەها شتێك نەگەیشتووە و ئەو رۆژە نایە مەگەر وردە وردە و بە تێپەڕینی کات «وەها رۆژێك بگاتێ». ئەوە تازە هێندە لە مێژ نییە کۆمەڵگە ئیزنی بەژنان داوە و «ژنان» خۆیشیان زانیاریی پێویستیان وەدەستهێناوە بۆ ئەوەی بیروڕاکانیان بە جەماوەری خەڵك رابگەیەنن. بەڵام ئێستاش دەگمەنن ئەو ژنانەی کە دەوێرن قسەی وا بکەن کە لە دڵی پیاوان گران دێ و پێیان ناخۆش دەبێ، ئەو پیاوانەی سەرکەوتنی ژنان لە پانتایی ئەدەبیات و نووسەریدا بە دەسەڵاتی ئەوانەوە بەستراوەتەوە. با ئەوەش بێنینەوە یاد، کە هەتا ئەم دواییانەش، ئەگەر نووسەرێکی پیاویش قسە و بۆچوونەکانی ناباو بوایەن یا هەست و ئیحساس و باوەڕەکانی سەیر و سەمەرە دیار بوایەن، چۆن رووبەڕووی دەبوونەوە، هەڵبەت رووبەڕوو بوونەوە و هەڵسوکەوتی لەو چەشنە ئێستاش لە نێو نەچووە. ئێستا دەتوانین تەنانەت ئەگەر بە سەقەتی و کەمڕەنگیش بێ ئەو کۆسپ و لەمپەرانە بێنینە پێش چاومان و وێنایان بکەین کە ناهێڵن ژنان ئەو شتانە دەربڕن کە لە ناخی دڵیان دایە، ئەو ژنانەی کە هەر لە منداڵییەوە فێر کراون کە بەردەوام نەریتەکان و بیروڕای گشتی بکەنە پێشەنگ و رێبەری بێ ئەملاوئەولای خۆیان. یەکێك لەو ژنانەی کە نووسینەکانی لە پانتایی ئەدەبیاتی وڵاتەکەیدا پلە و پێگەیەکی بەرزی پێ بەخشیوە، وای بە پێویست زانی کە بوێرانەترین بەرهەمی خۆی بەم دروشمە دەست پێ بکا: پیاو دەتوانێ بەربینگ تەحەددای بیروباوەڕە گشتییەکان بگرێ، ژن دەبێ پەیڕەوییان لێ بکا (ملکەچیان بێ). بەشی هەرە زۆری ئەو شتەی ژنان لە سەر ژنان دەینووسن لە ماستاوچێتی و جامەلۆسکێ بۆ پیاوان بەو لاوە شتێکیتر نییە. ئافرەتە رەبەنەکان بە جۆرێك دەنووسن وەك بڵێی تەنیا بە مەبەستی دۆزینەوەی مێردێکی باش شت دەنووسن. زۆربەی ژنانی رەبەنو بە مێرد لە کۆیلە سفەتیدا ئەوەندە زێدەرۆیی دەکەن



کە مەگەر دواکەوتووترین پیاوی زەوی، دەنا هیچ پیاوێك ئەو شتەی ناوێ و پێی خۆش نییە. بەڵام ئەم دۆخە کە هەتا ئەم دواییانەش باو بوو، ئێستا لە گۆڕان دایە. ژنانی نووسەر وردە وردە ئازادانەتر قسە دەکەن و رۆژ بە رۆژ زیاتر حەزیان لێیە هەست و باوەڕە راستەقینەکانیان دەربڕن. بە داخەوە ژنان، بە تایبەتی لە وڵاتی ئێمە دا «بریتانیای سەردەمی نووسەر-وەرگێڕ»، ئەوەندە لە بەرهەمگەلێکی دەستکرد دەچن کە هەڵسوکەوت و ژینگەیەکیان فۆرمی بەشی هەرەزۆری هەست و باوەڕەکانیان دیاریدەکا و چاوکراوەیی و تێگەیشتنیان لە ئاستێکی نزم دایە. بە تێپەڕینی کات ئەم رەوشە لە کەمیی دەدا بەڵام بە گشتی لە نێو ناچێ. مەگەر ئەوەیکە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ ژنانیش ئەو ئازادییە دەستەبەر بکەن کە بۆ گەشەکردنی رەسەنایەتی و داهێنانی پیاوانیان دەستەبەر کردوە. تەنیا ئەو دەمەی وەها شتێك وەدی بێ، نەك هەر بە بیستن، بەڵکو بە چاو، لەو شتانەدا بەدیدەکەین کە پێویستن لە مەڕ ژنانەوە بیانزانین. هەروەها لەوەش تێدەگەین کە شتەکانی دیکەش چۆن لەگەڵ سروشتی ژن سازگار بوونە.

ئەمن زۆر درەنگ باسی ئەو گرفتانەم کردووە کە ئێستا بوونەتە لەمپەری بەردەم ناسینی سروشتی راستەقینەی ژنان. هۆیەکەشی ئەوەیە، ئەم مەسەلەیە وەك زۆربەی مەسەلەکانی دیکە، لە روانگەی بیروڕای شەخسی و دوا هۆکارەکانەوە لێکدراوەتەوە و مەوداو مەجاڵی هزر و بیری لۆژیکی لەم بارەیەوە زۆر کەم بووە، لە حاڵێکدا زۆر کەس بە هەڵە پێیان وایە لە بابەتێك دا کە زۆربەی پیاوان رێی تێنابەن، پسپۆڕییان هەیە، ئەوەش بابەتێکە کە لە ئێستادا هیچ پیاوێك و بە گشتی هەموو پیاوانی جیهان زانیارییەکی ئەوتۆیان لە سەری نییە کە مافی ئەوەیان هەبێ یاسایەکی وای بۆ دارێژن کە تێیدا بڵێن ژنان دەبێ چی بکەن و چی نەکەن. بەختەوەرانە بۆ دەسنیشانکردنی وەها ئامانجگەلێك کە بە کردەوە پێوەندیی بە پێگە و پلەی ژن لەکۆمەڵگەدا هەیە، پێویست بە هەبوونی وەها زانست و زانیارییەك ناکا. لە بەر ئەوەی کە تەواوی ئەو پرەنسیپانەی کۆمەڵگەی مودێڕنیان لە سەر راوەستاوە، پێمان

دەڵێن کە ئەم پرسە پێوەندی بە خودی ژنانەوە هەیە و ئەوە ئەوانن کە دەبێ بە پێی توانا و ئەزموونەکانی خۆیان، بڕیار بدەن کە چی بکەن و چی نەکەن. بۆ ئەوەی بزانین کەسێك یا کۆمەڵە خەڵکێك چییان لە دەست دێ، جیا لە تاقیکردنەوە ڕێگەیەکی دیکە شك نابەین و جگە لە خۆیشیان کەس ناتوانێ بڵێ کە چ کارێك بەختەوەریان دەکا و دەبێ واز لە چ کارێك بێنن. بە دڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین کە ئەگەر ڕاپەڕاندنی کارێك بە ڕاستی لەگەڵ سروشتی ژنان ناکۆك بێ، هەر ئەوەندە بەسە کە سروشتیان بتوانێ بە ئازادای بجووڵێتەوەو شەنوکەوی بکا. بەوجۆرە هیچ کات روو لە وەها کارێك ناکا. ئەو نیگەرانییەی مرۆڤ بۆ ئەوەی نەکا سروشت ئەرکی خۆی بۆ نەچێتە سەر، هەروەها هەوڵی مرۆڤ بۆ وەئەستۆگرتنی ڕۆڵی سروشت تەواو بێ سوودە. ئەگەر ژنان بە پێی سروشتی خۆیان کارێکیان لە دەست نەیەت، ئەوا بۆ خۆیان خۆی لێ نادەن و پێویست ناکا هان بدرێن بۆ بەرێوەبردن یان گێڕانەوەیان لە نەکردنی وەها کارێك. ئەگەر ژنان کارێکیان لە دەست بێ و لە خۆیان راببینن بیکەن، بەڵام نەتوانن شان بدەن لە شانی پیاوان و کێبڕکێیان لەگەڵ بکەن، بە شێوەی ئۆتۆماتیکی وەلا دەنرێن، لە بەر ئەوەیکە هیچ کەس نایەوێ لە خۆڕا پاداشتو دەستخۆشانەی پشتیوانیلێکردنیان پێ بدا، بەڵام دەبێ خۆ ببوێرن لەوەی کە خەڵات و مووچەی پشتیوانیکردن بە پیاوانیش بدرێ. ئەگەر ژنان لە بەڕێوەبردنی هێندێ کاردا توانایان لە بەڕێوەبردنی کارێکی دیکە زیاترە، پێویست ناکا بە پێی یاسا و ڕێسای کۆمەڵایەتی ناچاریان بکەن کە ئەو کارانە بەڕێوەبەرن کە لە ڕاپەڕاندنیاندا بە تواناترن و لەوانی دیکە خۆ ببوێرن. هەڤرکێ بەهێزترین پاڵنەریانە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیان. بەو پێیە، دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە ژنان ئەو کارانەیان پێ دەسپێردرێ کە لەگەڵ سروشتیان باشتر یەکدەگرنەوە. ئەسپاردنی ئەم کارانە بە ژنان دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە تواناکانی هەردووك ڕەگەزەکە کەڵکی باشتر وەربگیردرێ و بە گشتی بەرهەمی باشتری لێوەردەگیردرێ. زۆربەی پیاوان لە ڕواڵەتدا لە سەر ئەم باوەڕەن کە خزمەت بە مێرد منداڵ، کاری سروشتیی ژنانە. بۆیەش دەڵێم ((بە ڕواڵەت))، چونکە ئەگەر بە



پێی کردەوە هەڵی سەنگێنین، واتە بە پێی ئەو شتەی ئێستا لە کۆمەڵگەدا هەیە، لەوانەیە بە ئاکامێکی پێچەوانەی ئەو شتە بگەین کە بیری لێدەکەینەوە. زۆر جاریش لەوانەیە پێمان وابێ کە پیاوان لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەرکی سروشتیی ژنان تەواوی ئەو کاروبارانەن کە ئەوان بە پێی سروشتی خۆیان لە ناخەوە لێی بێزارن و ئەگەر ژنان لە هەڵبژاردنی کاردا ئازاد بن، واتە بکەونە دۆخێکی ئەوتۆ، کە بتوانن بژیوی خۆیان لە ڕێگەیەکی دیکەوە دابینبکەن و کات و توانای خۆیان بۆ ڕێگەیەك تەرخانبکەن کە پێیان باشترە، کەمن ئەو ژنانەی مل کەچ بکەن بۆ ئەو بارودۆخەی کە ئێستا ئیدیعا دەکرێ بۆ ئەوان سروشتییە. ئەگەر تەواوی پیاوەکان لە سەر وەها باوەڕێکن، ڕاشکاوانە دەربڕین جوانە. دەربڕینی بە ئاشکرای ئەم دۆکتورینە، کە بە ئاماژە لە گەلێك دەقدا هاتوونە گۆڕێ و خراونەتە روو، بەم جۆرەیە: "کۆمەڵگە پێویستیی بەوەیە کە ژنان شوو بکەن و منداڵیان بێ و ئەوانیش ئەوە ناکەن مەگەر ناچار بن، کەواتە دەبێ ناچار بکرێن". من خۆم زۆر حەزم لێیە کە یەکێك ببینم ڕاشکاوانە بەرگری لەم بۆچوونە بکا، چونکە تەنیا بەم جۆرەیە کە خاڵە بەهێز و لاوازەکانی دەردەکەون. کۆیلەدارانی کارۆلینای باشووری و لوئیزیاناش هەر ئەم بانگەشەیە دەکەن. ئەوان دەڵێن: "کۆمەڵگە پێویستی بەشەکر و پەمۆیە. سپی پێستەکان ئەو شتانەیان پێ بەرهەم نایە و ڕەش پێستەکانیش بەو مووچە (کرێ)یەی ئێمە دەمانەوێ پێیان بدەین ئامادە نین کار بکەن، کەواتە دەبێ ناچاریان بکەین". نموونەی بەرهەستتر خزمەتی زورەملێ سەربازییە. هەبوونی مەلەوان بۆ بەرگری لە وڵات پێویستە. زۆر جار دێتە پێش کە ئەوان ئامادە نین بە ویستی خۆیان خزمەت بکەن. هەر بۆیەش دەبێ ناچار بکرێن. زۆر زۆریش ئەم بەڵگەهێنانەوەیان بە کار هێناوە و سەرەڕای ئەو کەموکوڕییەی تێیدایە، تا ئێستا بە سەرکەوتوویی تەواو کاری پێکراوە! هەڵبەت وەها بەڵگەهێنانەوە وەڵامی سادە و دەمکوتکەری هەیە. مووچە و حەق دەست بدەن بە مەلەوانەکان لە هەمبەر ئەو کارەی کە دەیکەن. ئەگەر وابکەن، ئەوانیش خزمەتتان بۆ دەکەن. هەروەکە خزمەت بە خاوەن کارەکانی دیکە دەکەن. ئێوەش پتر لە خاوەن

کارەکانی دیکە، گرفتتان نابێ. هیچ وەڵامێکی بە جێ و لۆژیکی بۆ ئەم پێشنیارە لە گۆڕێ نییە، مەگەر ئەوەی بڵێن:"ئێمە نامانەوێ کاری وا بکەین" جا چونکە ئێستا خەڵك نەك حەزیان لە پاشقولدانی هەقدەستی کرێکاران نییە، بەڵکو پێیان شەرمە شتی وابکەن، خزمەتی سەربازیش لایەنگری نەماوە. ئەوانەش کە دەیانەوێ هەموو دەرگەکان لە سەر ژنان داخەن بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن لە هەر هەلومەرجێکدا مل بۆ شووکردن کەچ بکەن لەگەڵ وەلامی گورچووبڕ رووبەڕوو دەبنەوە. ئەگەر ئەوان بیانەوێ بە راشکاوی مەبەستی خۆیان دەربڕن، سروشتییە دەبێ بڵێن کە پیاوان بۆیە هەلومەرجی هاوسەرگیری بۆ ژنان ناکەنە شتێکی دڵخواز، بۆ ئەوەی ژنان نەك لە بەر قازانجەکانی هاوسەرگیری، بەڵکو تەنیا لە بەر خودی کارەکە، قەبووڵی بکەن. بەڵام ئەگەر تاك تووشی هەڵبژاردنێکی داسەپاو بکەین (ناچاری بکەین هەڵبژێرێ)، ئیتر ناتوانین بڵێین گرینگی و باشییەکانی ئەو هەڵبژاردنە سەرنجی راکێشاوە. بە رای من، هەر ئەوە نیشانەیەکە، کە هەست و باوەڕەکانی ئەو پیاوانەمان بۆ دەردەخا کە بە توندی دژی یەکسانیی مافی ژن و پیاون. بە رای من، ئەوان لەوە ناترسن کە ژنان لە شووکردن بتەکێنەوە و مەیلیان بۆی نەمێنێ، چونکە من پێم وایە هیچ کەس بە راستی وەها ترسێکی نییە، ئەوان بە راستی لەوە دەترسن کە نەکا ژنان بۆ هاوسەرگیری خوازیاری یەکسانی لەگەڵ پیاوان بن و نەکا ژنانی لێوەشاوە و سەر زیندوو کە دەزانن هاوسەرگیری ملکەچیان دەکا و ئەگەر شوو بکەن لە هەموو پێدراوەکانی ژیان بێبەش دەبن، خۆ لە شووکردن ببوێرن و روو بکەنە کارێکی وا کە بە رای ئەوان سووکایەتیی تێدا نییە. ئەگەر بە راستی ملکەچبوونی ژنان بەرهەمی بێ ئەملا و ئەولای هاوسەرگیری بێ، بەڕای من ترس و نیگەرانیی پیاوان بنەمایەکی تەواو لۆژیکیی دەبێ. لەوەها هەلومەرجیکدا، زۆر و پێدەچێ، لە نێو ئەو ژنانەدا ئەوانەی کە دەتوانن جگە لە رێگەی هاوسەرگیرییەوە، ژیانێکی ئابڕوومەندانە دەستەبەر بکەن، زۆر کەمیان مل بۆ هاوسەرگیری رادەکێشن، مەگەر ئەوەیکە بکەوێتە دۆخێکەوە کە جگە لە مێردکردن هەموو شتێکی دیکە بەلایەوە ناماقووڵ



بنوێنێ. هەتا ئەو کاتەی پیاوان سوورن لە سەر ئەوەی کە یاسای هاوسەرگیری یاسایەکی زۆرەملێ و سەپێنەر بێ، ناچارن هەلومەرجێك بۆ ژنان بڕەخسێنن کە جیا لە هەڵبژاردنێکی ناچاری و داسەپاو چارەیەکی دیکە و رێگەیەکی دیکە شك نەبەن. بەلام ئەگەر وەها میتۆدێك رەچاو بکرێ، ئەوە دەگەیەنێ کە تەواوی ئەو شتانەی لە جیهانی مودێڕندا بۆ پساندنی کۆت و زنجیرەکانی ژنان کراون، لە هەڵەیەك بەولاوە شتێك نەبووە. ژنان نەدەبوایە ئیزنیان پێ بدرێ رێگەی خوێندن و فێربوونی زانست و ئەدەبیان پێ بدرێ. ئەو ژنانەی دەخوێنن و لەوانیش خراپتر ئەوانەی کە دەنووسن، لەگەڵ دۆخی هەنووکەیی ناتەبان و هۆی نیگەرانین و دەبێ ژنان وەها پەروەردە بکرێن و بار بهێنرێن کە تەنیا فێری ئەو شتانە بن کە لە قەرەواش یا خزمەتکارێکی نێومالّ، چاوەڕوان دەکرێ.

## بەشی دووهەم

جێی خۆیەتی باسێکی تێروتەسەل، لەسەر ملکەچکردنی ژنان بە بابەتێك دەست پێ بکەین کە رەوتی باسەکە، هەرلەخۆیەوە ئێمەی بەرەو ئەو بابەتە هێناوە: هەلومەرجێك کە یاساکانی ولاّتی بریتانیا و ولاّتانی دیکە بۆ گرێبەستی هاوسەرگیریی رەچاویان کردوون. زەماوەندکردن چارەنووسێکە کە کۆمەڵگە بۆ ژنانی دیاری کردووە و ئامانجێکە کە ژنان بۆ وەدەستهێنانی پەروەردە دەکرێن و مەبەستێکە، کە مەزەنە دەکرێ هەموو ژنێك بە دوایدا وێڵ بێ، مەگەر ئەو ژنانەی (کە دەگمەنن) لە بەر ناشیرینی، هیچ پیاوێك نایانخوازێ. بەمجۆرە لەوانەیە یەکێك پێی وابێ کە هەموو شتێك وا رێکخراوە کە زەماوەندکردن بەلای ژنانەوە تا رادەیەکی زۆر شتێکی دڵخواز و شیرین بێ، و هۆکارێك لە گۆڕێ دانەبێ کە ژنان لە خەمی ئەوەدا بن کە جیا لە شوو کردن هیچ ریگەیەك شك نابەن. بەڵام کۆمەڵگە لەم بارەشەوە وەك هەموو شتەکانی دیکە، وای بە باش زانیوە کەنەك لە رێگەیەکی دادپەروەرانەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی قێزەوەن و ناشیرین ئەم ئامانجە دەستەبەر کا، بەڵام زەماوەند کردن و شتەکانی دیکە لەوەدا لێك جیاوازن کە لە هاوسەرگیری کردندا شێوازە قێزەوەن و ناشیاوەکان تا رادەیەك هەر لە سەر جێی خۆیانن. پێشتر، ژنان بە زۆرەملێ دەستیان بە سەردا دەگیرا، یا باوکیان دەیفرۆشتن. لە مێژووی ئەوروپادا، بۆ ماوەیەکی زۆر، باوك دەیتوانی بە ویست و دڵی خۆی و بەبێ لە بەر چاوگرتنی دڵی کچەکەی، بە مێردی بدا. هەڵبەت کڵێسە بە دەرکردنی ئەو بڕیارەی کە: رێوڕەسمی هاوسەرگیری کردن بەبێ رەزامەندیی ژن بەتاڵە و بایەخی نابێ، دەری خستبوو کە لایەنگری مۆراڵگەلێکی مەزنترە، بەڵام چۆن دەکرێ بزانین ئەم رەزامەندییە بە زۆری وەرنەگیراوە؟ ئەگەر باوك پێداگریی کردبایە، کچ نەیدەتوانی قسەی باوکی بشکێنێ. مەگەر ئەوەی



کە دەهاتە سەر ئەوەی بچێتە ریزی راهیبەکانەوە و تا مردن لە سەومعە دا بژی. ئەگەر توانیبای وەها کارێك بکا ئەوا ئایین پشتی دەگرت و لەوانەبوو بتوانێ قسەی باوکی بشکێنێ. لە چاخی کەونارا (بەر لە هاتنی مەسیحییەت)، ژیان و مەرگی ژن بە دەستی مێردەکەی بوو. ژن بۆی نەبوو لە دژی مێردەکەی هانا بەرێتە بەر یاسا، تاقانە یاسا و دادگای ژن، مێردەکەی بوو. پیاو دەیتوانی ژنەکەی بەرەڵڵا بکا، بەڵام ژن وەها مافێکی نەبوو. لە یاسا کۆنەکانی بریتانیادا، مێرد بە سەرۆکی ژن لە قەڵەم دەدرا. پیاو لە واتای پڕ بە پێستی خۆیدا فەرمانڕەوای ژنەکەی بوو، هەتا ئەوەیکە کوژرانی مێرد بە دەستی ژنەکەی بە خەیانەت دەژمێردرا (و ئەوەش خەیانەتی بچووك بوو، کە جیاواز بوو لە خەیانەتی مەزن). سزاکەشی لە خەیانەتی مەزن بێ بەزەییانەتر بوو. چونکە وەها ژنێك مەحکووم بوو بەوەی کە لە ئاوردا بسووتێ. هەڵبەت ئێستا کە بە کردەوە ئەم چەشنە کارەساتانە نەماون (ئەگەرچی هەڵوەشاندنەوەی زۆربەیان بە فەرمی رانەگەیەندراون و ئەگەریش راگەیەندرابێن زۆر دوای ئەوە بوو کە ئیتر بەڕێوە نەدەچوون). بەو شێوەیە پیاوان پێیان وایە ئەوەی ئێستا لە گرێبەستی زەماوەندکردندا رەچاو دەکرێ ئەو شتەیە کە دەبێ ببێ و زۆریش دەبینین کە دەڵێن ژیار و مەسیحییەت مافی رەوایان داوە بە ژن. لە حاڵێکدا هێشتا ژن کۆیلەی مێردەکەیەتی و هەتا ئەو جێیەی پێوەندیی بە دەروەست بوونی یاسایی ئەوەوە هەیە، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ کۆیلان نییە. ئەو لەکڵێسەدا سوێند دەخوا کە هەتا مردن پێ ملی مێردەکەی بێ و لە هەموو کارێکدا -جگە لە ئەنجامدانی جەنایەتدا- یارمەتیدەری بێ. ژن بە بێ ئیزنی مێردەکەی نابێ قامك لە ئاوێ رۆ بکا لانیکەم دەبێ بە ئاماژەی مێردەکەی ئەو ئیزنەی وەرگرتبێ. ژن بۆی نییە ببێتە خاوەن ماڵ و سامان، هەر ئەوەندەی مارە بڕا، هەرچی هەیەتی تەنانەت ئەوەی بە میراتیش پێی بڕاوە هەرلەخۆیەوە بە مێردەکەی دەبڕێ. لەم روانگەیەوە، پێگەی ژن لە یاسای دادوەریی بریتانیادا، لە پێگەی کۆیلەکانی زۆربەی ولاّتانی دیکە نزمترە. بۆ وێنە، لە یاسای رۆمدا کۆیلە بۆی هەبوو ماڵ و سامانێکی دیاریکراو بە ناوی خۆی بکا. یاساش تا رادەیەك گەرەنتیی ئەوەی دەکرد کە ئەو بڕە ماڵ و سامانە تایبەتی ئەو بێ. لە

بریتانیا چینە باڵادەستەکان، بە پشتگوێخستنی یاسا و ڕەچاوکردنی گرێبەستگەلێکی تایبەت (لە ژێر ناوی یارمەتی و شتی وا)، هێندێ پوان و قانیان بۆ ژنان لە بەر چاو گرتووە. چونکە بەلای باوکانەوە، هەستی باوکایەتی بەهێزترە لە هەستی یەکیەتی لەگەڵ ڕەگەزی نێرینە و باوك زیاتر کچەکەی خۆشتر دەوێ لە زاوایەکەی، کە بۆ ئەو نامۆ و بێگانەیە. دەوڵەمەندەکان زۆر جاران ڕێوشوێنگەلێك ڕەچاو دەکەن کە هەموو یا بەشێك لەو ماڵەی بە میرات بە کچە دەبڕدرێ لە زاواکەی بشارنەوە، بەڵام دیسانیش ناتوانن بە کچەی بسپێرن و زیاتر شتێکی کە بۆیان دەلوێ ئەوەیە کە نەهێڵن مێردە بەبایدابدا، بەڵام هەر لەو کاتەشدا کچە بێبەش دەکەن و ناهێڵن کەڵکی لێوەرگرێ, بەم جۆرە، هیچ کامیان (ژن و مێرد) دەستیان بەو ماڵ و داراییە ڕاناگا. بەڵام داهاتو بەرهەمی ئەو داراییە بە ژنە دەبڕێ ((و پێی دەڵێن: بۆ کەڵك لێوەرگرتنی تایبەتی ژن)). سەرەڕای هەمووی ئەو فرتوفێڵە، مێرد تەنیا لە وەرگرتنی داهاتەکە بێبەش دەکری و ئەگەر بیەوێ بە زۆرەملێ بی ئەستێنێ، نە دەکرێ سزای بدەن و نە ڕێگەیەك هەیە لێی بستێندرێتەوە. ئەوەی باسمانکرد تەواوی ئەو ڕێوشوێنانەن کە بەهێزترین چینەکانی بریتانیا دەتوانن بیگرنە پێش بۆ ئەوەی بە پێی ئەوانە، لە بەرامبەر مێردەکەیدا پشتیوانی لە کچەکەیان بکەن. ڕوون و ئاشکرایە کە لە زۆربەی هەرەزۆری ئەو شتانەدا، ڕێککەوتنێکی لەم جۆرە لەگۆڕێدا نییە و هەموو ماف و ماڵ و سامانی ژن و ئازادییەکانی ئەو، یەکسەر، لە بەر دەستی مێردەکەی دایە. "ژن و پیاو" یان ((لە ڕووی یاساییەوە بە یەك کەس)) لە قەڵەم داوە و مەبەست ئەوە بووە کە وابزانرێ کە هەرچی ماڵ و دارایی ژنە، ئی مێردەکەیەتی بەڵام پێچەوانەکەی کە (هەرچی ئی مێردە بۆ ژنەکەشیەتی) لە گۆڕێدا نییە. کەچی ئەو ڕێسایە بە هیچ شێوەیەك پیاو ناگرێتەوە، جیا لەوەی کە مێرد دەکاتە بەرپرسی ئاکار و کردەوەی ژنەکەی، هەروەك چۆن سەرۆك (ئەرباب) بەرپرسی ئاکاری کۆیلەکان یا مێگەلەکەیەتی. هەڵبەت من بە هیچ شێوەیەك نکۆڵی لەوە ناکەم کە بە گشتی ژنان لە کۆیلە باشتر هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێ، بەڵام دەبێ ئەوەمان لە بەر چاو بێ کە هیچ کۆیلەیەك وەکو ژن بەمانای وشە لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانیدا کۆیلە نییە.



هیچ کۆیلەیەك جگە، لەو کۆیلانەی ڕاستەوخۆ لە بەر دەستی ئاغاکەیان دان، لە هەموو کات و ساتەکانی ژیانیدا بە تەواوەتی کۆیلە نییە. ئەویش، وەك سەربازان، ئەرکێکی دیاریکراوی لە ئەستۆیە و ئەگەر ڕاپەڕاند یا لەو دەمەدا کە لە حاڵی خزمەتدا نییە، مامەتەکەی بۆ ماوەیەکی کورت بۆ خۆیەتی. کۆیلە بنەماڵەیەکی هەیە و ئاغاکەی بە دەگمەن خۆی تێ هەڵدەقورتێنێ. بۆ وێنە لە چیرۆکی "کۆخەکەی مامە تۆم"دا ئەو کاتەی مامە تۆم لە لای یەکەم ئاغاکەی دەژیا، لە کۆخەکەی خۆیدا، ژیانێکی سەربەخۆی هەبوو. لەوەها دۆخێکدا ژیانی کۆیلە وێکچوویی هەیە لەگەڵ ژیانی پیاوێك کە بۆ کارکردن لەگەڵ بنەماڵەکەی چووەتە وڵاتێکی دیکە. بەڵام ژن لەوەها دۆخێك دا نییە. جگە لەوەش، لە وڵاتە مەسیحییەکاندا (سەردەمی کۆیلەداریێتی- وەرگێڕ)، یەکێك لە مافە ڕەواکانی ژن ئەوە بوو کە دەیانتوانی لە سێکسکردن لەگەڵ ئاغاکانیان خۆ ببوێرن و ئەوەش بەشێك بوو لەو دەروەستبوونە ئەخلاقییەی کە کۆیلەدار ملی بۆ ڕادەکێشا. لە حاڵێکدا ژن وەها مافێکی نییە. ئەگەر ژنێکی چارەڕەش، مێردی بە کابرایەکی شێت و شوور کردبێ و بشزانێ کە پیاوەکەی لێی بێزارە و چێژ لە ئازاردانی وەردەگرێ و بشزانێ جیا لە بێزاری هیچ هەستێکی دیکە لەنێوان ئەو و مێردەکەیدا نییە، دیسانیش پیاوەکەی بۆی هەیە ئەوپەڕی سووکایەتیی پێ بکا و وەك ئاژەڵ هەڵسوکەتی لەگەڵ بکا. لەکاتێکدا کە ژنە لەگەڵ خراپترین جۆری کۆیلەداریێتیی بەرەو ڕوویە، ئەو دەبێ چ حەقێکی بە سەر ئەو منداڵانەوە هەبێ کە هەم منداڵی ئەون و هەم منداڵی ئاغاکەی؟ منداڵ بە پێی یاسا بە باوك دەبڕێن. ئەوە تەنیا باوکە کە بە پێی یاسا حەقی بەسەریانەوەیە. ژن بۆی نییە بەبێ ئیزنی مێردەکەی هیچ ڕێوشوێنێك بۆ منداڵەکانی بکێشێ. ژن تەنانەت پاش مردنی مێردەکەیشی سەرپەرشتیاری منداڵەکانی نییە، مەگەر ئەوەی کە پیاوەکە لە وەسێتنامەکەی خۆیدا وەها مافێکی پێدابێ. لەڕابردوودا پیاو تەنانەت بۆی هەبوو منداڵەکان لە ژنەکەی ﴿دایکیان﴾ دوور بخاتەوە و نەشهێڵێ چاویان بە یەکتر بکەوێ و تەنانەت نامەش بۆ یەکتری بنێرن ... ﴿دواتر﴾ بە پەسەندکرانی یاسای تالفۆرد بوو کە دەسەڵاتی پیاوی لەم بوارەدا تا ڕادەیەك کورت کردەوە. ئەوەیە بارودۆخی یاسایی ژن و

ئەویش هیچ رێگەیەك بۆ دەربازبوون شك نابا. ئەگەر ژن پیاو بەجێ بێڵێ، نابێ هیچ شتێك لەگەڵ خۆی بەرێ، نە منداڵەکانی و نە هیچ شتێك لەوانەش کە لەڕاستیدا ملکی خۆیین و ئەگەر پیاو بیەوێ، هەم بە پێی یاسا و هەمیش بە زۆرەملێ دەتوانێ بیگێڕێتەوە ماڵەوە. پیاوگەلێکیش هەن کە لە بەرامبەر وەرگرتنی شتێکدا ﴿نووسەر روونی نەکردۆتەوە چ شتێك: دراو، زەوی، ئاڵتون ...... - وەرگێر﴾ لە خۆی ﴿ژنەکە﴾ یا لە خزم و کەس و کاری ئیزن بە ژنە دەدەن بە جێیان بهێڵێ. پیاوگەلێکیش هەن کە لە ژنەکەیان دەگەڕێن بڕوات بەو هیوایەی رۆژێك لە رۆژان بکەونە شوێنی و هەرچی کۆی کردۆتەوە لێی بستێنن. ژن تەنیا بەو مەرجەی بە بڕیاری دادگا لە مێردەکەی جوێ ببێتەوە، مافی ئەوەی هەیە کە بە تەنیایی بژی و هەردەم ترسی ئەوەی نەبێ کە نەکا، بەندییەوانە بێ بەزەییەکەی بگەڕێتەوە و جارێکی دیکەش بیکاتەوە دیلی خۆی و تەنیا بەمجۆرەشە کە دەتوانێ کەڵك لە داهاتی خۆی وەرگرێ بەبێ ئەوەی ترسی لە هاتنی پیاوێك هەبێ کە دەیەوێ هەموو شتێکی لە چنگ دەربێنێ، پیاوێك کە لەوانەیە زیاتر لە بیست ساڵ بێ، ئەوی نەدیتووە و هیچ رۆڵێکی لە ژیانی دا نەبووە. دادگاکانیش، هەتا ئەم دواییانە، نرخێکی وەها گرانیان بۆ ئەم جوێبوونەوەیە دیاریدەکرد، کە تەنیا چینە زەنگینەکان دەیانتوانی بیدەن. ئێستاکەش لە هێندێ بواردا، وەك خۆبواردن لە "نەفەقە" و بێبەش کردن یا توندوتیژیی لە رادەبەدەر، وەها بڕیارێك دەدری و سەیر ئەوەیە کە زۆر کەس زاڵەیان دێ لەوەی کە ئەمێستا بڕیاری لێك جوێبوونەوە زۆر ئاسان دەردەکرێ! ئەگەر بە ژنان بڵێن تەنیا یەك چارەنووستان لە بەردەمە، ئەوەیکە ببنە خزمەتکاری کەسێك کە یاسا هەموو ماف و دەستئاوەڵاییەکی پێداوە و بەختەوەریی ئێوەش گرێدراوە بەوەی کە شانس و بەخت لەگەڵتان بێ و کابرایەك بدۆزنەوە کە وەك خۆشەویستی خۆتان لێ بکا نەك وەکو قەرەواشی خۆی، ﴿لەوەها حاڵەتێك دا﴾ ئایا ئەوە ئەوپەڕی بێ بەزەیی نییە کە دەرفەتی دۆزینەوەی وەها پیاوێك تەنیا جارێك بۆ ژنان بڕەخسێندرێ؟ ئاکامی سروشتی و لۆژیکیی وەها رەوشێك ئەوەیە کە چونکە تەواوی ژیانی ژن بەستراوەتەوە بە هەڵبژاردنی کەسێکی شیاو، دەبێ ئیزنی پێ بدرێ چەندین جار سەرۆك (ئاغاکەی)



بگۆڕێ هەتا کەسێکی شیاو و گونجاوی دەست دەکەوێ. من ناڵێم ژنان دەبێ یا نابێ وەها مافێکیان هەبێ، ئەوە شتێکی تەواو جیاوازە. من تەنیا دەڵێم ئاکامی سروشتیی وەها دۆخێك، ئەوەیە کە وتم. مەسەلەی تەڵاق، بە واتای جوێ بوونەوە و ئیزنی زەماوەند هاوسەرگیریی سەر لە نوێ، مەسەلەیەکە، کە ئەمن نامهەوێ بچمە سەری. لە ئێستادا ئەوەی من دەیڵێم ئەوەیە کە ئەگەر یەکێك ناچارە مل بۆ کۆیلەیی راکێشێ، کەمترین و لە هەمان کاتدا تەنیا پوانێك کە دەکرێ پێی بدرێ دەست ئاوەڵاییە لە هەڵبژاردنی ئاغادا و ئەگەر ژنان لەو مافەش بێبەش بکەین، ئیتر جیاوازییەکی لەگەڵ کۆیلەکان نییە. ئەویش نەك کویلایەتییەك کە هاوسەنگی تێدا رەچاو کرابێ، چونکە لە هێندێ کۆمەڵگەدا کۆیلە ئەگەر بە چەند شێوەی تایبەت هەڵسوکەوتی خراپی لەگەڵ کرابا، بۆی هەبوو بە پێی یاسا ئاغاکەی ناچار بکا کە بە یەکێکی دیکەی بیفرۆشێ. بەڵام لە بریتانیا، پیاو هەر چۆنێکی ژن بچەوسێنێتەوە (جگە لە ناچارکردن بە لەشفرۆشی) نابێتە هۆی ئەوەی کە ژن لە دەستی رزگار بێ. ئەمن نامهەوێ زۆری لێ زیاد بکەم، بە راستی بۆ لێزیادکردن نابێ. ئەوەی باسم کرد دۆخی ژنان لە پانتایی یاسادا بوو، نەك هەڵسوکەوتی راستەقینە لەگەڵیان. یاسای زۆربەی وڵاتان لە زۆر جێ دا گەلێك سامناکترن لەو هەڵسوکەوتەی خەڵك بە کردەوە دەینوێنن و گەلێگ یاساش تەنیا بۆیە ماونەتەوە کە بە دەگمەن بەڕێوە دەچن و هێندێکیشیان هەر بەڕێوە نابردرێن. ئەگەر ژیانی هاوبەش تەنیا لە سەر بنەمای یاسا دامەزرابا، جەهەننەمێك لە سەر زەوی بەرپادەبوو کەهیچ مرۆڤێك تاقەتی نەدێنا. بەختەوەرانە هێندێ هەست و هۆگری لەمرۆڤدا هەن، کە لە زۆر جێدا حەز و تاسەی مرۆڤ بۆ سەرەڕۆیی، دادەمرکێننەوە و لە هێندێ جێدا هەر نایهێڵن و لە نێو ئەم هەستانەدا، ئەوەی کە پیاو بە هاوسەرەکەیەوە دەبەستێتەوە لە هەموان بەهێزترە و ئاکامەکەشی پێوەندییەکە کە لەگەڵ هیچ پێوەندییەکی دیکە بەراورد ناکرێ و تەنیا پێوەندیی نێوان باوك و منداڵە کە تا رادەیەك لێی نزیك دەبێتەوە و ئەم پێوەندییە هێندێك جاری ناوازە نەبێ، نابێتە هۆی کاڵبوونەوە لاوازبوونی پێوەندیی یەکەم، بەڵکو بەهێزتریشی دەکا. بەڵێ، راستییەکە، ئەوەیە و پیاوان ئەو زوڵمانەی کە دەتوانن لە

ژنانی بکەن نایکەن و ژنانیش بە دەست ئەو چارەڕەشیانەوە نانالێنن کە پیاوان بە سەریاندا سەپاندوون، چونکە پیاوان کەڵك لە تەواوی ئەو هێز و دەستئاوەڵاییە وەرناگرن کە یاسا پێی بەخشیون. هەر لە بەر ئەم راستییانەشە کە ئەوانەی وا داکۆکی لە دۆخی ئێستا دەکەن، جیاوازی خستن لەنێوان ژن و پیاو نەك بە نارەوا نازانن بەڵکو بەلایانەوە ئاساییە و دەڵێن: ئەگەر کەسانێك بەم دۆخە ناقایلن، نارەزامەندییان لە بەر ئەم کەمایەسییانە کە لە هەر کارێکی گەورە و شیاودا بەدیدەکرێ. بەڵام ئەو هاوسەنگییانەی لەم بوارەدا پێکهاتوون لەوجۆرە هاوسەنگییانەن کە لەم یا لەو دامەزراوەی توتالیتاردا دێنە ئارا بۆ ئەوەی هێزە یاساییەکەی بە شەقڵ نەشکاوی بمێنێتەوە. بەو پێیە پێکهێنانی ئەم جۆرە هاوسەنگییانە نابێتە هۆی پاکژبوونەوەی سەرەڕۆیی و پاوانخوازی، بەڵکو دەری دەخا کە سروشتی مرۆڤ بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ قیزەونترین نەریتەکان بە چ هێزێکی سەرسووڕهێنەرەوە بڵاودەبنەوە و گەشە دەکەن. ناکرێ بە بێ باس کردن لە سەرەڕۆیی سیاسی باس لە سەرەڕۆی لە بنەماڵەدا بکەین. هیچ پادشایەکی پاوانخواز چێژ لە ناڵەونوزەی ئەو کەسانە وەرناگرێ کە لە بەرچاوی ئەشکەنجە دەکرێن و واش نییە کە لە سەرمای تووشی زستانێدا بە رووت و قووتی ئەو کەسە بەرەڵڵا بکا کە دژایەتیی دەکا. پاوانخوازیی لوئی شازدەهەم لەگەڵ سەرەڕۆیی فیلیپ لۆبێل و نادرشا و کالیگولا بەراورد ناکرێن، بەڵام لەو پاوانخوازییەش دا ئەوەندە سەرەڕۆیی و خراپە هەبوو کە شۆڕشی فەرەنسای لێ بکەوێتەوە و تەنانەت ترس و سامناکییەکانی شۆڕشی فەرەنساش بە هێند نەگرن. ئەگەر یەکێك لە پێوەندییەکانی نێوان ژن و پیاو دا، وەك فاکتۆرێك ئاماژە بە خۆشەویستیی نێوانیان بکا دەبێ بڵێین کە وەها هۆگری و خۆشەویستییەك لەنێوان ئاغاکان و ئەو خزمەتکارانەش دا هەبووەکە لە ماڵی ئاغاکانیان لە دایك بوون. لە یۆنان و رۆمی کۆندا گەلێك جار وا رێککەوتووە کە کۆیلەکان لە ژێر ئەشکەنجەدا دەمردن بەڵام خیانەتیان لە ئاغاکانیان نەدەکرد. لەو بەڵگانەدا کە لە سەر شەڕە نێوخۆییەکانی رۆم بە دەستەوەن ناوی گەلێك ژن و کۆیلە دەبینین کە قارەمانانە بە نیسبەت ئاغا و مێردەکانیان وەفادار مابوونەوە. بە پێچەوانەوە خەیانەتی کوڕان شتێکی ئاسایی بووە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە هەموان



دەزانن رۆمییەکان چ بێ بەزەییانە لەگەڵ کۆیلەکانیان دەجووڵانەوە. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە هۆگرییەکی وەها قووڵ تەنیا لە ژێر دەسەڵاتی زاڵمانەترین دامودەزگاکان دا پێکدی و ئەم لە تەنزەکانی ژیانە. مرۆڤی سوپاسگوزاری ئەمەگ ئەو کەسەیە کە دەتوانێ بە بێ هیچ زەحمەت و چەرمەسەرییەك ژیانی لێ بستێنێ، بەڵام بە ویستی خۆی وا ناکا، لە وەها دۆخێك دایە کە بەهێزترین هەستی وەفاداری و ئەمەگناسی لە مرۆڤ دا دەپشکوێ. شك لەوەدا نییە کە وەها هەستێك لەزۆربەی خەڵکدا پلەیەکی بەرزی هەیە و تەنانەت لە باوەڕی ئایینیشدا بەدیدەکرێ. ئێمە هەموو رۆژێ دەبینین کە، کەسانێك ئیمانیان بە خودا پتەوتر و ئەمەگداریتییان لە زیاد بوونە. ئەو دەمەی کە دەبینن ئەو هێندێ شتی بەوان بەخشیوە کە ئەوانی دیکە لێی بێبەشن.

بەو پێیە، ئایا دەبێ لەسەر دامودەزگای کوێلایەتی و تۆتالتیاریزمی سیاسی و سەرەڕۆیی گەورەی ماڵێ وەجواب بێین؟ مەسەلە ئەوەیەکە بەردەوام چاوەڕوان دەکرێ دامودەزگاگەلێك لەم چەشنە لە باشترین شێوەی خۆیدا بێنینە پێش چاو و ئەو جار دادوەرییان لە سەر بکەین و وێنەیەکی کە لەم دامودەزگایانە وێنا دەکرێ دلۆڤانی و بەزەیی باڵادەست و ئەمەگواری و پێزانینی ژێردەست دەردەخا. بە واتایەکی دیکە، لە لایەکەوە خاوەن دەسەڵات کەسێکی تێگەیشتوویە کە بە هەموو توانایەوە هەوڵدەدا کاروبارەکان بە قازانجی هەموو بندەستان بشکێنێتەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بندەستگەلێك هەن کە بە زەردەخەنەوە سوپاسی ئەو دەکەن. داکۆکیکارانی ئەم جۆرە دامودەزگایانە بە هێنانەوەی بەڵگەگەلی لەم چەشنە ناتوانن رەوابوون و حەقداربوونی خۆیان بسەلمێنن، چونکە ئێمە نالێین مرۆڤی باش و شیاو هەر بوونی نییە. کێ گومانی لەوە دایە کە ژیان لە ژێردەسەڵاتی کابرایەکی دادپەروەر و باشدا لەوانەیە ببێتە هۆی بەختەوەری و چاکە و خۆشەویستیی لە رادە بەدەر؟ بەڵام دەبێ یاساکان جۆرێك دابڕێژرێنەوە کە دەستی مرۆڤە خراپەکارەکان لە هەڵە کورت بکاتەوە. زەماوەند هاوسەرگیری نەریتێك نییە کە تەنیا بۆ ژمارەیەك بژاردەی دیاریکراو رەچاو کرابێ. ناکرێ پیاوان بەر لە رێورەسمی هاوسەرگیری ناچار بکرێن کە بیسەلمێنن کەڵکی بێ جێ لە دەسەڵاتی رەها و بێ سنووری خۆیان وەرناگرن. هۆگری و دەروەستبوون بە

نیسبەت ژن و ماڵەوە لەپیاواندا کە ئاستی تێگەیشتوویی کۆمەڵایەتییان لەسەرێیە، زۆر بەهێزە و تەنانەت لە زۆربەی ئەو پیاوانەشدا کە گرینگیی ئەوتۆ بە ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانیان نادەن، هەر بەهێزە، بەڵام لە بواری دەروەستبوونیشدا، هەروەکو هەموو بوارەکانی دیکەی پێوەندیدار بە چاکە و خراپەی مرۆڤەکان، ئاست و پلەی جیاواز هەن: پیاو گەلێك دەبینن‌درێن کە لە بەرامبەر کۆمەڵگا دا هەست بە هیچ بەرپرسیارێتییەك ناکەن و هەروەها هەندێ پیاویش هەن کە کۆمەڵگا. لە بەرامبەریاندا ناچارە دوایین رێگە چارە، واتە سزا یاساییەکان، بگرێتەوە بەر. لە نێو پیاواندا، لە هەر ئاستێکی تێگەیشتنی کۆمەڵایەتیش دابن، کەسانێك بەدیدەکرێن کە وەکو مێرد لە تەواوی دەسەڵاتی یاسایی خۆیان کەڵك وەردەگرن. بەدفەڕترین پیاوەکانیش هەموو ناهەقییەك دەرهەق بە ژنەکەیان  دەکەن جگە لە کوشتنی و تەنانەت ئەگەر تووشی کوشتنیشی بن، بە مەرجێك فیکری رێگە چارەیان کردبێتەوە، مەترسییەکی ئەوتۆیان لە سەر نابێ و دەتوانن خۆ لە سزای یاسایی دەرباز بکەن . لە هەموو وڵاتاندا گەلێك زۆرن ئەو پیاوانەی نێو چینەکانی خواروو، کە جگە لە سنووری ژیانی بنەماڵەییدا، لە دەرەوەی ماڵ لە یاسا لانادەن، لە بەر ئەوەی لە تۆڵە و سزادان دەترسێن، کەچی هەر ئەوانە لە ژیانی هاوسەرێتییاندا دڕندانەترین هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ژنەکانیان هەیە، چونکە ئەو تەنیا کەسێکە، کە لانیکەم لە نێو گەورەکاندا، نەدەتوانێ بە توندوتیژی وەڵامی توندوتیژییان بداتەوە و نەڕێگەی دەربازبوونێکیشی لە سەر ئاوەڵایە. هۆگریی و بەستراوەیی ژن بەم جۆرە پیاوانە نەك هەر دان بەخۆداگری و لێبوردەیی و  بەرزەفڕیی پیاوان بەهێزتر ناکا، بەلکو دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی سروشتی قیزەون و دڕندانەی پیاوان. هەرگیز لەم پیاوانە چاوەڕوانی ناکرێ جوامێری و گەورەیی بنوێنن و هەڵسوکەوتی شیاویان لەگەڵ کەسێك هەبێ کە تەنیا لە سایەی بەزەیی و دڵۆڤانی ئەوانەوە بەهرە لە ژیان دەبینێ. ئەوانە تەواو جۆرێکی دیکە بیر دەکەنەوە و پێیان وایە، یاسا شتێکی خستۆتە بەردەستیان کە ئەوان کەڵکی لێوەرگرن و قەت بە بیریشیاندا نایە کە دەبێ وەکو خەڵکی دیکە لەگەڵ ژنەکەیان بجووڵێنەوە. یاسا، هەتا ئەم دواییانەش هیچ سزایەکی بۆ زێدەڕۆیی بەدفەڕانەی نێو ژیانی هاوبەش



ڕەچاو نەکردبوو، هەر لەم ساڵانەی پێشوودا بە مەبەستی پێشگیریکردن هێندێ هەنگاوی بچووکی هەڵێناوەتەوە. بەڵام ئەم هەنگاوانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبووە و لەوەش پتر چاوەڕوانیی ناکرێ، چونکە بە پێچەوانەی عەقڵ و ئەزموونە کە پێمان وابێ دەتوانین توندوتیژی هەوسار و کۆنترۆڵ بکەین لە حاڵێکدا قوربانییەکەمان هەروا داوەتە دەست خوڵقێنەری توندوتیژی. مادامەکی ژن سەرەڕای لێدران و توندوتیژیی مێردەکەشی مافی ئەوەی نەبێ کە تەڵاق وەرگرێ یا لانیکەم بە شێوەی یاسایی لێی جوێ بێتەوە، پەنا بردن بۆ سزا یاساییەکانیش بە مەبەستی پێشگرتن لە لێدانی ژنان هیچی لێ شین نابێتەوە و بێ فایدەیە چونکە ژن ناتوانێ سکاڵا ﴿دژی مێردەکەی﴾ تۆمار بکا، ئەگەر بشیکا شایەت و بەڵگەی نییە قسەکەی بسەلمێنێ. ئەگەر بە جوانی لەو راستییە ورد بینەوە کە لە هەموو وڵاتاندا زۆربەی پیاوان بە پێی پێویست پەروەردە نەکراون و بە ئاسانی رووی دڕندەیی و کێویلەیی خۆیان دەردەخەن و یاسای زەماوەند کردنیش جۆرێك رێکوپێك کراوە کە لە دۆزینەوەی قوربانی ﴿ژن﴾ دا هیچ گرفتێکیان بۆ ناهێنێتە پێش ئەو کات تێدەگەین کە ئاست و قووڵایی ئەو چارەڕەشییانەی کەڵکئاژۆوەرگرتن لە دەزگای زەماوەندکردن بە سەر مرۆڤەکانی دا دەسەپێنێ، شتێکی سامناك و تۆقێنەرە. ئێمە تەنیا باسمان لەو شتانە کردووە کە زێدەرۆییان تێداکردوە. هەڵبەت هەڵسوکەوتی زۆر بەدفەڕانە و خراپەکارانە ئەوپەڕی هیچ و پووچیە و هەمیشە نایەتە پێشێ. بەڵام خراپەکاری پلە و ئاستی جیاجیای هەیە و لەنێوان خوارترین ئاست و بەرزترین ئاستەکەی دا گەلێك پلەی دیکەش هەن. لە سەرەڕۆیی بنەماڵەییش دا هەروەك پاوانخوازیی سیاسی، ئەو شتانەی نیشاندەری خراپە و بەدفەڕیی "رووت"ن، خۆی باس لەوە دەکەن کە تاڕادەیەك هیچ خراپەکارییەك نییە کە فەرمانڕەوای پاوانخواز بیهەوی و وەدی نەیە و هەروەها بە روونی دەری دەخا کە خراپەکاریی لە ئاستێکی نەرم، هێمنتردا لەوانەیە لە چ ئاستێکی بەرینتردا برەوی هەبێ. ئەو مرۆڤگەلەی وێنایەکی بە تەواو مانای شەیتانین، وەکو پەری و فریشتەکان دەگمەنن، لەوانەیە لەوەش دەگمەنتر. بەڵام زۆرن ئەو دڕندە سیفەتانەی کە جاروبار لە روخساری مرۆڤدا دەردەکەون و لە مەودای نێوان ئەوانە و

ئەو کەسانەی نوێنەری شیاوی نەژادی مرۆڤن گەلێك کەسیش هەن کە لە ڕووی ئاستی حەیوانبوون و خۆپەرستییەوە لێك جیاوازن و لە ژێر توێژی شارستانییەت و تەنانەت کولتوورەوە روخساری خۆیان حەشار داوە. ئەوانە دوژمنایەتییان لەگەڵ یاسا نییە و بە لای ئەو کەسانەوە کە لە بەر دەستیاندانین خۆشەویست و جێی ڕێزن، بەڵام هەر ئەمانە ئەگەر دەسەڵاتیان بە سەر یەکێکدا هەبێ ژیانی لێ دەکەنە جەهەننەم! ئەگەربمەوێ بیسەلمێنم کە هیچ مرۆڤێك نابێ دەستی بە دەسەڵاتی ڕەهارا بگا و چ مەترسیگەلێکی گەورە لەو شتەدا شاراوەیە، دەبێ ئەو قسانە دووبارە بکەمەوە کە چەند سەدەیە لە حەیس و بەیسە سیاسییەکاندا دەگوترێنەوە و هەموان دەیزانن و ئێستا بە لایانەوە سواون. ئەگەر هیچ مرۆڤێك شیاوی گەیشتن بە دەسەڵاتی بێ سنوور نییە، ئەدی بۆچی تەواوی پیاوانی باڵق، لە باشترینەکەیانەوە بگرە هەتا دەگاتە دڕندەترینەکەیان، بە شیاوی ئەوە دەزانین کە دەسەڵاتی ڕەها و بێ سنووری بە سەر ژنێك داهەبێناکرێ تەنیا بە هۆی سەرپێچی نەکردن لە دە فەرمانەکەی کتێبی پیرۆز، وەها دەسەڵاتێك بە هیچ پیاوێك بدرێ یا ئەوەی کە لە بەر ئەوەی یانی کەسایەتییەکی شیاو لێوەشاوەی هەبووە لە هەڵسوکەوت و جووڵانەوە لەگەڵ ئەوانەی نەیتوانیوە ناچاریان بکا لەگەڵی هاونشین بن، یا ئەوەی کە خراپە دەرهەق بەو کەسانە ناکا کە خۆشیان لە چارەی نایە. بە پێی ئەو شتانە دەرناکەوێ کە ئەو لە ماڵێدا، کاتێك تەواو دەستی ئاوەڵایە چۆن هەڵسوکەوت دەکا. تەنانەت ئاساییترین مرۆڤەکانیش لایەنی تووڕە و تۆسن و توندوتیژی و خۆپەرستییانەی کەسێتیی خۆیان بۆ ئەو کەسانە دەردەخن کە خۆی لە بەر ڕاناگرن. ئەو پێوەندییەی کەسی باڵادەست لەگەڵ بندەستەکەی دایدەمەزرێنێ، کەشوهەوایەك پێکدێنێ کە پەڕوباڵ دەدا بە ڕەهەندە نەرێنییەکانی ژیانی مرۆڤ و ئەم ڕەهەندانە لە هەرکوێ سەر وەدەر نێن سەرچاوەکانیان هەر ئەم پێوەندییەیە. ئەو پیاوەی لەگەڵ هاورەگەز و ئاواڵەکانی بە مرچ و مۆنی و توندوتیژی هەڵسوکەوت دەکا، بێگومان لەنێو کەسانێکدا گەورە بووە کە بە قسەیان کردووە و ئەو توانیوێتی بیانترسێنی و سەریان پێ نەوی بکا. زۆرمان بیستووە کە دەڵێن بنەماڵە لەشێوە دڵخوازەکەیدا قوتابخانەی دڵۆڤانی و فیداکارییە،



بەڵام کە چاو لە بەڕێوەبەرێتییەکەی دەکەین زیاتر قوتابخانەی کەللە ڕەقی و دەسەڵاتخوازی و تەوەزلیی بێ سنوور و خۆپەرسیتی تەماعەیارە بە ڕواڵەتێکی بێ کەموکوڕی و بێ کەمایەسییەوە. قوتابخانەیەکە کە خۆبەخشین تێیدا بیچمێکی تایبەتی وەرگرتووە: پێڕاگەیشتن و ئاگالێبوون لە ژن و منداڵ وەك چاودێریی کەلوپەلێك وایە کە ملکی پیاون و پیاو پێی باشن و لەوانەیە بەختەوەریی ئەوان بەشێوازی جیاجیا ببێتە فیدای ویست و حەزە شەخسییەکانی ئەو. فۆرمی ئێستای دامەزراوەی خێزان چ باشییەکی هەیە؟ دەزانین کە حەز بە خراپە نواندنێك کە لە ناخی مرۆڤ دایە تەنیا کاتێك هەوسار دەکرێ کە دەرفەتی تەڕاتێنی نەبێ. هەروەها دەشزانین کە نزیك بە هەمووی مرۆڤەکان بە پێی حەز و عادەتی خۆیان و نەك هۆشیارانە و بە مەبەست و ئانقەستەوە، کاتێك دەبینین ئەوانی دیکە سەریان بۆ دادەنوێنن، ئیتر ئەوەندە مافیان پێشێل دەکەن هەتا هاواری نارەزایەتییان بەرز دەبێتەوە. بەڵێ، سروشتی مرۆڤ بە گشتی حەزی لە وەها زوڵمێکە، ئەو هێزە بێ سنوورەش کە دامودەزگاکان دەیدەن بە پیاو بۆ ئەوەی ئۆتۆریتەی خۆی بە سەر کەسێکی دیکە دا بسەپێنێ (ئەوەی کە لە ژێر میچێکدا لەگەڵی دەژی و هەمیشە لەگەڵیەتی) دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو تۆوە خۆپەرستییەی کە لە ناخی مرۆڤەکاندایە بگۆڕێ و هەڵبدا. بەڵێ: هێز و دەسەڵاتی ڕەها وەکو باهۆزێك وایە لە خوڵووزە نیمچەکوژاوەکانی خۆپەرستی دەدا و دەی گەشێنێتەوە و ئیزن بە پیاو دەدا لە ژیانی هاوبەش دا ئەو ڕەهەندانەی کەسایەتیی خۆی کە لە دەرەوەی ماڵ دەیانشارێتەوە وەدەربخا و ئەو لایەنانەی کە ئەوەندەی شاردوونەتەوە بوونەتە کەسایەتیی دووهەمی ئەو. من ئاگاداری لایەنێکی دیکەی ئەم مەسەلەیەشم. ژن ئەگەر نەتوانێ بە کردەوە لە بەرامبەر دەسەڵاتی ڕەهای پیاودا ڕاوەستێ لانیکەم دەتوانێ تۆڵەی لێ بکاتەوە، ئەویش دەتوانێ ژیان لە پیاو بکاتە جەهەننەم و بە هۆی ئەم هێزەوە ئیمتیازێك وەدەست بێنێ کە مافی خۆیەتی، هەروەها داوای هێندێ شت بکا کە نابێ بیکا. بەڵام ئەم ئامرازی لە سەرخۆ وەجواب هاتنە، کە لەوانەیە ناوی مێتۆدی ژنانی بێ شەرم و سۆزانیی لێ بندرێ، عەیبێکی گەورەی هەیە ئەویش ئەوەیکە تەنیا دژی

بێهێزترین دەسەڵاتخوازان دەکرێ کەڵکی لێوەربگیردرێ و بەهەڵکەوت لە دەستی کەسانێکیش دایە کە کەمتر پێویستیان پێیەتی. ئەم ئامرازە: چەکی ژنانی تووڕە و کەللەڕەقە. چەکی ئەو ژنانەیە کە ئەگەر خۆیان دەسەڵاتیان هەبێ بە خراپترین شێوە کەڵکی لێوەردەگرن و زۆر جاریش کەڵکی خراپی لێوەردەگرن. ژنانی هێدی و هێمن قەت ناتوانن کەڵك لە وەها چەکێك وەرگرن و ژنانی لێوەشاوە و هەڵکەوتە پێیان شەرمە بە کاری بێنن. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو پیاوانەی سەر لە بەر وەها چەکێك دادەنوێنن، پیاوگەلێکی هێدی و هێمنتر و بێ ئازارترن کە تەنانەت ئەگەر تین نەدرێن، دیسانیش حەزێکی ئەوتۆی لە بەکارهێنانی دەسەڵات لە ڕێگەی توندوتیژییەوە نییە. دەسەڵاتی ژن بۆ ئەوەی ژنان بکاتە بوونەوەرێکی نەحەجمێو، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ژنگەلێك کە سەر دانانوێنن، بەڵام زۆربەی جاران ئەو پیاوانە دەبنە قوربانیی ئەم نەحاملاوی و نەحجمێوییە کە بە دەگمەن حەزیان لە پاوانخوازی و دەسەڵاتدارێتییە.

بەو پێیە، ئەوە چ شتێك ناهێڵێ دەسەڵات گەندەڵی بێنی و ژینگەیەك دروستدەکا کە تێیدا چاکە بەو شێوە بەرچاوەی دەیبینین دەتەنێتەوە؟ ئەگەرچی دڵگریی ژنانە، کاریگەرییەکی زۆری لە سەر ئەم یا ئەو بابەتە هەیە، بەڵام کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر هاوسەنگی پێکهێنان لە حەزە گشتییەکاندا نییە، چونکە ئەم فاکتۆرە تەنیا کاتێك دەتوانێ کاریگەریی هەبێ کە ژنە جوان و گەنج بێ. ئەویش لە زۆر بواردا هەتا ئەو کاتەی جوانیی ژن لە بەر دیدەی پیاو هەروا شەقڵ نەشکاو و نوێ بێ و تۆزوخۆڵی ئاساییبوونی لە سەر نەنیشتبێ و سەرەڕای تەواوی ئەوانەش، هەڵسوکەوتی زۆربەی پیاوان لەگەڵ هاوسەرەکانیان زۆر لە ژێر کاریگەریی جوانی و دڵگریی ژنانەی ئەواندا نییە. یەکێك لەو فاکتەرانەی هاوسەنگی لە دۆخەکە دا پێك دێنێ ئەو حەز و هۆگرییە تاکەکەسییەیە کە وردە وردە وەدەست دێ، سروشتی پیاو خۆی، دەیبا بەرەو ئەو حەز و دڵ گرێدراوییە و کەسایەتیی ژنیش ئەوەندە لەگەڵ ئەو شتە یەکدەگرێتەوە کە ئەم حەزەی تێدا بەهێزتر دەکا. فاکتەری دیکە بەرژەوەندیی هاوبەشی ژن و پیاوە لەسەر منداڵەکانیان و هەروەها ئەو بەرژەوەندییە هاوبەشانەی بە نیسبەت خەڵکانترەوە هەیانە (بەرژەوەندیگەلێك کە بڵێی و نەڵێی گەلێك ئاستەنگی لە



بەردەمن). هۆکاری دیکە ڕۆڵی حاشاهەڵنەگری ژنە لە حەساندنەوە و چێژ بەخشینی ڕۆژانە بە مێردەکەی. کە ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پیاو بە سەرنجدان لە حەزەکانی خۆی بایەخ و گرینگییەکی تایبەت بە ژنەکەی بدا، هەروەها ببێتە هۆی ئەوەی کە، ئەو لە بەر خودی ژنەکە، ئاگای لە ژنە بێ. هەڵبەت ئەگەر هەست و توانای بەرپرسیارەتی لە بەرامبەر خەڵکدا لە گیانیدا مابی و دوایین هۆکار ئەو کاریگەرییەیە کە دەکرێ بڵێین هەموو مرۆڤەکان لە کەسانی نزیك بە خۆیانی وەردەگرن (هەڵبەت ئەو کەسە نزیکانەی کە لەگەڵیان ناکۆك نین). کەسانی نزیکی هەر تاکێك، (خزمەکانی)، لەلایەکەوە بە ویستە ڕاستەوخۆکانیان و لەلایەکی دیکەشەوە تا ڕادەیەك بە پەرەپێدانی هەستپێنەکراوی سۆز و حەزەکانیان، زۆر جاران دەتوانن تا ڕادەیەك کاریگەرییان هەبێ لە سەر ئەو هەڵسوکەوت و ئەدگارەی ئەو، کە دەسەڵاتێکی ناڵۆژیکی و زێدەڕۆیانەی بە سەریاندا هەیە، مەگەر ئەوەی کە هۆکارگەلێك لە ئارادا بن کە کاریگەریی خزمەکانی پووچەڵ بکاتەوە. ژن بە کەڵکوەرگرتن لەم ئامرازانە لەوانەیە لە زۆر بواردا تەنانەت بە سەر مێردەکەشی دا دەسەڵات بکا و زاڵ بێ. ژن دەتوانێ لەو کاروبارانەدا مێردەکەی بخاتە ژێرکاریگەریی خۆی کە پێوەندییان بەوەوە نییە و لێرەدا کاریگەرییەکەی ئەو شتێکی ژیرانە نییە و جگە لەوەش لەوانەیە لە باری ئەخلاقیشەوە کەڵکی خراپی لێوەرگیردرێ. لەوەها حاڵێکدا ئەگەر لە پیاو گەڕابایەن لەوانەبوو کارەکەی زۆر باشتر بوایە. بەڵام نەك لەم کارانەدا و نە لە کاروباری ماڵەوەش دا، دەسەڵاتداریتیی ژن ناتوانێ قەرەبووی نەبوونی ئازادی بکاتەوە. ئۆتۆریتە و زاڵبوونی ژن زۆر جاران لە هێندێ بواردا دەستڕۆیشتووی دەکا کە پێوەندیی بەوەوە نییە و سەرەڕای ئەوەش پێگەیەکی وای پێ نابەخشێ کە بتوانێ داکۆکیی لە مافی ڕاستەقینەی خۆی بکا. زۆر هەبووە قەرەواشێکی ژیکەڵەی پادشایەك فەرمان بە سەر گەلێك قەرەواش و خزمەتکاراندا لێدا، بەڵام دۆخی لە بار و دڵخواز ئەوەیە کە ئەو خۆی قەرەواش نەبێ و فەرمانیش بە سەر قەرەواشاندا لێ نەدا. کاتێك ژن لە پیاودا توابێتەوە و هیچ ئیرادە و هێزێکی لە خۆیەوە نەبێ (یا لانیکەم بیەوێ مێردەکەی بێنێتە سەر ئەوەی کە ئەو ﴿ژنە﴾ ورە و تواناییەکی نییە) و

لە تەواوی ئەو کاروبارانەدا کە پێوەندییان بە هەردووکیانەوە هەیە ئەو یەکسەر ملکەچی ویستی مێردەکەی بێ، کاتێکیش هەموو ژیانی ژنەکەی هەر ئەوەندە بێ کە سۆز و حەزەکانی مێردەکەی بپارێزێ، لەوەها دۆخێکدا لەوانەیە یەکێك لە خۆشییەکانی ژنە ئەوە بێ کە لە ڕێگەیەکەوە کاریگەریی لە سەر مێردەکەی هەبێ کە پێوەندیی بەوەوە نییە و ئەو بۆی نییە خۆی تێهەڵقورتێنێ، زۆربەی جاریش لێکدانەوەکەی لەوانەیە لە سەر بنەمای داوەریکردنی پێشوەخت و دەمارگرژییە شەخسییەکان بێ. هەڵبەت ژن لەوەها هەلومەرجێکدا بە ئەگەرێکی زۆرەوە پیاو لە ڕێگەی ڕاست دوور دەخاتەوە. هەر بۆیەش لە دۆخی ئێستادا، ئەو پیاوانەی بەو پەڕی رووخۆشی و دڵۆڤانییەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوسەرەکانیان دەکەن و ڕێز لە بیروڕاکانیان دەگرن، جگە لە کاروباری ماڵەوە دا دەستڕۆیشتوویی ژنەکانیان لە بوارەکانی دیکەدا لەوانەیە ئاکامی باش و خراپی وەك یەکی لێ بکەوێتەوە. ژنیان فێرکردووە کە کاروباری دەرەوەی ماڵێ پێوەندیی بەوەوە نییە. هەر بۆیەش ئەو بە دەگمەن ڕاستگۆیانە و بەرپرسیارانە بیروڕای خۆی لە سەر ئەو شتانە دەردەبڕێ. ئەگەر رای خۆیشی دەربڕێ بەو پێیە نییە کە بە مافی خۆی بزانێ بەڵکو بە پێی حەز و هۆگرییەکانێتی. ئەو نە دەزانێ و نە بۆیشی گرینگە کە لە سیاسەتدا کام لایەن لە سەر هەقە و کام لایەن ناهەقە. تەنیا شتێکی بۆی گرینگە بەرژەوەندیی بنەماڵەییە، "ئەوەی کە" کام لایەن ئەگەر سەرکەوێ لە باری ئابوورییەوە بە قازانجی ئەوانە یا بایەخ و بەهایان پێ دەبەخشێ، یا پلەیەکی شەرافەتمەندانە بە مێردەکەی و ئیشێکی گونجاو بە کوڕەکەی دەدا و مێردێکی باش بۆ کچەکەی بە دیاری دێنێ؟

لەوانەیە بپرسن کە ئایا هیچ کۆمەڵگەیەك بەبێ حکوومەت دەتوانێ بژی؟ کەواتە لە بنەماڵەشدا وەکو دەوڵەت، دەبێ کەسێکی دیاریکراو سەرۆك بێ. کاتێك ژن و پیاو لە ژیانی هاوبەشیاندا، بیروباوەڕیان یەکنەگرێتەوە دوایین بڕیار کێ دەیدا؟ خۆ ناکرێ هەر کەسەی بە ڕێگەی خۆیدا بڕوا و ئاخرییەکەی دەبێ قسەی یەکێکیان بچێتە سەر.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، پێویستە بگوترێ کە لە ڕاستیدا ئەوە دروست نییە کە لە ژیانی دڵخوازی دوو کەسدا، جەخت بکرێ لە سەر ئەوەی کە دەبێ یەکێك سەرۆکی



بێسنوور بێ و لەوەش هەڵەتر ئەوەیە کە پێمان وابێ یاسا دەبێ لە پێشدا دەستیشانی بکا کە کامیان باڵادەست و کامیان ژێردەست بن. جگە لە ژیانی هاوبەش، ئاساییترین جۆری پێوەندیی دڵخواز، بەشداریکردنە لەکارکردندا. بەڵام کەس پێی وانییە لەوەها بەشدارییەکدا پێویستە یەکێك بە تەنیایی هەموو کارەکان ڕاپەڕێنێ و ئەوانی دیکەش گوێڕایەڵی بن. هیچ کەس ناچێتە نێو کۆمپانیایەك کە بەرپرسیارەتیی بەڕێوەبەرێکی بخەنە ئەستۆی بەڵام دەسەڵات و مافی فەرمانبەرێکی پێ بدەن. ئەگەر یاسا لە گرێبەستەکانی دیکەشدا وەکو زەماوەندکردن جووڵاباوە، دەبوایە دیاری کردبا کە یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەستەکە، جۆرێك کار بکا کە وەك بڵێی بابەتی گرێبەستکراو کاری شەخسیی خۆیەتی و ئەوانی دیکەش تەنیا نوێنەری ئەون و هیچی دیکە، هەروەها دەبوایە ئەوە دەستنیشان کرابا کە ئەم کەسەش بە پێی مەرجی دیاریکراو بۆ وێنە تەمەن، دەستنیشان بکرێ. بەڵام هەروەکو دەزانین یاسا هەرگیز دیاری نەکردووە و ئەزموونیش دەری ناخا کە پێویست بێ بە پێی کۆمەڵێك داوەریی پێشوەخت نایەکسانی لەنێوان ئەندامانی کۆمپانیایەکدا هەبێ، یا ئەندامەتی بە پێی کۆمەڵێك مەرج بێ لەو مەرجانەی ئەندامان لە ڕێککەوتننامەکەیاندا دەیگونجێنن. ئەو جار، وێدەچێ ئەگەر دەسەڵاتی ڕەها لە بەشداریکردنی هاوبەشدا بە کەسێك ببڕێ، ماف و بەرژەوەندیی بندەستەکان لە چاو "دوولایەنی ژیانی هاوبەش" کەمتر دەکەوێتە مەترسییەوە، چونکە لە کاری هاوبەشدا هەرکام لە ئەندامان بە دەستکێشانەوە لە دەتوانێ خۆی ڕزگار بکا، بەڵام ژن ئەوەی لە دەست نایە و ئەگەر لە دەستیشی هاتبایە، باشتر وابوو کە ئەو بەر لە جوێبوونەوە هەموو ڕێگەکانی دیکە تاقیبکاتەوە.

هەڵبەت لە زۆربەی کاروبارەکاندا دۆخەکە وایە کە دەبێ هەر ڕۆژەی بڕیارگەلێك بدرێ و ناکرێ ئەم بڕیارانە وردە وردە بدرێن و چاوەڕوانیی بەرژەوەندییش بکرێ. لەوەها دۆخیکدا لۆژیکی کارەکە وا دەخوازێ کە قسەی کەسێك بچەقی و دەسەڵاتی هەموو شتەکان هەر بەو بێ. بەڵام ئەو قسەیە بەو مانایە نییە کە ئەو کەسە بۆ هەمیشە فلانە کەس بێ. شێوازە سروشتییەکەی ئەوەیە کە دەسەڵات لەنێوان دوو کەسدا دابەشبکرێ، و هەر کامێکیان لە چوارچێوەی ئەرکی پێ ئەسپێردراوی خۆیدا

دەسەڵاتی تەواوی هەبێ، بەڵام گۆڕانکاری لە ڕێکخراو و پرەنسیپەکاندا لە سەر ڕەزامەندیی هەر دوولا بێ. لەوەها دۆخێکدا یاسا نە دەتوانێ نە دەشبێ لە پێشدا دەستنیشانی بکا کە کێ چ بەرپرسیارەتییەك وەئەستۆ بگرێ، چونکە ئەو مەسەلەیە بە توانا و حەزەکانی هەر تاکێکەوە گرێدراوەتەوە. ئەو دوو کەسەی پێکەوە هاوسەرگیری دەکەن، ئەگەر لە سەر دابەشینی کار و ئەرکەکان ڕێککەون، دەبێ بتوانن لە گرێبەستەکەیاندا بیگونجێنن، واتە هەر ئەو شێوەیەی کە لە ڕێککەوتنە ئابوورییەکانی ئێمەدا باوە. ڕێککەوتن لە سەر ئەم جۆرە کارانە ئەستەم و دوور لە چاوەڕوانی نییە مەگەر ئەوەی کە ژن و مێرد ناتەبا بن و لەسەر کێشەیەك بە شەڕ بێن، کە لەم حاڵەتەدا پێوەندییەکەیان بەختەوەریی بەدواوە نابێ. دەستنیشانکردنی مافەکان هەرکامێکیان، سروشتییە کە دابەشینی ئەرکەکانی بەدواوە دەبێ و ئەوەش دەبێ لە سەر ڕەزامەندیی هەر دوو لایەن بێ و هەڵبەت عورف و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکانیش دەبێ بە شێوەیەکی هێمن و لە سەر ڕەزامەندیی هەر دووکیان لە بەر چاو بگیردرێن، بەڵام لە هەر حاڵدا یاسا نابێ خۆ لەوە هەڵقورتێنێ. بڕیاردان لە سەر مەسەلە جۆراوجۆرەکان بە گشتی لە ئەستۆی کەسێك دەبێ کە توانا و لێوەشاوەیی زیاتری هەبێ و ئەم شێوازە تەنانەت ئێستاش هەر لە ئارادایە و پێوەندیی بە ئۆتۆریتەی یاساییەوە نییە. هەڵبەت ئەو ڕاستییەی کە لە ژیانی هاوبەشدا تەمەنی پیاو لە ژن زیاترە، تای تەرازوو بە لای پیاودا دەشکێنێتەوە، لانیکەم ئەگەر شێوەی تێپەڕینی ژیان گرینگییەکی ئەوتۆی نەبێ. سەرەڕای ئەوە، سروشتییە ئەوەی بژێوی ماڵ دابیندەکا، چ ژن و چ پیاو، لە خۆیدا هێزێکی زیاتری هەیە. ئەو نایەکسانییەی لەم شێوازە سەرچاوە دەگرێ پێوەندیی بە یاسای هاوسەرگیرییەوە نییە، بەڵکو پێوەندیی بە بارودرخی کۆمەڵگە و سیستەمی ئێستایەوە هەیە. باڵاتر بوونی هزری، چ بە شێوەی تایبەت و چ بە شێوەی گشتی، هەروەها تۆکمەبوونی کەسایەتیی، ڕۆڵێکی دیاریکەریان لەم بوارەدا هەیە، ئەوەش دۆخێکە هەمیشە هەبووە. ئەم ڕاستییە بە ڕوونی دەریدەخا کە ژن و مێرد، وەکو ئەندامانی کۆمپانیایەك، بۆ خۆیان دتوانن دەسەڵات و بەرپرسیارەتییەکان لەنێوان خۆیاندا، دابەشکەن و ترس و نیگەرانی لەوەی کە نەکا چەتێك لە



کاروبارەکانیان بکەوێ، شتێکی بێ جێیە. دەسەڵات و بەرپرسیارەتییەکان جگە لەو شوێنانەدا کە پێوەندیی ژیانی هاوبەش بە شێوەیەکی نەگونجاو لە گۆڕێدایە، بە باشی دابەشدەکرێن. لە ژیانی هاوسەرێتیدا ئەوە نییە کە لایەنێك دەسەڵاتی ڕەها و بێ سنووری هەبی و ئەوی دیکەش ملکەچێکی تەواو بێ، مەگەر ئەوەی کە ئەم هاوسەرێتییە لە جەوهەردا هەڵە بێ، کە لەو حاڵەتەشدا جیابوونەوەیان (هەڵوەشانەوە) نیعمەتێکە بۆ هەردووکیان. لەوانەیە هێندێ کەس بڵێن کە هەر ئەم چارەسەرییەی کێشەکان بە شێوەی ئاشتیخوازانە، خۆی بەرهەمی چەپاندنێکی یاساییە کە هەردووك لایەن لێی ئاگادارن بە واتایەکیتر، هەلومەرجەکان لێرەدا وەکو ئەو هەلومەرجانەن کە خەڵك ناچار دەکەن ملکەچی بڕیارێك بن کە پشتئەستوورە بە دامەزراوێکی یاسایی ئەوتۆ، کە دەتوانێ بە گوێرەی پێویست ملیان پێ کەچ بکا. بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی دادپەروەرانە لێی بڕوانین، دەبێ بیر لە مەحکەمە (دادگا)یەك بکەینەوە کە کاری بە سەرچاوەی کێشەکە نییە. بەڵکو بەردەوام بەلای یەکیاندا، بۆ وێنە بە لای تۆمەتباردا، دەشکێتەوە، لێرەدا، کە سکاڵابەر جگە لە ملکەچی لە بەرانبەر وەها دادگەیەکدا هیچ چارەیەکی دیکەی نییە، دەبێتە هۆی ئەوەی تا ڕادەیەك مل بۆ هەر چەشنە دادوەرییەك کەچ بکا، لە حاڵێکدا پێگەی تۆمەتبار زۆر جیاوازە. ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی یاسا بە مێردی دەبەخشێ لەوانەیە یەکێك لەو فاکتۆرانە بێ کە ژن ناچار دەکا لە پێناو وەدەستهێنانی بەشێکی دەسەڵات هەر چەشنە ریککەوتنێك قەبوولبکا، بەڵام ئەو هۆکارە چییە کە پیاو ناچار بە ڕێککەوتن دەکا؟ ڕاستییەکەی ئەوەیکە هەمیشە ریککەوتنێك لەنێوان خەڵکی خۆشڕەفتاردا دێتە ئارا و تەنانەت ئەگەر هیچ کامیان لە ژێر گوشاری ئەخلاقی و یاساییش دانەبن دیسانیش ڕێگەی ڕێککەوتنیان هەیە. ئەو مەسەلەیە بە ڕوونی دەری دەخا کە مرۆڤ بە شێوەی سروشتی پاڵنەری وەهای تێدا هەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو بە دڵخوازی ژیانی هاوبەشی خۆی بە جۆرێك ڕێك بخا کە هەردووکیان پێی قایل بن، ئەم پاڵنەر و حەزانەش، بە گشتی و جگە لە هەلومەرجە ناڵەبارەکاندا، ئەوەندە بەهێزن کە ڕۆڵی دیاریکەریان لە ڕێکخستنی پێوەندیی نێوان ژن و مێرد دا هەیە. هەڵبەت ئەوەی باسمانکرد هەرگیز بەو مانایە نییە کە دەکرێ

حکوومەتێکی ئازاد لە سەر بنەمای یاسایەك دامەزرێ کە سەرەڕۆیی لایەنێك و ملکەچی و کۆیلەیی لایەنەکەی دیکە بە فەرمی دەناسێ و دەسەڵات بە دادوەر دەدا کە بتوانێ بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەك تەواوی ئەو پوان و مافانەی بە خەڵکی داون لێیان بستێنێتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە هەر چەشنە ئازادییەك لە سەر وەها بناخەیەکی لەرزۆك دامەزرابێ، بەهایەکی ئەوتۆی نییە، هەلومەرجەکەشی دادپەروەرانە نابێ، لە بەر ئەوەی یاسا بەردەوام لایەنی یەکێکیان دەگری و ئەوەش وەك ئەوە وایە کە کەسانێك لە سەر ئەوە رێککەوتبن کە یەکێکیان مافی ئەوەی هەبێ هەرچی حەزی لێ بوو بیکا و ئەوی دیکە هیچ مافێکی نەبێ، جگە لەوەی دڵی لایەنی مافپێدراو راگرێ و جگە لە یاسا، دەروەستبوونی ئەخلاقی و ئاییینیش ئەوی دیکە ناچار بکا پێ ملی هەر چەشنە ناهەقییەك بێ و لە هیچ حاڵەتێکدا سەرپێچی نەکا. دژبەرانی تۆخی مافی ژنان لەوانەیە بڵێن کە پیاوان لەگەڵ مەنتیق و قسەی حسێبین و بەبێ ئەوەی ناچار بن گەلێك پوانی باش دەدەن بە هاوسەرەکانیان. بەڵام ژنان ئاوا نین و ئەگەر یاسا مافێکیان بداتێ ﴿ئیتر ئەوان﴾ مافی لایەنی بەرانبەریان لە بەر چاو ناگرن و وەك دەڵێن کەس باشاریان ناکا. هەر بۆیەش، دەبێ جڵەوی ژنان لە دەست پیاواندابێ بۆ ئەوەی ناچار بن لە بەرەی خۆیان زیاتر پێ رانەکێشن. لە نێو نەسلەکانی پێشوودا گەلێك زۆر بوون ئەوانەی پەنایان بۆ ئەم چەشنە بەڵگاهێنانەوە دەبرد. لەو سەردەمەدا تەوس و پلار لە ژن گرتن شتێکی ئاسایی بوو و پیاوان پێیان وابوو ئەگەر ژنان لە بەر ئەو تایبەتمەندییانە لۆمە و سەرکۆنە بکەن کە خۆیان ﴿پیاوان﴾ تێیاندا دروستکردوون زیرەکییەکی ئێجگار زۆریان لە خۆیان نیشان داوە. بەڵام ئێستا ئەوی قسەکەی ولامهەڵگر بێ و بایەخی ولامدانەوەی هەبێ پەنا بۆ ئەم چەشنە بەڵگاندن و پاساوانە نابا. هەنووکە ئیتر ئەوە باو نییە کە بڵێن ژنان لە چاو پیاوان کەمتر خزم و کەسی خۆیان خۆش دەوێ و کەمتر بایەخیان پێ دەدەن. بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئێستا ئێمە هەر لە زمانی ئەوانەی کە هەرگیز دان بە یەکسانیی مافی ژن و پیاوان ناهێنن دەبیستین کە دەڵێن: ژنان لە پیاوان باشترن. هەر بۆیەش، ئەم وتەیە بووەتە جامەلۆسکێیەکی بێ تام کە دەیەوێ رواڵەتێکی پەسنبێژانە بە سووکایەتییەکی



راستەقینە بدات و لەو قسانەش دەچێ کە "گالیڤەر گوتەنی: شای لی لی پوت سەبارەت بە باشیی سۆز و دلۆڤانی دەیفەرموون و لە هەمان کاتدا بێ بەزەییانەترین بڕیاری دەردەکردن. ئەگەر ژنان لەشتێکدا لە پیاوان باشتر بن، ئەوا ئەو شتە، بێگومان لەخۆبوردوویيە لەپێناو ئەندامانی خێزاندا. بەڵام من هیچ کات پێداگر نابم لە سەر ئەم تایبەتمەندییەی ژنان، کە لە هەموو جێیەك وایان رادێنن کە لە بنەڕەتەوە بۆ فیداکاری خوڵقاون. من باوەڕم وایە کە یەکسانیی مافەکانی ژن و پیاو تا رادەیەك ئەو لایەنە تۆخەی فیداکاریی ژنان، کە ئێستا بووەتە یەکێك لە تایبەتمەندییە رواڵەتییەکانی کەسایەتیی ئەوان، کاڵتر دەکاتەوە و ژنێکی باش ئیتر لە فیداکارترین پیاوەکانەوە فیداکارترو لە خۆبوردووتر نابێ. لەلایەکی دیکەشەوە، بە جێگیر بوونی یەکسانیی مافەکانی ژن و پیاو، هەستی خۆپەرستیی پیاوانیش دادەبەزێ و ئەوانیش لە ئێستا فیداکارتر و لەخۆبوردووتر دەبن. چونکە ئەو جار فێری ئەوە ناکرێن کە دەنگ و رای خۆیان بپەرەستن و ئەوەندەیان بە لاوە گرینگ بێ کە چاوەڕێی ئەوە بن هاوسەرەکەیان کە ئەوەیش کەسێکی ژیر و تێگەیشتووە، رێز لەو یاسایە بگرێ. پیاوان هیچ شتێك وەکو ئەم خۆپەرستییە بە ئاسانی فێر نابن، ئەوەش تایبەتمەندییەکە، کە هەموو کەسە دەگمەنەکان و چینە تایبەتەکان (باڵاکان) هەیانە. هەر چەندی لە بازنەی مرۆڤایەتی دوورتر دەکەوینەوە خۆپەرستی زیاتر گیانمان دەتەنی و ئەم خۆپەرستییەش لە هەموان زیاتر لەو پیاوانە دایە کە هیچ کەسیان لە بەر دەست دانییە و وێناچێ ﴿ئیتر﴾ جیا لە ژن و منداڵە چارەڕەشەکەی خۆیان بە سەر کەسێکدا زاڵبن. رێژەی ئەو پیاوە شەرافەتمەندانەی ئەو رێسایە نایانگرێتەوە، کەمترە لە ریزپەڕی و ناوازەییەکانی دیکەی کەمایەییەکانی مرۆڤ. فەلسەفە و ئایین لە بری ئەوەی کە هەستی خۆپەرستیی پیاوان هەوسار بکەن بە گشتی داکۆکیی لێ دەکەن و هیچ شتێك ئەم کەمایەییەی مرۆڤ بنەبڕ ناکا، جگە لە باوەڕ بە یەکسانیی هەموو مرۆڤەکان - کە (ئەوەش) بۆچوونی مەسیحییەتە، کەچی مەسیحییەت هیچ کات بە کردەوە خەڵك فێری ئەوە ناکات، سەرەڕای ئەوەش، ئەو دامەزراوگەلەی بە لاوە پیرۆزە کە لە سەر بنەمای گەورەیی و زیاتر بوونی مرۆڤێك بە سەر ئەوی دیکەدا، بنیاتنراون.

بێگومان هەن ئەو پیاو و ژنانەی کە یەکسانیی لەگەڵ ئەوانیتر بە هیچ شێوەیەك قایلیان ناکا و هەتا بیروڕا و ویستێکی جیا لە ئی خۆیان لە ئارادا بێ شوێنەوارێك لە ئاشتی و هێمنی بەدی ناکرێ. ئەم کەسانە، نموونەی ئاشکرای ئەوانەن کە دەبێ یاسای تەڵاقیان لە سەر جێبەجێ بکرێ. ئەوانە شیاوی ئەوەن تەنیا و رەبەن بژین و هیچ کەسێك نەبێتە هاوبەشی ژیانیان. بەڵام ملکەچکردنی ژنان بووەتە هۆی ئەوەی کە لەم جۆرە پیاوانە لە نێو ژناندا نەك کەمتر، بەڵکو زیاتر، بەدی بکرێن. ئەگەر پیاو ئۆتۆریتە و هەموو دەسەڵاتی خۆی بە سەر ژندا بسەپێنێ، بە دڵنیاییەوە ژن خۆ راناگرێ، بەڵام ئەگەر بە هێمنی و ئارامی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێ و ئەو پێی وابێ کە دەسەڵاتداری پیاوە، هیچ هێزێك باشاری ناکا. یاسا، کە مافەکانی ژنی دەستنیشان نەکردوون و لە بواری تیۆریشەوە هیچ مافێکی بۆ لە بەر چاو نەگرتوون بە کردەوە ئەوە دەگەیەنێ کە سنووری مافەکانی ئەو هەر ئەوەندەیە کە بە مشووری خۆی دەتوانێ دەستەبەریان بکا.

یەکسانیی ژن و پیاو لە بەرانبەر یاسادا، تەنیا میتۆدێکە کە دەتوانێ بە شێوەی دادپەروەرانە پێوەندیی نێوانیان بپارێزێ و هەردووکیان بەختەوەر بکا، هەروەها تەنیا رێگەیەکە کە ژیانی رۆژانەی مرۆڤ، بە واتای بەرزی خۆی، دەکاتە قوتابخانەیەك بۆ پاکژکردنەوەی رەوشت و ئەخلاق. هەر چەندە لەوانەیە ئەو هەقیقەتە هەتا جێ دەکەوێ و هەموان وەریدەگرن، بەڵام تەنیا قوتابخانەیەك کە دەتوانێ هەستی رەسەنی ئەخلاقی لە نێو خەڵك دا پەرە پێ بدا، هاموشۆی نێوان کەسانی یەکسان و وەك یەکە.

پەروەردەی ئەخلاقیی رەگەزی مرۆڤ هەتا ئێستا بە گشتی بە پێی یاسای زۆرەملێ و زەبروزەنگ بووە و تا رادەیەك لەگەڵ ئەو پێوەندییانەی زۆرەملێ بەرهەمی دێنێ، شەقڵ و دەقی گرتووە. لەو کۆمەڵگەیانەدا کە هێشتا مەودایەکی ئەوتۆیان بەرەو شارستانییەت نەپێواوە، خەڵك تا رادەیەك لەگەڵ پێوەندیی دامەزراو لە سەر بنەمای یەکسانی نامۆن، یەکسانی بەلای ئەوانەوە دوژمنایەتییە. کۆمەڵگە لە بەرزترین هەتا نزمترین ئاستی خۆی، وەکو زنجیر یا پەیژەیەکی دوور و درێژ وایە، کە هەر کەسەی کەوتۆتە ژێر یا ژوور سەری دراوسێکەیەوە و لە هەر جێیەك کە ئەو بڕیاردەر نییە دەبێ



بەڕێوەبەری گوێڕایەڵ. سروشتییە کە مۆراڵەکانی ئەو کۆمەڵگەیانە لەگەڵ پێوەندییەکانی نێوان دەسەڵاتدارێتیی و فەرمانبردندا یەکدەگرنەوە. بەڵام زاڵبوون و گوێڕایەڵی ناشیرینترین و تاڵترین رەهەندی ژیانە و یەکسانی حاڵەتی سروشتیی کۆمەڵگەیە. هەنووکە لە جیهانی مودێرندا، کۆمەڵگەی مرۆیی ئەوەندەی بەرەو پێشکەوتن هەڵدەکشێ، زاڵبوون و گوێڕایەڵی زیاتر دەبنە واقیعگەلێکی دەگمەن و پێوەندیی یەکسانی دەبێتە رێسایەکی گشتی. ئەخلاقیاتی مرۆڤ لە قۆناخە سەرەتاییەکاندا گوێڕایەڵیی لە بەرانبەر زۆرەملێدا بە لاوە پەسند بوو، لە قۆناغەکانی دواتریشدا ئەخلاقیاتی ئەو، برەویی بەوە دەدا کە هەژاران لە لەخۆبوردەیی و پشتیوانیکردنی دەستڕۆیشتووەکان سوودمەندبن. کۆمەڵگە و ژیانی مرۆیی هەتا کەی دەتوانێ بەو ئەخلاقیاتە قایل بێ کە بۆ قۆناخی بەر لەو هاتووتە ئارا و داڕێژراوە؟ هەتا ئێستا دوو چەشنە مۆراڵ بە سەر کۆمەڵگەدا زاڵ بووە: ئەخلاقی سەر بەردانەوە و ملکەچی و ئەخلاقیی جوامێری و لەخۆبوردوویی، ئێستاش کات و سەردەمی ئەخلاقێکە لە سەر بنەمای دادپەروەری دامەزرابێ. لە چاخەکانی رابردوودا هەر کات روانگەیەکی یەکسانخوازی بە نیسبەت کۆمەڵگە هەبووە، تەنانەت لە چاکترین کۆمارەکانیشدا، یەکسانی تەنیا لەنێو هاووڵاتییانی ئازاد و سەربەست و نێرینەدا لە ئارادابووە. کۆیلە و ژنان و ئەو کەسانەی مافی دەنگدانیان نەبوو لە یەکسانی بێ بەش بوون و یاسای زۆرەملێ بەشیان بوو. کاریگەریی شارستانییەتی رۆم، هەروەها ئاییینی مەسیحییەت بووە هۆی دادپەروەری بە بنەمای چاکە دانراوە. لە کۆمارەکانی کەوناردا دۆخەکە هەر بەم چەشنە بوو. بەڵام لە نێو چوونی ئەم جیاوازییانە و لە جیهانی تیۆری و (تا رادەیەکیش لە جیهانی کردەوەدا) جیاوازیگەلێکی نوێ جێگەیان بگرنەوە، ئەو جیاوازییانەی لە سەر بنەمای رەگەزی و پێگەی کۆمەڵایەتی بنیات نرابوون. ئەو کۆسپانەی دەستیان بە داڕمان کردبوو، لەگەڵ هێرشی خەڵکی باکوور و هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریی رۆم بۆ جارێکی دیکەش ژیانەوە و تەواوی مێژووی ئەورووپا ئەوە دەردەخا کە هەرەسهێنانی ئەم کۆسپ و لەمپەرانە لە پرۆسەیەکی وردە وردە و هێمندا روویداوە. ئێمە هەنووکە خەریکین پێ دەنێینە قۆناغێکەوە کە دیسانیش دادپەروەری بە بناغەی

چاکە دادەنیٚ و ئەم دادپەروەرییە هەروەك رابردوو لە سەر بنەمای یەکسانی دامەزراوە، بەڵام پێوەندیی هاودڵی و هاوسۆزانەشی پێوە زیاد بووە. سەرچاوەی ئەم دادپەروەرییە بە پێچەوانەی رابردوو لە وارسکەی پاراستنی جەوهەردا نییە بەڵکو لە هاودڵییەکی پەروەردەکراوەوە سەرچاوە دەگریٚ کە لەنێوان کەسانی یەکسان و وەك یەکدا هاتۆتە بەرهەم و ئێستا هیچ مرۆڤێك لە هەرێمی ئەم دادپەروەرییە دەرناکری و پێوەندانگێکی یەکسان هەموو مرۆڤەکان لەخۆ دەگریٚ. ئەو راستییە کە مرۆڤ ناتوانیٚ پێشبینی گۆڕان لە رەوش و ژیانی خوێدا بکا و باوەر و سۆزەکانی لەگەڵ رابردوو یەك دەگرنەوە نەك لەگەڵ داهاتوو، دیاردەیەکی نویٚ نییە. دیتنی داهاتوو هەمیشە نیعمەت و پێدراوێك بووە کە ئیلیتە فیکرییەکان و ئەوانەی زانستیان لیٚ فێر بوونە، خاوەنی بوون و ئاگاداربوون لە هەستی خەڵکی داهاتوو، تایبەتمەندیی ئیلیتگەلێکی دەگمەن و هەڵکەوتوویە، کە ئەویش گەلیٚ جاران جەزرەبە و تەنانەت شەهیدبوونیشیانی بە دواوە بووە. دامودەزگا و نەریت و کتێب و قوتابخانەکان و بە گشتی کۆمەڵگە، بە پێی دابونەریتی رابردوو خەڵکیان پەروەردە دەکرد و هەڵوێستیان لەهەمبەر بارودۆخێکی کە هێشتا نەگەیشتووە و تەنیا لە حاڵی هاتن دایە، روونە، بەڵام گەورەیی راستەقینەی مرۆڤەکان لەوەدایە کە پێکەوە و وەك بوونەوەرگەلێکی یەکسان بژین و هەرچی بۆ خۆیان پێیان خۆشە و حەزیان لێیە بۆ خەڵکیشیان پیٚ‌خۆش بیٚ و زاڵبوون و ئۆتۆریتە، لە هەر فۆرمێك دابیٚ، بە پێویستییەکی دەگمەن و ناوازە و بە گشتی بە شتێکی تێپەڕی بزانن و تا ئەو جێیەی دەتوانن لەگەڵ کەسێك هەستن و دانیشن کە رێبەری و پەیڕەوی ﴿بالاٚ دەستی و بندەستی﴾ بەنۆرە و دوو لایەنە بیٚ. لە کۆمەڵگەی مرۆییدا، بەو جۆرەی ئێستا رێکخراوە، ئەم باشییانە، بە هیچ شێوەیەك برەویان پێنادریٚ و پشتگیرییان لیٚ ناکریٚ. خێزان قوتابخانەی سەرەڕۆییە تێیدا لایەنە چاك و خراپەکانی سەرەڕۆیی لە ئاستێکی بەربڵاودا هاندەدەن و گەشە دەستێنن. هاووڵاتی بوون لە وڵاتانی ئازاددا، تا رادەیەك لە ئاستی کۆمەڵگەدا پەرە بە یەکسانی دەدا. بەڵام هاووڵاتی بوون تەنیا بەشێك لە ژیانی مودێڕن پڕ دەکاتەوە و بە هیچ شێوەیەك ناچێتە نێو خووخدەی رۆژانە و سۆزە دەروونییەکانەوە. خێزانی بە مەرجێك لە سەر بنەمایەکی دادپەروەرانە بنیات



بنریٚ، دەبێتە قوتابخانەی راستەقینەی ئەو چاکە و مەزنایەتییانە کە بەئازادییەوە گریٚ دراون و هەڵبەت دەتوانیٚ بۆ هەموو شتێکی دیکە قوتابخانە بیٚ. بەڵام لە هەر حاڵێکدا بیٚ، قوتابخانەی فەرمانبردنە بۆ منداڵان و بۆ گەورەکانیش قوتابخانەی بڕیاردان. بەڵام خێزان بەر لە هەر شتێك دەبیٚ قوتابخانەیەك بیٚ بۆ پرۆڤەی یەکسانی و ژیانی هاوبەشی پڕ لە خۆشەویستی و بەبیٚ زاڵبوونی لایەنێك و ملکەچی و گوێڕایەڵی لایەنێکی دیکە. هەڵبەت ئەوانە پێوەندیگەلێکن کە دەبیٚ لەنێوان دایك و باوکاندا هەبن. بەمجۆرە، خێزان دەبێتە شوێنێك بۆ پرۆڤەی ئەو مەزنایەتییانە (فەزیلەتانە)ی کە پێویستە هەر کەسەی لە ناخی خۆیدا پەروەردەیان بکا و لە هەموو هەستان و دانیشتن و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا بە کاریان بێنیٚ. هەروەها دەبێتە سەرمەشق و نموونەیەکیش بۆ منداڵان، کە دەبیٚ بۆ ماوەیەك گوێڕایەڵی دایك و باوکیا بن بۆ ئەوەی ئەم سۆز و باوەڕ و رەوشت و ئاکارانە فێر بن و وەها خووی پیٚ بگرن کە بەلایانەوە سروشتی بنوێنن. پەروەردەی ئەخلاقیی مرۆڤ هەرگیز ئەوەندە بەرز نەبۆتەوە کە شیاوی ژیانێکی ئەوتۆ بیٚ کە هەموو پێشکەوتنەکانی مرۆڤ تەنیا پێشەکییەك بن بۆ ئەو، ئەویش وەدی نایە مەگەر ئەوەی کە خەڵك لە ماڵێشدا بە پێی ئەو پرەنسیپە ئەخلاقییانە بجووڵێنەوە. کە لەگەڵ پێکهاتەی ئاسایی کۆمەڵگە یەکدەگرنەوە. ئەو پیاوەی کە دەسەڵاتی رەهای بە سەر نزیکترین و خۆشەویسترین کەسی خۆیدا هەیە، لەوانەیە هەست بە ئازادی بکا، بەڵام ئەم هەستە جیاوازە لە عەشقی رەسەن یا مەسیحیایی بە نیسبەت ئازادی و هەر ئەو شتەیە کە لە چاخی کۆن و سەدەکانی ناڤینندا باو بووە، واتە خۆ بە گرینگ و خاوەن شکۆ زانین. وەها هەستێك دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاك لەو کۆت و بەندانە بێزار بیٚ کە ئەو و ئازادییەکانی بەرتەسك دەکەنەوە، بەڵام لە رووی تیۆری و بۆچوونەوە دژیان نەبیٚ و هەوڵبدا هەر ئەوانە لە پێناو پێگە و بەرژەوەندییەکانی خۆی دا بە سەر خەڵکدا بسەپێنیٚ. من قەبوولمە (و بنەمای هەموو هیواکانیشمە) ئەوەی کە رێژەیەکی زۆر لە سەربەرزی هاوسەرەکان، سەرەڕای هەبوونی یاساکان، گیان و جەوهەری یەکسانی بە سەر ژیانیاندا زاڵە (و لەوانەیە بەشێکی زۆری چینە بەرزەکان بەمجۆرە بن). یاساکان قەت باش نابن مەگەر ئەوەیکە کەسانێکی زۆر هەستی ئەخلاقییان لە یاساکانی ئێستا

سەرتربێت، ئەم جۆرە کەسانە دەبێ پێملی ئەو بنەمایانە بن کە لەم دەفتەرەدا هاتنە گۆڕێ و قسەیان لە سەر کرا. پرەنسیپگەلێك کە مەبەستیانە ژیانی هەموو ژن و مێردەکان بە جۆرێك رێکخەن کە لە ژیانی ئەوان بچێ. بەڵام تەنانەت ئەوانەشی کە خۆیان دەروەستی پرەنسیپە ئەخلاقییەکانن، ئەگەر خاوەن هزر و تێفکرین نەبن، پێیان وادەبێ کە ئەو یاسا و نەریتانەی خۆیان ئەزموونیان نەکردوون، هیچ شوێنەواری خراپیان نابێ و تەنانەت شوێنەواری ئەرێنی و باشیان لی دەکەوێتەوە و بەباشیان بزانن نییە دژایەتییان بکرێ (بە تایبەت ئەگەر بە رواڵەت وا بنوێنێ کە خەڵك بە گشتی باشن). بەڵام ئەم ژن و مێردانە زۆر لە هەڵەدان، چونکە ئەوان تەنانەت ساڵێ جارێکیش بیر لەو هەلومەرجە یاساییە ناکەنەوە کە ژیانیان لە سەر دامەزراندووە و وا هەست دەکەن بە جۆرێك دەجووڵێنەوە کە وەك بڵێی لە بەر چاوی یاساشدا یەکسانن و پێیان وایە هەموو ژن و مێردەکان وەك ئەوانن، مەگەر ئەوەی مێردی ژنێك زۆر ناجسن و بەدفەڕ بێ. ئەو گومانە، نیشانەی تێ نەگەیشتنە لە سروشتی مرۆڤ و واقیعەکان. ئەوەندەی پیاوێك بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات نەگونجاوترو نالێهاتووتر بێ (بە واتایەکی دیکە، هەرچەندە تاك کەمتر ئۆتۆریتەی خۆی بە سەر کەسێکی دیکەدا بسەپێنی و ئەویش بە حەز و رەزامەندییەوە وەریگرێ) تێگەیشتن و هۆشیارییەکەی بە نیسبەت ئەو دەسەڵاتەی کە یاسا پێی داوە زیاتر دەبێ و هەوڵدەدا تا ئەو جێیەی رێساکان*[1] رێی پێ دەدەن کەڵك لە مافی یاسایی خۆی وەرگرێ و بۆ ساتێکیش خۆی لە چێژی کەڵکوەرگرتن لەو ماف و دەسەڵاتە بێبەش نەکا، تەنیا لە بەر ئەوەی کە هەستی شیرینی دەسەڵاتدارێتیی لەخۆیدا زیندوو راگرێ. لەوەش خراپتر ئەوەی کە لەنێو پەروەردەنەکراوترین و توندوتیژترین کەسی خەڵکانی چینەکانی خوارەوە دا، کۆیلەیی یاسایی ژنانو زاڵبوون بە سەریاندا بە هۆی هێزی جەستەییەوە، دەبێتە هۆی ئەوەیکە پیاوان بە بێزاری و بە چاوی سووکەوە لە ژنەکانیان بڕوانن، وەك ئەوەی هیچ ژنێکی دیکە، یان هیچ مرۆڤێکیتر لە بەر چاویان ئەوەندە سووك نەبێ و ژن بە لایانەوە لە بوونەوەرێك دەچێ کە دەکرێ هەر چەشنە

---

١- هەڵبەت رێسای پیاوگەلێکی لە گوێن خۆی.



سووکایەتییەکی پێ بکرێ. هەر بینەرێکی ورد و هۆگر لە سەرێتی کە ئەگەر دەرفەتی بوو بە ناخی ئەم بابەتەدا رۆبچێ، خۆی شەنوکەوی بکا و بزانێ ئەوەی ئێمە باسمانکردووە راستە یان نا، ئەگەر بۆی دەرکەوت کە ئێمە بە هەڵەدا نەچووین، ئەو کات پێی سەیر نابێ کە بۆچی ئەو نەریتگەلەی بە پێی سروشتی خۆیان مێشك و زەینی مرۆڤ ئاوا بەرەو گەندەڵی و لەنێوچوون دەبەن، دەکەونە بەر رق و بێزاریی. لەوانەیە پێمان بڵێن ئایین لە سەر ژنی فەرز و واجب کردووە ملکەچی مێردەکەی بێ. دەسەڵاتی پیاو بە سەر ژندا لەو واقیعە جێگیربوانەیەکە بە هیچ شێوەیەکی دیکە بۆ داکۆکیلێکردن نابێ، مەگەر ئەوەی کە وەك بڕیارێکی ئایینی چاوی لێبکەین. دیارە گومان لەوەدا نییە کە کلێسە وەها بڕیارێکی داوە، بەڵام ئەستەمە وەها بڕیارێك بخەینە ئەستۆی مەسیحییەت. دەڵێن پولسی قەدیس (بەرامبەر "وەلی" لە ئایینی ئیسلامدا) گوتوویەتی:"ئەی ئافرەتان، ملکەچی مێردەکانتان بن". بەڵام هەر ئەویش گوتوویەتی:"کۆیلەکان، ملکەچی ئاغاکانتان بن". بەڵام پۆلس لە سەری بوو پەرە بە مەسیحییەت بدا و ورووژاندنی خەڵك دژی یاساکان نە ئەرکی ئەو بوو و نە لەگەڵ مەبەست و ئامانجەکەشی یەکی دەگرتەوە. ئەوەیکە پۆلس تەواوی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆی قەبووڵ بووە، بەو واتایە نییە کە ئەو دژی ئەو هەوڵ و چالاکییانە بووە کە لە کاتی گونجاو دا بە مەبەستی چاکسازی و باشترکردنی ئەم دامەزراوانە بەڕێوەدەچن. ئەگەر بەمجۆرە بیری لێ بکەینەوە وەك ئەوە وایە کە بڵێین بە دەرکردنی ئەم بڕیارە کە "ئەو خودایە ئەم دەسەڵاتەی دیاری کردووە" پاوانخوازیی سیستەمێکی بە پیرۆز کردووەو ئەوەیە فۆرمی مەسیحییەتی دەسەڵاتی سیاسیی وەها سیستەمێك و دەبێ ملکەچی بێو پەیرەویی لێ بکرێ. ئەگەر بڵێین مەسیحییەت ویستوویەتی ئەو فۆرمانەی دەسەڵاتی سیاسی و دامەزراوە کۆمەڵایەتییانەی کە هەبوون وەك نموونە بناسێنی و لە گۆڕان بیانپارێزێ بەو مانایەیکە مەسیحییەتمان هەتا ئاستی نزم.... یا ئاستی ئایینی بەرەهمەنی دابەزاندوە. مەسیحییەت قەت شتی وای نەکردووە لە بەر ئەوەیکە ئەو ئایینە ئایینی قۆناخێکی مرۆڤایەتییە کە گۆڕان و پێشکەوتن تێیاندا مەجالی پتری بووە. لە حالێکدا ئایین... و بەرەهمەنی و شتی لەم جۆرە، تایبەت بوون بە کۆمەڵگە چەقبەستووەکان و تەنانەت

ئەو کۆمەڵگەیانەی بەرەو داکشان و لەنێوچوون ڕۆیون. (چونکە کۆمەڵگەی تەواو چەقبەستوو بوونی نییە). هەڵبەت لە مێژووی مەسیحییەتدا لە هەموو قۆناخەکاندا، کەم نەبوونە ئەوانەی ویستوویانە و هەوڵیانداوە مەسیحییەت بکەنە ئایینێکی لەم چەشنە، واتە ڕێگەی هەر چەشنە پێشکەوتنێکمان لێ بگرن. ئەوانە گەلێك بەهێز بوون و زۆر خوێن لە ڕێگەی خەبات دژی ئەوانەدا ڕژاوە. بەڵام کۆمەڵگەی مەسیحی بە توندی لەبەرانبەریاندا ڕاوەستاوە و هەر ئەم خۆڕاگرییەش ئێمەی گەیاندۆتە ئەو ئاستەی کە دەیبینین و دەمانگەیەنێتە شوێنێك کە دەبێ بگەینێ. ئێستا کە مەسەلەی ملکەچیی بە زۆرەملێی ژن لە مێردمان تاوتوێ کرد ئیتر بێهوودەیە لە سەر شتێکی تایبەتیتر کە (ژن مافی ملکایەتیی ماڵ و سامانی خۆی هەیە ﴿یان نا﴾ ) قسە بکەین، کە پاژێکە لەو مەسەلە گشتییە. چونکە هیچ هیوام بەوە نییە ئەو نامیلکەیە چووکترین ئاڵوگۆڕ لە باوەڕی ئەوانەدا وەدی بێنێ کە هێشتا دانیان بەوەدا نەناوە کە ژن خاوەنی ئەو ماڵ و سامانە بێ کە بە میرات پێی گەیشتووە یا خۆی بە دەستی هێناوە. ئەو مافەی ئەو پاش هاوسەرگیریش هەر لە جێی خۆی دەبێ. شتەکە زۆر ساکارە: ئەو سەروەت و سامانەی ژن و پیاو بەر لە هاوسەرگیری هەیانە دواتریش دەبێ تایبەت بە خۆیان بێ. بەمجۆرە، ئیتر پێویست ناکا بۆ پاراستنی ماڵ و سامانی ئافرەت و هەبوونی مافی ئەوەی کە بە ناوی منداڵەکانی بکا، پرس بە مێردەکەی بکرێ و گرێبەستی لەگەڵ بکرێ. هێندێ کەس بە بیستنی ئەو پێشنیارە کە ژن و پیاو دەبێ ماڵ و سامانەکەیان لێك جوێ بکەنەوە سەریان دەسوڕمێ و ئەوە لەگەڵ ئەم ڕەوشە ئایدیالییەدا کە "ئەوان گیانێکن لە دوو جەستە دا" بە ناتەبا دەزانن. ئەمن خۆم لەو کەسانەم کە بڕوایان بە هاوبەشبوونی ماڵ و سامانی ژن ومێردە. بەڵام بە مەرجێك ئەم هاوبەشییە بەرهەمی باوەر و هەستی یەکیەتی و یەکبوونی ژن ومێرد بێ، چونکە تەنیا ئەم هەستەیە کە ئەوان لە هەموو شتێکدا هاوبەش و بەشدار دەکا. بەڵام ئەگەر ئەم هاوبەشییە لە ماڵ و ساماندا، پشتی بەو تێزەوە گەرم بێ کە دەڵێ: هەرچی من هەمە ئی تۆیە، بەڵام ئەوی تۆ هەتە ئی من نییە (ئی خۆم بۆ خۆم، ئی تۆش دەخۆم)، بە لای منەوە شتێکی پەسەند و جوان نییە و من وام پێ باشە خۆ لە قەبوولکردنی وەها گرێبەستێك ببوێرم، تەنانەت



ئەگەر خۆم قازانجیشم تێیدا بێ. ئەو نادادپەروەری و زوڵمەی لەم ڕووەوە لە ژنان دەکرێ، بە ڕای گشتیی خەڵك، لە زوڵمەکانی دیکە بەرچاوترە و دەکرێ ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزینەوە، بەبێ ئەوەی ناوێك لە زوڵمەکانی دیکە بێتە گۆڕێ و گومان لەوەدا نییە کە ئەو یەکێك لە یەکەمین زوڵمەکان دەبێ کە ژنان لێی ڕزگار دەبن.

هەنووکە (سەردەمی میل) لە زۆربەی هەرێمە کۆن و نوێیەکانی کۆنفیدراسیۆنی ئەمریکا ڕێساگەلێك دانراون، تەنانەت لە یاسای بنەڕەتیشدا گونجێندراون، کە یەکسانیی مافی ژن و پیاو لەم بوارەدا دەستەبەر دەکا. هەر لەم ڕێگەیەشەوە، دەبێتە هۆی باشتربوونی ڕەوشی ژیانی ژنان لە دوای زەماوەندکردن (لانیکەم ڕەوشی ئەو ژنانەی کە خاوەن ماڵ و سامانن)، چونکە ئیتر دوای مێردکردن یەکێك لە ئامرازەکانی دەسەڵات لە دەستیان دەرناچێ. جگە لەوەش، ئەم یاسایانە پێش بەربەوە دەگرن کە هێندێ پیاو کەڵکی خراپ لە نەریتی ژنهێنان وەرگرن. کەم نین ئەو پیاوانەی بەو مەبەستە تەماح وەبەر کچێك دەنێن مێردیان پێ بکا کە تاکە ئامانجیان ئەوەیە دواتر ماڵ و سامانەکەیان پێ ببرێ. ئەم پیاوانە بە زۆری بە فرتوفێڵی جۆراوجۆر بەر لە هاوسەرگیری خۆ لە نووسینی ڕێککەوتنی دارایی دەبوێرن. لەو بوارانەدا کە ژیانی خێزان نەك لە ڕێگەی ماڵ و سامانەوە بەڵکو لە ڕێگەی داهات و حەق دەستەوە دابین دەبێ. پێموایە ئەوەی ئێستا باوە، بە گشتی، گونجاوترین شێوەی دابەشینی کارە لەنێوان ژن و پیاودا. پیاو بژیوی ژیانی خێزان دابین دەکا و ژنیش چاوەدێری بە سەر تێچوو و خەرجییەکاندا دەکات. ژنێك کە جگە لە زاوزێ کردن بەرعۆدەی چاودێری و پەروەردەی منداڵەکانیشە، ئەگەر هەوڵبدا باشترین کەڵك لە داهاتی پیاوەکەی وەربگیردرێ و وا بجووڵێتەوە کە ژیانی بنەماڵە ئاسوودەتر بکا، نەك بەڕادەی بەشی خۆی بەڵکو لە بەشی خۆیشی زیاتر، ڕۆح و جەستەی خۆی ناوەتە خزمەتی ژیانی هاوبەشیان. ئەگەر ژن سەرەڕای ئەوانە ئەرکی دیکەش وەئەستۆ بگرێ، ئەستەمە باری ئەو ئەرکانەی لە سەر شان سووك بێ کە باسمان لێکردن هەر ئەوەندەیە لەوانەیە نەتوانێ ئەرکەکانی پێشووی بە باشترین شێوە ڕاپەڕێنێ. ئەوەی ئەو بە مەبەستی پاراستنی منداڵ و ڕێکوپێککردنی کاروباری نێومالّی دەیکا، شتێکە بە هیچ کەس ناکرێ و ئەگەر ئەو جگە لەو کارە خەریکی

کارێکی دیکەش بێ، ئەو مندالآنەی بە زیندوویی دەمێننەوە بە باشترین شێوە پەروەردە دەکرێن. بەلآم لەوانەیە گەلێك گرفتی گەورە لە بواری بەڕێوبردنی کاروباری مالەوەدا بێتە پێشێ بە جۆرێك کە مالێ تووشی زیانی ئابووریش بێت و بە داهاتی ژنەش قەرەبوو نەکرێتەوە. هەر بۆیەش، ئەگەر هەلومەرجەکە دادپەروەرانە بێ، پێموایە، شتێکی زۆر باش نییە کە ژنە بە کار و تێکۆشانی خۆی لە داهاتی خێزان زیاد بکا. هەلبەت لە هەلومەرجی نادادپەروەرانە دا، زۆر وا هەیە ئیش و کاری ئافرەت بە قازانجی خۆی بێ، چونکە لە لای پیاو، کە بە پێی یاسا ئاغایەتی، ڕێز و حورمەتی زیاتر دەبێ، بەلآم لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو رەوشە ڕێگە بۆ پیاو خۆش دەکا کە دیسانیش لە کەلکی خراپ وەرگرتن لە دەسەلآتی خۆیدا زیاتر بچێتە پێش، بەو واتایە کە ژنەکەی ناچار بکا کار بکات و دابینکردنی بژیوی مالێ بخاتە ئەستۆی ئەو و خۆی نوقمی مەی نۆشی و تەوەزلی بێ. ئەو ئافرەتەی داهاتی سەربەخۆی نییە، بێگومان توانایی وەدەستهێنانی داهات، ڕێز و حورمەتی زیاتری پێدەبەخشێ. بەلآم ئەگەر گرێبەستێك بێ لەنێوان کەسانێك کە مافی یەکسانیان هەیە و بە مانای دەروەستبوون بە ملکەچی لە هەمبەر پیاودا نەبێ و ئەگەر ئەوانەی کە زەماوەند هاوسەر بە لایانەوە شتێکی خراپە، زەماوەندکردنیان بە سەردا نەسەپابێ و ئەگەر هەر ژنێکی رەوشت بەرز بتوانێ بە پێی هەلومەرجی دادپەروەرانە لە مێردەکەی جوێ بێتەوە، (من جارێ باس لە تەلآق ناکەم)، و ئەگەر هەموو ژنێك وەکو پیاوان بتوانن کاروباری ئابڕومەندانە وەئەستۆ بگرن، ئیتر بە پێویستی نازانێ بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی خۆی بە درێژایی ژیان بە مەبەستی دەستەبەر کردنی داهات کەلك لە تواناکانی وەرگرێ. ئەو ژنەی شوو دەکا و بڕیار دەدا پەروەردەی مندالّ و بەڕێوەبەریی مالێ وەئەستۆ بگری و بە گوێرەی پێویست هەموو هێز و توانای خۆی لەم بوارەدا دەکاردەکا، نەك لە تەواوی ئیش و ئامانجەکانی بەلکو چاو لەو ئامانج و کارانە دەنوقێنێ کە لەگەلّ ئیشی سەرەکیی ئەو ناتەبان، وەها ژنێك وەك پیاوێك وایە کە کارێك هەلدەبژێرێ. بەمجۆرە ئەو ئیش و کارانەی کە بە پێی عادەت یا بە پێی پەروەردە و دیسیپلینی پێویست، لەمالێدا ناکرێن و پێویستە لە دەرەوەی مالێ بەڕێوەبچن، بە کردەوە دەستی بەشی هەرەزۆری ژنانی خێزانداریان پێ ڕاناگا. بەلآم



دەبێ ئەوپەڕی ئازادی هەبێ بۆ ئەوەی یاسا گشتییەکان لەگەلّ توانا و تایبەتمەندییەکانی تاك یەك بگرنەوە و هیچ شتێك نابێ ئەو ئافرەتانەی پەیمانی هاوسەرێتییان بەستووە بەلآم تواناکانیان لە بوارێکی دیکەدا خستۆتەگەڕ لە ئیشی دلخوازیان بێبەشیان بکا. ژن لەوەها دۆخێکدا لەوانەیە نەتوانێ وەکو خاتوونی نێومالّ ئەرکە ئاساییەکانی خۆی بە باشترین شێوە ڕاپەڕینێ. کە لەم حالەتەشدا دەکرێ مشوورێکی بۆ بخورێ کە خەوش لە هێمنی و تەبایی خێزان نەکەوێ. ئەگەر زەمانێك بیروڕای کۆمەلگە لە ئاقارێکی دروستدا لە سەر ئەو مەسەلەیە بێ، دەکرێ ڕێکخستنی ئەمجۆرە کاروبارانە بە بیروڕای گشتی بسپێردرێ. بەبێ ئەوەی پێویست بێ یاسا خۆی تێهەلقورتێنێ.

..............................................................

# بەشی سێهەم

شتێکی دیکەی کە لەپێوەندی لەگەڵ یەکسانیی ژنان و پیاواندا لە گۆڕێ دایە، دەستپێڕاگەیشتنی ژنانە بەو کاروبارەی کە هەتا ئێستا لە پاوانی ڕەگەزی بەهێزتر دابوون. من پێم وایە ئەو کەسەی یەکسانیی مافی ژن و پیاوی لە نێو خێزاندا قەبووڵکردووە، ئەستەم نییە لەم بوارەشدا قەناعەتی پێ بهێندرێ. ئەو کەسانەی کە پێداگری لە سەر ئەوە دەکەن کە ژنان جگە لە نێو خێزاندا لە هیچ بوارێکی دیکەدا توانایان نییە، مەبەستی سەرەکییان ئەوەیە، کە لە ژیانی خێزانیدا هەر لەژێردەستەییدا بیانهێڵنەوە. چونکە پیاوان بە گشتی هێشتا بە لایانەوە ئەستەمە ئەوە قەبووڵبکەن کە لەگەڵ کەسێکی خۆیان دەژین. پێموایە ئەگەر وانەبوایە، بە سەرنجدان بە واقیعەکانی نێو گۆڕەپانی سیاسی و ئابووری، هەموو کەسێك ئەوەی قەبووڵدەکرد کە بێبەشکردنی ژنان لە بەشێکی زۆری کاروبار و پیشە بە سوودەکان، هەروەها بێبەش کردنیان لە هەموو ڕۆڵ و دەورە کۆمەڵایەتییە گرینگەکان، نادادپەروەری و زوڵمێکی گەورەیە دەرهەق بە نیوەی ڕەگەزی مرۆیی بە تایبەت لەوەدا کە ژنان تەنیا بە هۆی ژن بوونیان لە ئیش و پیشەگەلێك بێبەش دەکرێن کە یاسا تەنانەت گەمژەترین پیاویشی لێ بێبەش و بێبەری ناکا. ژنان تەنانەت لەو ئیش و پیشەگەلەش دەگێردرێنەوە کە دەرکەوتووە بۆیان گونجاوە ﴿ئەوەش تەنیا بۆ ئەوەی کە﴾ لەم بوارانەدا بەرژەوەندییەکانی پیاو بە شەقڵ نەشکاوی بمێننەوە. لە دوو سەدەی رابردوو دا، لە هێندێ بواردا کە هەست پێدەکرا دەبێ ئەم بێبەش کرانەی ژنان بە پێی بەڵگە و فاکتۆرگەلێك بن کە ئەم بەڵگانە تەنیا ڕوونکردنەوە و وەسفێکی واقیعە هەنووکەییەکان نەبن، ئیتر بە دەگمەن باس لە کەم عەقڵیی ژنان دەکرا. ئەگەر لە گۆڕەپانی گشتیی ژیاندا بەرخودانێك هەبوایە کە تێیدا تواناکانی تاکەکان لە



تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەدا هەڵسەنگێندرابان (و ژنان لەم تاقیکردنەوەیەدا بێبەش نەکرابان) هیچ کەسێك بە ڕاستی لە سەر ئەم باوەڕانە سوور نەدەبوو. ئەو هۆکار و پاساوەی ئەودەم بۆ بێبەشکرانی ژنان دەخرایەڕوو ئاماژەی بە کەمتوانایی ژنان نەدەکرد، بەڵکو پێی لە سەر بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە دادەگرت، کە دیارە ئەویش، مەبەست بەرژەوەندیی پیاوان بوو. ڕاست وەك ئەوەی کە بەرژەوەندیی دەوڵەت و پشتیوانی لە دەسەڵات پاساو و بیانوویەکی بەهێز بوو بۆ دزێوترین جەنایەتەکان. بەڵام لەم سەردەمەدا، هێز، زمانێکی نەرمتری هەلبژاردووە و شتەمێك لە هەرکەسێ بکات بانگەشە دەکات کە لەبەرژەوەندی خۆیدایە. هەر بۆیەش، کاتێك لە ڕاپەڕاندنی کارێکدا پێش بە ژنان دەگیردرێ، گومان دەکرێ کە واباشە بگوترێ و خەڵکیش باوەڕ بکەن، کە ئەوان وەها کارێکیان لە دەست نایە و ئەگەر حەزیان لە کردنی بێ، لە ڕێگەی ڕاستەقینەی سەرکەوتن و بەختەوەری دوور دەکەونەوە. بەڵام ئەگەر هات و ئەو پاساوە ماقووڵ (ناڵێم باوەڕپێکراو) (معتبر) هاتە پێش چاو. ئەوانەی پێیان باشە دەبێ حازر بن لە پانتاییەکی ئەوتۆدا بیهێننە گۆڕێ کە هەتا ئێستا هیچ کەسێك نەیوێراوە بە سەرنجدان ئەزموونەکان، لەوەها پانتاییەکدا دژی بووەستێ. هەر ئەوەندە بەس نییە بڵێین ژنان لە ئاستی نێونج دا و لە هێندێ لە توانا زەینییەکاندا کەمتواناترن لە پیاوان، بە واتایەکی دیکە هەر ئەوەندە بەسە نییە بڵێین: لە نێو ژناندا، لە چاو پیاوان، بە دەگمەن هەڵدەکەون کە بتوانن ئەو پیشە و کارانە بەڕێوەبەرن کە پێویستیان بە توانایی زەینی زۆر باش هەیە. ئەوانە دەبێ بیسەلمێنن کە هیچ ئافرەتێك بۆ ئەم ئەرکانە گونجاو نییە و بەناوبانگترین ئافرەتان لە باری ژیرییەوە، لاوازترن لەو پیاوانەی کە ئەمێستا ئەو جۆرە ئەرکانەیان پێ سپاردوون. چونکە ئەگەر ئەم چەشنە ئەرك و کارانە بخرێنە ئەستۆی کەسانێك کە باشتریان بەڕێوە دەبەن، یا بە کەسانێك بسپێردرێن کە بەرژەوەندیی گشتی دەخوازێ، لەو حاڵەتەدا نابێ لەوە نیگەران بین کە نەکا فڵانە پۆست بدرێتە ئافرەتگەلێك کە لە خوارووی پیاوانی نێونجی ﴿لە ڕووی هێز و توانای عەقڵییەوە- وەرگێڕ﴾ بیەوەن. لەوەها دۆخێکدا هەر ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە ژنان لە چاو پیاوان کەمتر ئەم پیشە و کارانەیان دەستدەکەوێ و ئەوەش دەرئەنجامی

زۆربەی بوارەکانە. لەوانەیە لە بەر ئەوەش بێ کە زۆربەی ژنان خۆ لەو پیشە و کارانە دەبوێرن کە دەیانخاتە کێبڕکێ و هەڤرکی لەگەڵ خەڵکانیتر. دەشزانین کە تەنانەت سەرسەختترینی ئەوانەی کە نکوڵی لە سووکایەتیکردن بە ژنان ناکەن، هێندێ ژن بەدی دەکەین کە لە تەواوی ئەو بوارانەدا کە پیاو خۆیان تاقیکردۆتەوە توانای خۆیان خستۆتەگەر و سەلماندوویانە کە بێ ئەملا و ئەولا هەرچی پیاوان کردوویانە ئەوانیش کردوویانە و سەرنجی هەموانیان راکێشاوە، ئەو ژنانە ژمارەشیان کەم نەبووە. ئەوپەڕی ئەوەی دەکرێ بگوترێ ئەوەیە کە ژنان لە زۆر بواردا بە قەدرایی پیاوان سەرکەوتنیان بەدەستنەهێناوە. بە واتایەکی دیکە گەلێك بوار و گۆڕەپان هەبوونە کە تێیاندا ژنان نەیانتوانیوە بەرزترین پلەی تێدا وەدەست بێنن. کەچی زۆر کەمن ئەو بوار و گۆڕەپانانەی تەنیا توانای زەینییان ویستبێ و ژنان لانیکەم لەوێدا پلەی دووهەمیان وەدەستنەهێنابێ. ئەرێ هەر ئەم راستییە ناییسەلمێنێ کە ئەگەر رێگر بن و نەهێڵێن ژنان لە وەدەست هێنانی ئەم پلە و دەرەنجامەدا لەگەڵ پیاوان بکەونە کێبڕکێ، زوڵمێکی گەورەمان لەوانیش و لە کۆمەڵگەش کردووە؟ ئایا لە کەس شاراوەیە کە زۆربەی ئەم پلە و پۆستانە بە دەستی پیاوگەلێکەوەن کە هیچ لە هێندێ ژنان باشتر و لێهاتووتر نین و ئەگەر مەودا و بواری هەڤرکێ لەم گۆڕەپانانەدا بۆ ژنانیش بڕەخسێ، کێن ئەوانەی سەردەکەون؟ ئایا جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەم دۆخە و دۆخێکرا کە رێژەیەکی پیاوان دەستیان رانەگاتە ئەو پلە و پۆستە گرینگانەی بەدەست ژنانەوەن، لە حاڵێکدا لەو ژنانەش لێهاتووتر بن؟ ئایا پیاوان ئەگەر لە شوێنێکی دیکەش خەریکی کارکردن بن، وەها دۆخێك قەبووڵدەکەن دەکەن؟ ئایا لۆژیکی هەڤرکێ واناخوازێ کە بۆ هەر کارێك لێهاتووترین کەس دابنرێ؟ ئایا رێژەی پیاوانی لێوەشاوە بۆ پۆستە بالاکان ئەوەندە زۆرە کە کۆمەڵگە زۆربەی کەسانی کارامە وەلابنێ؟ ئایا بەردەوام دەتوانین بۆ هەر کار و ئەرکێکی گرینگی کۆمەڵایەتی کە بەبێ بەرپرس دەمێنێتەوە پیاوێکی لێوەشاوە بدۆزینەوە؟ ئایا لەوەش دڵنیاین کە ئەگەر نەهێڵین نیوەی خەڵك ئەو کارانە وەئەستۆ بگرن کە دەتوانن بەڕێوەیان بەرن، هیچ زیانێکمان وێناکەوێ؟ تەنانەت ئەگەر بەبێ ئەوانیش کارەکان هەموو جێبەجێ بکرێن، ئایا باشە لانیکەم لە رێز و



حورمەت بێبەشیان بکەین و مافی هەڵبژاردنی ئیش و کاریان لێ زەوت بکەین؟ مەگەر تەواوی تاکەکان مافی ئەوەیان نییە کە بە ویست و حەزی خۆیان ئیشی دڵخوازیان (هەڵبەت بە قەبووڵکردنی مەترسییەکانی و بە مەرجێك زیانی بۆ کەس نەبێ) هەڵبژێرن؟ ئەو جار، بێبەشبوونیان لە مافەکانی خۆیان تەنیا زەرەر و زیانی بۆ ئەوان نییە، بەڵکو ئەوانەش کە دەتوانن کەڵك لە خزمەتەکانی ئەوان وەرگرن زەرەر دەکەن. ئەگەر بڕیار بدرێ کە فلانە گرووپ ناتوانن ببنە پزیشك یا کاری پارێزەری بکەن، یا ببنە ئەندامی پەرلەمان، ئەو زیانەی لەم بڕیارە دەکەوێتەوە تەنیا لەئەوان ناکەوێ، لە ئەوانەش دەکەوێ کە دەیانەوێ کەڵك لە خزمەتەکانی پزیشك وەرگرن یا ئەندام پەرلەمان هەڵبژێرن یا پارێزەرێك بگرن. چونکە لەلایەکەوە گۆڕەپانی کێبڕکێ بەرتەسك دەبێتەوەو هەوڵ و کۆششی رەقیبەکان کەمتر دەبێتەوە و لە لایەکی دیکەوە ئیمکانی هەڵ بژاردن کەمترو بەرتەسکتر دەبێتەوە. پێموایە باشترە وردەکارییەکانی ئەم باسەم بۆ ئەو ئیش و ئەرکانە تەرخان بکەم کە ماهییەتێکی کۆمەڵایەتییان هەیە. چونکە ئەگەر بتوانم لەم بوارە دا دژبەرەکانی خۆم بە قەناعەت بگەیەنم، لەوانەیە زۆر بە هاسانی ئەوە قەبووڵ بکەن کە دەبێ ژنان لە وەرگرتنی هەموو کار و پۆستەکان بەتایبەتی ئەو کارانەی کەتەنیا لایەنی تاکەکەسی و ئابوورییان هەیە ئازاد بن. ئیزنم بدەن باسەکەم بە بابەتێکی روون دەست پێ بکەم کە لە بابەتەکانی دیکە تەواو جیاوازە، جیاوازییەکەش لەوە دایە کە مەسەلەی توانای ژنان کە لەوانەیە لە باسەکانی دیکە دا بێتە گۆڕێ هیچ پێوەندییەکی بەوەیانەوە نییە، مەبەستی من ﴿لەم باسە﴾ مافی دەنگدانە، چ لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و چ لە ئی شارەوانیدا. جیاوازی هەیە لەنێوان بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی ئەو کەسانە دا کە بڕیار وایە بە ویست و رای خەڵك بەرپرسیارەتییەك وەئەستۆ بگرن لەگەڵ هەڤرکێ بۆ وەرگرتنی ئەم پۆست و بەرپرسیارەتییە. ئەگەر خەڵك بۆیان نەبێ دەنگ بدەن بە کەسێك کە بە رای هێندێ کەس شیاوی پەرلەمان نییە، ئیتر حکوومەت جیا لە حکوومەتی بژاردەکان (ئولیگارشی) بەولاوە شتێکیتر نابێ. ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێ خۆی ئەوانە هەڵبژێری کە حکوومەتی بە سەردادەکەن، مێتۆدێکە بۆ پاراستنی مەزنی و مافی هەموانە، ئەگەر

هەمووشیان لە تەواوی ژیانیاندا لە حکوومەت کردن بێبەش بن. ﴿بەمجۆرە﴾ ژنانیش لە گرینگترین مەسەلەیەکدا کە پێوەندیی پێیانەوەیە مافی بەشداریکردنیان هەیە بەو مانایە کە دەتوانن مێردی خۆیان واتە ئەو پیاوەی کە قەرارە هەتا مردن بە سەریاندا زاڵبێ، بە ویستی خۆیان هەڵبژێرن. بەڵام ئەوە یاسایەکە بۆ هەڵبژاردنی بەرپرسانی وڵات دەبێ بەوپەڕی وردییەوە مافی دەنگدان پێناسە بکا و ئاستەنگە پێویستەکانیش لە بەر چاو بگرێ. بەڵام ژنانیش بە قەدرایی پیاوان بەرتەسك بکرێنەوە و بخرێنە بازنەوە.

ئێستا کە تەواوی پیاوان لە هەلومەرج و سنووردارییە وەك یەکدا مافی دەنگدانیان هەیە، هیچ پاساوێك نییە بۆ ئەوەی ژنان لەو مافە بێبەش بکەین. زۆر جاری وا هەیە کە بیروڕای سیاسیی زۆربەی ژنانی چینێك جیاوازییەکی وای لەگەڵ زۆرینەی پیاوانی ئەو چینەدا نییە، مەگەر ئەوەی کە شتێکی وا لەگۆڕێ دابێ کە بە جۆرێك کاریگەریی لە سەر بەرژەوەندییەکانی ژنان هەبێ. ئێستا کە وایە یەکسانی و دادپەروەری وادەخوازێ کە ئەوانیش مافی دەنگدانیان هەبێ. ئەم مەسەلەیە ئەوەندە روونە کە پێموایە تەنانەت ئەو کەسانەش کە لە بوارەکانی دیکەدا دژی هەموو بیروبۆچوونەکانمن، لایەنگریی لێدەکەن. تەنانەت ئەگەر تەواوی ژنانیش شوویان کردبێ و هەموانیش کۆیلەی مێردەکانیان بن، دیسانیش پێویستیان بە پشتیوانیی یاسا هەیە و دەزانین کە کۆیلەکانیش هەر لەو یاسایانەدا کە ئاغاکانیان دایانڕشتوون، مافێکیان هەیە. ئێستا لێوەشاوەیی ژنان لە وەئەستۆگرتنی ئەو پۆست و ئیشگەلەدا شەنوکەو دەکەین کە دەکەونە ریزی بەرپرسیارەتییە کۆمەڵایەتییە گرینگەکان. من بەر لەوە باسمکرد کە ئەگەر لە روانگەی پراکتیکەوە لەو مەسەلەیە بڕوانین، مشتومڕێکی ئەوتۆی لێناکەوێتەوە، چونکە هەر ژنێکی لە کارێکدا سەرکەوتن وەدەستبێنێ، خودی سەرکەوتنەکەی دەیسەلمێنێ کە شیاوی ئەم بەرپرسیارەتییە بووە. سەبارەت بە پلە و بەپرسیارەتییە سیاسییەکانیش هەر بەم جۆرەیە، ئەگەر سیستەمی سیاسی وڵات بە جۆرێك دارێژرابێ کە پیاوە دەستەوستان و بێ تواناکان وەلابنێ، ژنانی بێ تواناش وەلادەنێ و ئەگەر وڵاتێك خاوەنی وەها سیستەمێکی سیاسی نەبێ، فەرقی چییە



ژنانی کەمتوانا لە سەر کار دابنێ یا پیاوانی بێ توانا و کار لێ نەهاتوو؟ بەو پێیە، ئەگەر روون و ئاشکرایە لانیکەم رێژەیەکی کەمی ژنان دەتوانن ئەم جۆرە ئەرك و بەرپرسیارەتییانە وەئەستۆ بگرن، یاسا نابێ رێگە لەم ژمارە ژنە دەگمەنە بگرێ و ئەگەر واش بکا ناتوانێ بە پشتبەستن بەو باوەڕانەی بە گشتی لە سەر تواناکانی ژنان هەن، بیکا.

ئەگەرچی، وەکو باسمانکرد، ئەگەر لە روانگەی پراکتیکەوە بڕوانینە مەسەلەی تواناکانی ژنان، مشتومڕێکی ئەوتۆی لێناکەوێتەوە، بەڵام بابەتەکە بێ جێ و کەم بایەخیش نییە. خستنەڕووی روانگەیەکی بە دوور لە دەمارگرژی لە سەر ئەم بابەتە، دەبێتە هۆی تۆکمەتر بوونی ئەو بەڵگەهێنانەوانەی بۆ داکۆکی لە تواناکانی ژنان دەخرێنە روو، بە روون کردنەوە و سەلماندنی قازانجە کردەییەکانی کارکردن بە ژنان، ئەم بەڵگەهێنانەوە بەهێزتریش دەبن. زۆربەی بەڵگە سایکۆلۆژییەکان ئەوە دەردەخەن کە ئەو جیاوازییە زەینییانەی وێدەچێ لە نێوان ژن و پیاودا هەبن، جگە لە کاریگەریی سروشتیی ئەو جیاوازییانەی کە لە ژینگە و پەروەردەی ئەواندا بەدیدەکرێ هیچیتر نییە و ئەم جیاوازییانە بە هیچ شێوەیەك نیشانەی جیاوازییەکی بنچینەیی لە سروشتی ئەواندا نین، چ بگا بەوەی نیشاندەری سووکی و ژێردەستەبوونی ژنان بێ. بەڵام ئیزن بدەن، با لە پێشدا ئەم بەڵگە سایکۆلۆژیکییانە یەکسەر وەلا بنێین کە ژنان بە راستی  هەر ئەوەن کە هەن یا ئەوەن کە ئێمە دەیانناسین و تواناکانیشیان هەر ئەوەن کە هەتا ئێستا دەرکەوتوون. ئەوەی هەتا ئێستا ژنان کردوویانە، ئەگەر نیشاندەری هیچ شتێك نەبێ، لانیکەم ئەوە دەردەخا کە ژنان چییان لە دەست دێ. ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو خاڵە کە پەروەردەی ژنان هەرگیز وانەبووە چاو ببڕنە ئەو ئیش و ئامانجانەی تایبەت بە پیاوانن، لەوەش خراپتر بە هەوڵی بێ وچان ژنانیان وا راهێناون کە تەنانەت فیکری نزیکبوونەوەش لەم ئیش و ئامانجانە نەکەنەوە، ئەو کاتەیە دەردەکەوێ کە من بە پێی دەسکەوتە هەنووکەییەکانی ژنان پێگەی ئەوانم نزمتر لەوە داناوە کە دەبێ ببێ. چونکە بەڵگەی نیگەتیڤ لەم بوارەدا بەهایەکی

کەمی هەیە، بەڵام بەڵگە پۆزەتیڤەکان دیاریکەر و بەنرخترن. بۆ وێنە، بە پێی ئەم ڕاستییە کە هەتا ئێستا هیچ ژنێك بەرهەمێکی وای نەخوڵقاندووە کە بشێ لەگەڵ بەرهەمەکانی هۆمێر و ئەرەستو یا میکلانژ و بێتهوڤێن بەراورد بکرێن، ناکرێ بڵێین هیچ ژنێك ناتوانێ بەرهەمگەلێکی وەك ئەوانە بخوڵقێنێ. لەم ڕاستییە نیگەتیڤەوە دەکرێ بەو دەرئەنجامە بگەین کە لەم بوارەدا ڕەوشەکە ڕوون و دیار نییە. لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر بەڵگە پۆزەتیڤەکان بێنینە گۆڕێ، هیچ گومان نییە لەوە کە ژنان دەتوانن ببنە کەسانێکی وەك شابانو ئەلیزابێت یا دێبوورە و یا ژاندارك، چونکە لێرە نەك دەرئەنجام وەرگرتن بەڵکو ڕاستییەکان لە بەر دەمن. ئەوەش سەیرە کە یاساکان ژنانیان لە ئیشگەلێك بێبەش کردووە کە ئەوان توانای خۆیان لە بەڕێوەبردنیاندا سەلماندووە. ئەگەر ژنان بیانەوێ شانۆنامەیەکی هاوشانی بەرهەمگەلی شکسپیر بنووسن یا ئاوازێکی وەك بەرهەمەکانی موتزارت دابنێن یاسا پێشیان ناگرێ، بەڵام ئەگەر شا ئەلیزابێت و ڤیکتۆریا تاج و تەختیان بە میرات پێ نەگەیشتبایە، هیچ کات نەیاندەتوانی چووکترین ڕۆڵیان لە گۆڕەپانی سیاسیدا هەبێ. لە حاڵێکدا شابانۆ ئەلیزابێت دەری خست کە دەتوانێ شان بدا لە شانی گەورەترین پیاوانی سیاسیی مێژووی. ئەگەر بخوازین بە پێی واقیعە هەنووکەییەکان و بێ شیکردنەوەی دەروونناسییانە، دەرەنجامێك وەرگرین تەنیا دەرەنجامێکی مسۆگەر کە دەتوانین وەریگرین ئەوەیە کە ژنان لە ڕاپەڕاندن و بەڕێوەبردنی ئەو ئیش و بەرپرسیارەتییانەدا کە لێیان بێبەش کراون توانایی سەرسووڕهێنەریان هەیە. چونکە وێڕای ئەوەی لە بابەتی حکوومەتدا هەلی زۆر کەمیان لەبەرامبەربووە، بەڵام کەسایەتیی دیاریان لێ هەڵکەوتووە، لە حاڵێکدا لەو بوارە گرینگانەدا کە دەستیان ئاوەڵایە هیچ کات بەجۆرە لێوەشاوەیی و لێهاتوویییان لە خۆ نیشاننەداوە. هەموومان ئاگادارین کە لە مێژوو دا ئەو شابانوانەی دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست لە چاو پادشاکان چەندە کەم بوون و لە نێو ئەم ڕێژە کەمەشدا ژمارەی ئەوانەی توانای سەرسووڕهێنەریان لە خۆیان نواندووە لە چاو پیاوان زۆر زیاتر بوونە، لە حاڵێکدا ژنان زیاتر لە سەردەمە ئاڵۆز و



قەیراناوییەکاندا بە دەسەڵات دەگەیشتن. ئەوەش سەرنجڕاکێشە کە ژنان لە زۆر بواراندا خەسڵەت و تایبەتمەندییە باش و مەزنەکانیان ئەوانە بوون کە لەگەڵ کەسایەتیی فانتازی و نەریتییەکانی ئەواندا لە پارادۆکس دابوون. بۆ وێنە بەو ڕادەیەی دەسەڵاتدارێییەکیان هۆشیارانەو زیرەکانە بووە، لێبڕاوی و بە هەڵوێستیشی تێدابووە. ئەگەر بێجگە لە شابانووەکان و ژنە ئیمپراتۆرەکان، جێگیری پاشاکان (نایب السلطنة) و ژنانی سەرۆك هەرێمەکانیش لە بەر چاو بگرین، ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی فەرمانڕەوایەکی مەزن بوونە زۆر زیاتر دەبێ؟(١) ئەو مەسەلەیە ئەوەندە حاشاهەڵنەگر و بەڵگەنەویستە، کە دەڵێن لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا کابرایەك کە دەیویست نکۆڵی لە لێوەشاوەیی ژنان لە کاروباری فەرمانڕەوایی بکا، مەسەلەکەی پێچەوانە کردەوە و گوتی: شابانووەکان لە پادشاکان باشترن، چونکە لە حکوومەتی پادشاکاندا ژنان فەرمانڕەوان، بەڵام لە حکوومەتی شابانووەکان دا، پیاوان. لەوانەیە بەڵگەهێنانەوە لە دژی نوکتەیەکی تاڵ، کات بە فیڕۆدان بێ. بەڵام ئەو جۆرە قسانە شوێن لە سەر زەین و مێشکی خەڵك دادەنێن و من دیتوومە هێندێ لە پیاوان بە تین و تاسەیەکەوە ئەم قسەیە دەگێڕنەوە دەڵێی حەقیقەتێکی شاراوەی تێدایە. بە هەر حاڵ، ئەم وتەیە دەتوانێ خاڵێك بێ بۆ دەستپێکی باسەکە. لەو باسەدا بانگەشەی من ئەوەیە: ئەوەی کە دەڵێن لە حکوومەتی پادشاکاندا ژنان دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوان، قسەیەکی بێ بنەمایە. ئەم شتانە زۆر ناوازە و دەگمەنن و پادشا لاواز و دەستەوەستانەکان ئەوەندەی بە لاوازییەوە لە ژێر فەرمانی ئافرەتە خۆشەویستەکانیاندا بوون، ئەوەندەش گوێڕایەڵی پیاوان بوون. ئەگەر پادشایەك تەنیا لە بەر حەز و ئارەزووەکانی خۆی گوێڕایەڵی ژنێك بێ، ناتوانێ فەرمانڕەوایەکی لێهاتوو بێت، هەر چەندە کەسانێکی دەگمەن لەم بوارەشدا هەبوون. بەڵام لە مێژووی فەڕەنسادا دوو پادشا بەدیدەکەین کە بە ویستی خۆیان چەندین ساڵ جڵەوی دەسەڵاتیان داوەتە دەست بە دوو ئافرەت: یەکێکیان دایە دەستی دایکی و ئەوی دیکەشیان بە خوشکی ئەسپارد. یەکێکیان شارلی هەشتەم بوو کە لە کاتی بە دەسەڵات گەیشتنیدا مێرمنداڵێك بوو و لە سەر

پێشنیاری باوکی (لویی یازدەهەم)، کە بەهێزترین پادشای سەردەمی خۆی بوو، دەسەڵاتەکەی دایە دەستی خوشکەکەی. پادشاکەی دیکە سێن لویی بوو کە چەندین ساڵ بەڕێوەبردنی کاروبارەکەی بە دایکی ئەسپاردبوو، ئەویش خۆی پادشایەك بوو کە فەرەنسا لە دوای شارلمانییەوە پادشای واباش و بەهێزی بە خۆوە نەدیبوو... ئەم دوو ژنە، هەردووکیان وایان فەرمانڕەوایی کرد، کە ئەستەمە لە نێو پادشاکانی سەردەمی خۆیاندا، یەکێك بدۆزینەوە هاوشانیان بێ. ئیمپراتۆر شارلی پێنجەم، سیاسەتمەدارترین پادشای سەردەمی خۆی، کە گەلێك پیاوی دەبەردەستدا بوون و ئەستەمە بلێی بەرژەوەندیی حکوومەتی کردبێتە قوربانیی هەست و ئیحساساتی خۆی، دوو کچە شازادەی بنەماڵەی خۆی بە شوێن یەکدا کردە فەرمانڕەوای هۆڵەندا و هەتا زیندوو بوو کچەی دووهەمی، لەم پۆستەدا هێشتەوە. (دوای ئەم دووانەش ژنێك فەرمانڕەوای هۆڵەندا بوو). ئەم دوو ژنە زۆر سەرکەوتوانە فەرمانڕەواییان کرد و یەکێکیان، مارگارێتی نەمسایی، یەکێك بوو لە لێوەشاوەترین سیاسەتمەدارانی سەردەمی خۆی. کەواتە لەم بوارەدا بەڵگە بە قازانجی ژنان زۆرن. ئێستا چاوێك بە لایەنی دیکەی مەسەلەکەدا دەخشێنین. ئایا کاتێك کە دەڵێین لە حکوومەتی شابانووەکاندا پیاوان فەرمانڕەوا و دەسەڵات بەدەستن هەر بەو مانایە نییە کە دەڵێین ژنان بە سەر پادشاکاندا زاڵن؟ بە واتایەکی دیکە، ئەو قسەیە بەو مانایەیە کە شابانووەکان بە پێی حەز و ئارەزووە شەخسییەکانیان دەست و پێوەندەکانی حکوومەتەکەیان هەڵدەبژێرن؟ شتی لەم چەشنە دەگمەنە تەنانەت کاترینای دووهەمیش کە زۆر گوێی بە مۆراڵ و ئەخلاق نەدەبزووت ئاوا نەبوو، حکوومەتی شیاویش، کە مەزەنە دەکرێ لە دەسەڵاتی پیاوانەوە سەرچاوە دەگرێ، لەم شێوەیەدا بەدیناکرێ. کەواتە ئەگەر ئەو قسەیە راست بێ کە لە حکوومەتی شاژنەکاندا پیاوان دەسەڵات بە دەست و فەرمانڕەوان، بەو مانایەیە کە لە حکوومەتی شاژنەکاندا، لە چاو پیاوانی نێونجی (لە رووی توانا و لێهاتوییەوە- وەرگێڕ)، کار و بەرپرسیارەتی بە پیاوانی لێوەشاوەتر دەسپێردرێن. بەو پێیە شاژنەکان توانایی زیاتریان لە هەڵبژاردنی پیاوانی لێوەشاوەدا هەیە و ژنانیش



هەم لە پلەی فەرمانڕەوایی و هەمیش لە پلەی سەرۆکی وەزیراندا، لە پیاوان لێوەشاوەترن، چونکە ئەرکی سەرۆکی وەزیران نییە کە بە تەنێ فەرمانڕەوا بێ، بەڵکو ئەوەیە کە بەرپرسیارەتییە جۆراوجۆرەکان بە لێوەشاوەترین کەسەکان بسپێرێ. ناسینی خێرای کەسایەتیی تاکەکان، کە لایەنی سەلمێنراوی باشیی ئافرەتانە بە سەر پیاواندا، ئەگەر لەگەڵ یەکسانیی رێژەیی ژنان و پیاوان لە تایبەتمەندییەکانی دیکەیان دابێ، بێگومان لە هەڵبژاردنی بەرپرسانی حکوومەتیدا پێگەی ژنان دەخاتە سەرووی پیاوانەوە و هەروەك دەشزانین گرینگترین ئەرکی ئەو کەسەی دەیهەوێ فەرمانڕەوایی ئەوانی دیکە بێت ئەوەیە، کە کەسانی لێوەشاوە هەڵبژێرێ. تەنانەت ئافرەتێکی وەك کاترین دێ مێدیسیس Cothrin de Medicis قەدری سەدری ئەعزەمێکی (صدر اعظم) وەك دێ لۆپیتاڵ De lopital ی دەزانی. بەڵام ئەوەش راستە کە مەزنێتی گەورەترین شاژنەکانیش لە سایەی تواناکانی خۆیانەوە راست بۆ ئەوەشە کە پیاوانی لێوشاوە دەستەونەزەر لە خزمەتیان دا دەبوون. ئەو ژنانە، لە بەرزترین ئاست دا خۆیان بەڕێوەبەریی کارەکانیان لە ئەستۆ بوو و ئەگەر گوێیان دەدایە پێشنیاری کەسانی باش، خۆی بە باشترین شێوە دەری دەخا کە هێزی تێگەیشتن و ناسینیان بە جۆرێك بووە کە دەیانتوانی بە تەدبیر و راوێژ گرفتە گەورەکانی حکوومەت چارەسەر بکەن. ئایا ماقووڵ و مەنتقییە کە پێمان وابێ، ناتوانن کاروباری سیاسی بچووکتر راپەڕێنن؟ ئەدی بۆ هەر کات هەلومەرجەکان بخوازن ژنان و کچانی پادشاکان، وەك مێرد و براکانیان بە لێوەشاوەیی ئەرکی خۆیان رادەپەڕێنن؟ بەڵام هاوسەر و خوشکی سیاسەتمەداران و بەڕێوەبەران و بەرپرسانی کۆمپانیاکان و رێکخراوە گشتییەکان ناتوانن ئەو کارانە بکەن کە مێرد و براکانیان دەیانکەن؟ هۆکاری راستەقینەی ئەو مەسەلەیەش روون و ئاشکرایە، کچە شازادەکان پێگەیان لە پێگەی پیاوان باڵاتر بوو، ئەوان قەت فێری ئەوە نەدەکران کە نابێ خۆ لە سیاسەت هەڵ قورتێنن، بەڵکو بە پێچەوانە، هان دەدرێن وەکو هەر مرۆڤێکی پەروەردەکراو بە وردی سەرنج بدەنە هەرشتێکی گرینگی کە لە دەوروبەریاندا دێتە گۆڕێ و پێش دێ. جار جارەش داوایان

لێ دەکرێ بەرپرسیارەتیی‌و  رۆڵێکی گرینگ بگرنە ئەستۆ. تەنیا ژنانی بنەماڵە دەست ڕۆیشتووەکان ئیزنیان پێ دەدرێ حەزیان لەو شتانە بی˚ کە پیاوان حەزیان لێیە و لەو بوارانەدا سەرکەوتن و پێشکەوتن وەدەست بێنن کە بۆ پیاوان ڕەوایەو هەر ئەو ئافرەتانەشن کە لە هیچ بوارێکدا جێگەیان لە خوار پیاوانەوە نییە. ئافرەتان ڕاست لێرەدا و بەو ڕێژەیەی تواناکانیان لە چوارچێوەی حکوومەت دا تاقی کراوەتەوە، لێوەشاوەیی خۆیان خستۆتە ڕوو. ئەوەی خستمانە بەر باس دەرەنجامی ئەو ڕاستییانەن کە لە جیهان دا هاتوونەتە پێش و حەز و مەیل و گرۆییەکانی ژنان بەو جۆرەی هەتا ئێستا بوو، دەخاتە ڕوو و من هیچ کات ناڵێم ژنان هەروا دەبن. چونکە هەر وەك گوتم ئەوە چاوقایمییەکی لە ڕادە بەدەرە کە پێمان وابێ جەوهەر و سروشتی ژنان دەناسین و دەزانین ئەوان چن و چۆن نین و دەتوانن چ بن و چی نەبن. ئەگەر هەڵدان و گەشەی خۆڕسك لە بەرچاو بگرن ژنان هەتا ئەوڕۆ، لە وەها دۆخێکی ناسروشتی دابوون کە بێ شك سروشتیان گۆڕانی بە سەرداهاتووە و بە داپۆشراوی ماوەتەوە و هیچ کەسیش ناتوانێ بە دڵنیاییەوە بڵێ کە ئەگەر سروشتی ژنان بواری بۆ ڕەخسابایە تاکو وەکو کوڕان بە ئازادی ڕێبازی خۆی هەڵبژێری و ئەگەر هیچ حەزێکی دەستکردی بە سەر دانەسەپابایە جیا لەوەی کە هەڵومەرجی کۆمەڵگەی مرۆیی دەخوازی و ئاواش بە سەر هەر دووك ڕەگەزدا دەسەپا، لەوەها حاڵەتێکدا ئایا هیچ جیاوازییەکی گرینگ و یا هەر بە گشتی هیچ جیاوازییەك لە بواری کەسێتی  تواناوە لەنێوان ژن و پیاودا دەبوو؟

من زوو دەیسەلمێنم کە تەنانەت ئەو جیاوازییانەش کە هیچ کەسێك گومانی لە سروشتی بوونیاندا نییە، لەوانەیە بەرهەمی ژینگە و دەوروبەر بن و هیچ پێوەندییەکیان بە توانا سروشتییەکانەوە نەبێ. ئەگەر لە ژنان بەم جۆرە کە هەن بڕوانین، لەوانەیە بکرێ بڵێین کە بە گشتی گرۆیی و حەزی تواناکانیان زیاتر بەرەو کاروباری پراگماتیکی (کردەیی) یە هەتا تیۆری، ئەم بۆچوونە لە چاو زۆربەی ئەو بۆچوونە گشتییانەی لە سەر ژنان خراونەتە ڕوو زیاتر لە حەقیقەت نزیکتر دیارە و لەگەڵ دەروون ئەدگار و کرداری ژنان لە ئێستا و ڕابردوودا باشتر یەك دەگرنەوە و بە



ئەزموونە ئاسایی و ڕۆژانەییەکانیش دەکرێ لێیان تێبگەین. سەرەتا دەبێ بزانین ئەو توانا زەینییانەی بە ڕوونی سەلمێنەری ژنانی بە توانان، چین؟ تەواوی ئەو توانایانە لەو جۆرەن کە ژنان بەرەو پراگماتیست بوون ئامادە و تەیار دەکەن و دەبنە هۆی ئەوە یکە ئەوان حەزیان لە کردەوە بێ. لێرەدا خراپ نییە بچینە سەر مەسەلەیەکی دیکەش و ئەوەش تێگەیشتنی (شهودی)ی ژنانە. تێگەیشتنی شهودی واتە، تێگەیشتنێکی خێرا و دروست لە سەر واقیعەکان. لە تێگەیشتن و ئیدراکی شهودیدا باسێك لە سەر پرەنسیپە گشتییەکان لەگۆڕێدا نییە. هیچ کەس ناتوانێ لە ڕیگەی ئەم جۆرە تێگەیشتنەوە بە یاسایەکی زانستی بگات یا ئەوەی کە ڕێسایەکی گشتی بۆ ئەرك و خۆگری یا دوور نواڕین*[1] بخاتە ڕوو.

ئەم ئیشگەلە بەرهەمی کۆکردنەوە و بەراوەردکردنی ورد و سێبورانەی ئەزموون و زانیارییەکانە، ژنان و پیاوانی خاوەن توانای "شهود" هیچ کات ناتوانن لەم بوارەدا بدرەوشێنەوە، مەگەر ئەوەی کە دۆخێکی ئەوتۆ بێتە پێش کە ئەوان بۆخۆیان بتوانن ئەزموون و زانیاریی پێویست وەدەستبێنن، چونکە هەر ئەو شتەی کە پێی دەڵێن زیرەکیی شهودی، بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر وایان لێدەکا تا ئەو جێیەی بۆیان دەلوێ بە پشتبەستن بە ئەزموون و بینراوەکانی خۆیان، لە حەقیقەت و ڕاستییەکان تێبگەن. بەو پێیە، کاتێك ژنان شانس و بەختیان لە پشت بێ و بتوانن وەك پیاوان بە خوێندن و خوێندنەوە کەڵك لە ئاکامی ئەزموونەکانی خەڵکانی دیکە وەرگرن، ئەوسا بە گشتی لە پیاوان زیاتر، ئەو هەلومەرجە بنەڕەتیانەیان بۆ دەرەخسێ کە بۆ کردەوەی لێوەشاوە و لێهاتوانە و سەرکەوتوانە پێویستن (لێرەدا ئەمن بە ئانقەست واژەی "بەخت"م بەکارهێناوە، چونکی ئەو ژنانەی زانیاریی پێویست بۆ چالاکی لە بوارە جۆراوجۆرە گرینگەکانی ژیانیاندا وەدەستهێناوە، خۆیان، خۆیانیان پێگەیاندووە).

---

۱- دوور نواڕین: واتە بە فیکرەوە لە دوور و داهاتوو ڕوانین. و.ك: هێمن دەڵێ: گوتی نا.... نا دووره بنواڕه دووره بنواڕه ئاسۆ ڕوونه. ناڵەی جودایی.

پیاوان که زیاتر پەروەردە کراون لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ واقیعەکاندا کەمتواناترن. ئەوان لەو واقیعانەدا کە لەگەڵیان رووبەڕوون ئەو شتە نابینن کە بە راستی لە گۆڕێ دایە، بەڵکو بە هۆی ئەو پەروەردە و راهێنانەی بینیویانە، تەنیا ئەو شتانە دەبینن کە چاوەڕوانییان هەیە بیانبینن. ئەو مەسەلەیە لە ژناندا، هەموو ئاستەکانی توانای ئافرەت ناگرێتەوە، ﴿چونکە﴾ هێزی "شهود" ناهێڵێ تووشی وەها هەڵەیەك بن. ئەگەر ژن و پیاوێك لە رووی ئەزموون و توانا گشتییەکانەوە وەك یەك بن، ژن لە پیاو باشتر ئەو شتە دەبینێ کە رووبەڕوویەتی. هەر ئەم هەستیاربوونە سەبارەت بە واقیعی ئێستا، گرینگترین تایبەتمەندییەکە، کە توانای ئیشی کردەیی نەك چالاکی و کاری تیۆریی، پشتی پێ دەبەستێ. دۆزینەوەی بنەما گشتییەکان پێویستی بە هێزی هەڵسەنگاندن و تیۆرداڕێژەری هەیە و تێگەیشتن لەوەی کە فلانە بنەما دەیانگرێتەوە یان نا، پێویستی بە توانای پراگماتیکی هەیە و ژنانیش، وەکو ئەوڕۆ هەن، توانایەکی سەیریان لەم بوارە دا هەیە. هەڵبەت ئەوەم قەبووڵە کە بەبێ بنەما و پرەنسیپ ناکرێ کردەی سەرکەوتوانەت هەبێ ﴿سەرکەوتن مسۆگەر نابێ﴾ و ئەو پێگە گرینگەی بینینی خێرا لەنێوان توانا جۆربەجۆرەکاندا هەیەتی، هانیان دەدا ئەوان بە پێی تێگەیشتنەکانی خۆیان گشتاندنی خێرایان هەبێ، ئەگەرچی لەم بارەوە دوور لە چاوەڕوانی نییە کە ئەوان حازر بن گشتاندنەکانیان وێڕای خوێندنەوە و موتالای بەربلاوتر، رێکوپێك بکەن. بەهەرحاڵ، گشتی تەنیا هۆکارێك کە دەتوانێ ئەم کەمایەسییە قەرەبوو بکاتەوە ئەوەیە کە ژنان دەستیان بە ئەزموون و زانست و زانیاریی هەموو نەژادی مرۆڤ رابگا، کە ئەویش لە باشترین شێوەدا، لە رێگەی پەروەردە و وەدەسهێنانی زانست و زانیارییەوە دێتە دی. ئەو هەڵە و لاڕێیانەی ژنان تووشی دەبن هەر ئەو هەڵانەن کە پیاوانی بە هۆش و گۆش و خۆ پێگەیاندووش تووشی دەبن، بەو مانایە کە زۆر جاران ئەو شتانە دەبینن کە پیاوانی خوێندەوار نایانبینن، بەڵام بە هۆی نەزانینی ئەو شتانەی کە زۆر لەمەوبەر ناسراون، تووشی هەڵەی زۆر زەق دەبن. هەڵبەت ئەم جۆرە کەسانە بەشێکی زۆر لە زانیارییەکانیان



دەستەبەر کردوون، ئەگینا هیچ دەسکەوتێکیان نەدەبوو، بەڵام ئەم زانستەیان لێرە و لەوێ بە پچڕپچڕ وەدەستهێناوە.

بەڵام هەر ئەم حەزەی ژنان لە راستییە ئۆبژێکتیڤ و بەرچاوەکان، ئەگەر بکرێنە تاقانە ئامرازێك بۆ ئاکاموەرگرتن، ئەوا گەلێك هەڵە و پەڵەی لێ دەکەوێتەوە، بەڵام ناهێڵێ تووشی هەڵەی دیکە بن و دەیانپارێزێ. گەورەترین و ئاشکراترین کەمایەسیی زەینی تیۆرداڕێژ ئەوەیە کە زۆر جاران ناتوانن بەشێوەیەکی زیندوو لە واقیعەکان وەك شتێکی هەمیشە ئامادە تێبگەن. هەر بۆیەش زۆر جاران نازانن کە واقیعە ئامادە و بەرچاوەکان لەگەڵ تیۆری و بۆچوونەکانیان ناتەبان و لە دژایەتیدان و سەرەڕای ئەوەش ئامانجی لۆژیکیانەی هزرینیش لە بیر دەبەنەوە و ئیزن دەدەن توانا زەینییەکانیان لە بوارگەلێکدا بکەونە کار کە تەواو بۆشە و هیچی تێدانییە، نە بوونەوەرێکی گیانلەبەر و نە بێگییان و نە تەنانەت خەیاڵی، لە ئاکامدا، خەریکی بیرکردنەوە لە شتگەلێك دەبن کە خولڤاوی وەهمە میتافیزیکییەکانن یا بەرهەمی ناڕوونیی پەیڤینن و پێیان وایە ئەم بۆچوون و وێنا وەهمییانە بابەتی موتالا و خوێندنەوەی باشترین و مەزنترین فەلسەفەن. بۆ پیاوێك کە کارەکەی بیرکردنەوەو تیۆردارشتنە و حازر نییە بە بینین و ئەزموون زانست و زانیاریی کۆ بکاتەوە، بەڵکو بە باشتری دەزانێ لە راستییە گشتییەکانی زانستەکان و یاساگەلی زاڵ بە سەر ئاکار و رەفتاردا رابمێنێ، هیچ شتێك ﴿بە لای ئەم پیاوەوە﴾ لەوە بە نرختر نییە کە لەگەڵ ئافرەتێکی بە راستی بە توانا بکەوێتە هزرین و بیرکردنەوە و لە بەر دەم رەخنە بەردەوامەکانی ئەو دابێ، بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە فیکر و بیروڕاکانی لە سنوور و چوارچێوەی ئەو بابەتە واقیعی و راستییانەدا بمێنێتەوە کە بە کردەوە لە جیهاندا هەن. ئەستەمە ئافرەت بە شێوەیەکی بێ هەوسار روو لە بیروڕا و بیرۆکەی ئابستراکت بکا. ژنان لە بواری هزر و بیردا دوو تایبەتمەندییان لە خۆ نیشانداوە: یەکێك ئەوەی کە وا راهاتوون شتەکان نەك بە شێوەی گرووپی، بەڵکو بە شێوەی تاك ببینن، دووهەم ئەوەیکە هۆگرییەکی زیاتر بە نیسبەت هەستی ئێستا و هەنووکەیی تاکەکانەوە نیشاندەدەن. ئەم تایبەتمەندییەی دووهەمی، کە پێوەندییەکی نزیکی بە تایبەتمەندیی یەکەمەوە هەیە، ئەو تواناییەیان پێ دەبەخشێ

که لە تەواوی ئەو شتانەدا کە لە کردەوەدا دەبێ بە کار بهێنرێن سەرنج بدەنە ئەوە کە چۆن لە سەر تاکەکان شوێندانەر دەبن. ژنان لە سایەی ئەم دوو تایبەتمەندییەوە، ئەستەمە متمانە بە بیر و هزرێك بکەن کە توانایی دیتنی شتی ئابستراکتیان نییە و بە جۆرێك لە شتەکان دەڕوانن کە وەك بڵێی بوونیان بە هۆی فلانە بوونەوەری خەیاڵییەوەیە کە خولقاوی زەینیی بیروند و هزر و هەستی بوونەوەرەکان درکی پێ ناکەن. بەو پێیە پیاوان دەتوانن بۆ نزیککردنەوەی بیر و هزری خۆیان لە واقیعەکان کەڵك لە هزر و بیری ژنان وەرگرن، ژنانیش دەتوانن لە هەراوتر کردنی ئاستی هزر و بیری خۆیاندا کەڵك لە پیاوان وەرگرن. من وەك خۆم، گومانم هەیە لەوەدا کە ژنان تەنانەت لە دۆخی ئێستاشدا پێگەیەکی نزمتر لە پێگەی پیاوانیان هەبێ. ئەگەر ژنان لە دۆخی ئێستادا تایبەتمەندیگەلێکی زەینیی ئەوتۆیان هەیە کە ڕێگەی ئەوەیان پێدەدا تەنانەت لە بواری تیۆری دارشتنەوە وا بە کەڵك بن، کاتێك تیۆرداڕێژی بە ئاکام بگا و بەکارهێنانی تیۆرییەکان بە کردەوە دەست پێ بکا، ڕۆڵی ئەوان ئەوەندەی دیکە گرینگتر دەبێ و دەچێتە سەرێ. بەو هۆیانەی باسمانکردن، ژنان زۆر کەمتر لە پیاوان دەکەونە ئەو داوەوە کە سەرەتا یاساگەلێك بیننە گۆڕێ و ئەوسا شێلگیرانە هەوڵی ئەوە بدەن کە ئەم یاساگەلە لە سەر شتێکی دەستنیشانکراو بەڕێوەبەرن، هەر چەندە ئەو بابەتە خاوەنی تایبەتمەندیگەلێکی ئەوتۆ بێ کە نەهێڵێ لە چوارچێوەی ئەم یاسایەدا بمێنێتەوە یا ئەوەی کە تاك ناچار بکا گۆڕانێك پێکبێنێ کە ئەو بابەتەش لە خۆبگرێ. تواناییەکی دیکەی کە هەموان لە سەری کۆکن کە ژنان تێیدا لە پیاوان سەرترن، خێرایی تێگەیشتنە. ئایا هەر ئەم توانایییە بەرجەستەیە نابێتە هۆی ئەوەی کە ژنان بۆ کردەوە گونجاوترین؟ لە کردەوە دا، هەموو شتێك بە بڕیاری خێراوە بەستراوەتەوە، بەڵام لە بیرکردنەوە و هزریندا وانییە. بیرمەند دەتوانێ پەلە نەکا و بە سێبوری و شێنەیی خەریکی شەنوکەو و کۆکردنەوەی بەڵگەی زیاتر بێ. ئەو پێویست ناکا لە کەمترین کاتدا ﴿بە خێرایی﴾ فەلسەفەکەی تەواو بکا لە ترسی ئەوەی نەکا دەرفەت نەمێنێ. هەڵبەت ئەگەر یەکێك بتوانێ باشترین ئاکام لە زانیاریی پڕ لە کەمایەسی وەرگرێ، تواناکەی لە فەلسەفەشدا بێ کەڵك نابێ، چونکە دروستکردنی گریمانەیەکی کاتی کە



لەگەڵ هەموو ڕاستییەکان یەك بگرێتەوە، زۆر جاران بنچینەیەك بۆ توێژینەوەی زیاتر دەخاتە ڕوو. بەڵام ئەو توانایییە لە مەرجەکانی هزری فەلسەفی نییە، هەر چەندە دەکرێ لە خزمەتی فەلسەفە دابێ. فەیلەسووف بۆ وەرگرتنی دەرەنجام، چ دەرەنجامی سەرەکی بێ یان لاوەکی، ئەوەندەی بیەوێ دەتوانێ کات تەرخانبکا، کاری ئەو پێویستیی بە خێرایی نییە. ئەوەی ئەو پێویستیی پێیەتی پشوودرێژی و دانبەخۆداگرتنە بۆ ئەوەی بتوانێ ئەوەندە درێژە بە ئیشەکەی بدا کە چەخماخە گچکەکان ببنە پشکۆی درەوشاوە و لە ناخی گریمانەیەکی جێی دڕدۆنگی و گومان، گریمانە و بۆچوونێکی قایم و باوەڕپێکراو بێتە دەرێ. بەڵام ئەوەی کە سەروکاری لەگەڵ واقیعە تێپەڕەکانە، واتە ئیش لە سەر ئاستی ئابستراکتەکان دەکا نەك لە سەر حەقیقەتەکان وەکو جۆرەکانی حەقیقەت، خێرایی بیرکردنەوە بە لای ئەو کەسەوە بایەخێکی ئەوتۆی هەیە کە تەنیا هزرین دەخاتە سەرروویەوە- ئەوەی نەتوانێ بە خێرایی تواناکانی بەکاربهێنێ، بکا لە بواری کردەوەدا وەکو کەسێك وایە کە هیچ توانایەکی نەبێ. ئەو لەوانەیە بتوانێ ڕەخنە لە کردەوەی خەڵکانی دیکە بگرێ، بەڵام خۆی هیچی لە دەست نایە. هەر لێرەش دایە کە ژنان و ئەو پیاوانەش کە لە ژنان دەچن، بە ئاشکرایی دەکەونە پێش ئەوانی دیکەوە. بەڵام پیاوانی دیکە، ﴿ئەو پیاوانەی تەنیا لە پیاو دەچن﴾، هەر چەندە لەوانەیە خاوەن گەلێك توانای باش و دەگمەنیش بن ناتوانن بە خێرایی کەڵك لە تواناکانیان وەرگرن، تەنانەت لەو بوارەشدا کە بە تەواوەتی ناسیارییان لە سەری هەیە و (تێیدا شارەزان). خێرایی لە دادوەری کردن، هەروەها لە کردەوەی هەڵسەنگێندراو دا بەرهەمی هەوڵی بێ وچانە و وردە وردە لەمرۆڤدا دەبێتە عادەت. لەوانەیە بانگەشەکاران بڵێن کە تووڕەیی ژنان لە چاو پیاوان، کەمایەسییەکە، جگە لە ژیانی خێزانیدا، لە بواری کردەوەدا تووشی گرفتیان دەکا، چونکە ئەم تایبەتمەندییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ژنان کەم جیکلدانە و وازوازی بن و زوو بکەونە ژێر کاریگەریی هەلومەرج و دۆخەکانەوە و نەتوانن کەڵك لە تواناکانیان وەرگرن. پێموایە، ئەم قسانە کۆی گرینگترینی ئەو ناڕەزایەتییانەن کە بە گشتی دژی لێوەشاوەیی ژنان لە وەئەستۆگرتنی کار و ئەرکگەلێ گرینگدا، هاتوونەتە گۆڕێ. بەڵام بەڕای من، بەشی زۆری تووڕەیی ژن، هەڵچوون و

سەرڕێژکردنی ئەو هێزەیە کە بە فیرۆ دەچێ و ئەگەر بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو کانالیزە بکرێ ئەوا هەڵناچێ. سەرچاوەی بەشێکی دیکەی ئەم تایبەتمەندییەی ژنان دەچێتەوە سەر پەروەردەی هۆشیارانە و ناهۆشیارانە، هەر بۆیەش ئێستا فێ لێ هاتن (بوورانەوە) و کاری شێتانە لە نێو ژناندا نابینرێ: کردەی لەم چەشنە باوی نەماوە! ئەو جار کاتێك هێندێ کەسی وەك زۆربەی ژنانی چینی بژاردە، وەکو گوڵ و گیای نێو گوڵخانە لە ژینگەی راستەقینەیان و لە تاڵ و سوێرییەکانی ژیان دوور دەخرێنەوە و لە هیچ بوارێکدا پەروەردە ناکرێن و لەو چالاکییە جەستەییو پرۆڤە وەرزشیانەی ماسوولکە و ئەندامەکانی دیکەی لەشیان بەهێز و تۆکمە دەکەن خۆ دەبوێرن و سەرەڕای ئەوەش تەواوی دامودەزگا دەمارییەکانیان، بە تایبەتی لە بواری سۆزدارییەوە، بە شێوەیەکی ناسروشتی دەخرێنە گەڕ، ئیتر سەیر نییە کە لە نێو ئەو ژنانەدا، ئەم تاقمەی کە نامرن و دەگەنە تەمەنی پیری، ئەوەندە کز و لەرزۆك دەبن، بچووکترین تاڵی و سوێری و کوێرەوەری دەیانشێوێنێ و ئەو کارانەیان پێ ناکرێ کە پێویستیان بە ئیشی جەستەیی یا زەینیی هەیە. بەڵام ئەو ژنانەی فێر بوونە کە بۆ دابینکردنی ژیانی خۆیان کار بکەن هیچ کام لەو تایبەتمەندییە شێتانەیان ناخەنە روو، مەگەر ئەوانەی ناچار بن لە شوێنێکی بەستراو و ناساڵمدا هەموو رۆژێ چەندین ساعەت خەریکی کارێك بن کە جووڵەیەکی ئەوتۆی پێویست نەبێ. ئەو ژنانەی لە یەکەمین ساڵەکانی تەمەنیاندا توانیویانە وەکو براکانیان جەستەی خۆیان پەروەردە بکەن و رای بێنن و لە تەمەنی گەورەییشدا دوور نەبوون لە هەوای بێ گەرد و کار و چالاکی، ئەستەمە پەرچەکرداری توندوتیژانە و دەمارگرژانە (عصبی)ی جۆرێك بنوێنن کە ببێتە هۆی بێبەشبوونیان لە ئیش و کارە پڕ جموجۆڵ و گرینگەکان. لە راستیدا لە هەر دووك رەگەزدا کەسانێکی تێدایە کە هەستەوەریی نائاسایی و دەمارگرژی (عصبی) تایبەتمەندیی سروشتییانە و ئەم خەسڵەتەش تێیاندا ئەوەندە زەق و بەرچاوە کە دەتوانێ وای لێ بێ کە زیاترین کاریگەریی لە سەر ماهیەتی گشتیی هێزە دەروونییەکانی هەبێ. وەها خەسڵەتێك، وەکو تایبەتمەندییە جەستەییەکانی دیکە، شتێکی بۆماوەییە (لە باو و باپیرانەوەیە) و کوڕ و کچ هەردووکیان لەگەڵی رووبەڕوون.



هەڵبەت لەوانەیە خووخدەی دەمارگرژانە "عـصبی" بە شێوەی "ژێنێتیکی" زیاتر کچان بگرێتەوە هەتا کوڕان و ئێمە ناچارین وەکو واقیعێك قەبوولێ بکەین. بەڵام پرسیاری من ئەوەیە کە ئایا کەس هەیە پیاوگەلێك بدۆزێتەوە کە فلان پیشە لەگەڵ سروشتیان یەکناگرێتەوە؟ ئەگەر وانییە، بۆ دەبێ ئەو ئافرەتانەی وەها سروشتێکیان هەیە لەم جۆرە کارانە بێ بەش بکەین؟ بێگومان تایبەتمەندییە سروشتییەکانی هەر کەسێك، تا رادەیەك بۆ سەرکەوتن لە هێندێ کار ﴿بوار﴾ دا یارمەتیدەرن و لە هێندێکیشدا رێگرن. بەڵام کاتێك ماهیەتی ئیش لەگەڵ خووخدەی دەمارگرژانە (عصبی) سازگارە و تەنانەت لە بڕێك شتدا کە سازگار نییە، سەرکەوتووترین کەسەکان ئەوانەن کە خووخدەیەکی دەمارگرژانە (عـصبی)یان هەیە. لە بواری کردەوەدا، تایبەتمەندیی بەرچاوی ئەم جۆرە کەسانە ئەوەیە کە لە چاو پیاوانی دیکە زووتر دەهەژێن و هەڵدەچن و لە بەر ئەم هەڵچوونە، لە چاو ئەوانیتر، کە لە حاڵەتی ئاسایی دان، جۆش و خرۆش و هێزێکی زیاتر، لە خۆیان دەخەنە روو و لەو کاتەدا کاری وایان لە دەست دێ کە لە کاتی ئاساییدا لەوانەیە هەر نەتوانن بەلایدا بچن. بەڵام ئەم هەژانە توندە، بێجگە لەوانەدا کە لەجەستەدا لاوازن، بڵێسەیەك نییە لە چاوترووکانێکدا دامرکێتەوە و هیچ شوێنەوارێکی هەمیشەیی لێ نەمێنێتەوە و نەکرێ لە پێناو ئامانجێکدا کە پێویستیی بە هەوڵ و تێکۆشانی زۆر و پشوودرێژی هەیە کەڵکی لێوەربگیردرێ. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی خدەی دەمارگرژانەیان (عصبی) ئەوەیە کە تاك والێدەکا بەردەوام لە هەیەجاندا بی و هەوڵی بێ وچان و بێ پسانەوە بدا. ئەوەش هەر ئەو حاڵەتەیە کە "جۆش و خرۆش و زیندوویی" پێ دەگوترێ. هەر ئەم حاڵەتەیە کە ئەگەر ئەسپێکی سواری بە باشی راهێنرابێ، وەها هێزێکی پێ دەبەخشێ کە هەتا گیانی بەردابێ بە چوار ناڵە رابکا بەبێ ئەوەی تۆسقاڵێك شل بێتەوە. هەر ئەم حاڵەتەشە کە هێز و توانایییەکی ئەوتۆی بە ژنانی کز و لاواز بەخشیوە کە توانیویانە نەك هەر بەرگەی ئازاری سامناکی سووتان و هەڵچۆقانی نێو ئاگر بگرن، بەڵکو بەسێبوورییەوە خۆ لە بەر ئەشکەنجەی رۆحی و جەستەیی بەر لەو سووتانەش راگرن. روون و ئاشکرایە کە خەڵکی لەم چەشنە زۆر گونجاون بۆ ئەو شتەی پێی دەڵێن رەهەندی

بەڕێوەبەرێتی و ڕێبەرایەتیی ڕەگەزی مرۆڤ. ئەوانە خاوەنی جەوهەر و توانایەکن کە دەتوانن ببن بە تواناترین وتاربێژ یا ئەوەی کە بە قووڵی لەسەر ئەخلاقی ئەوانیتر شوێندانەر و کاریگەر بن. لەوانەیە سروشت و جەوهەری ئەوان بە جۆرێك بێ کە بۆ کاروباری وەکو دادوەری یا وەزیری زۆر گونجاو نەبێ. بەڵام تەنانەت ئەم خاڵەش بە مەرجێك ڕاستە کە ئەمجۆرە کەسانە بە گوێرەی پێویست بەردەوام لە هەژان دابن و هەروەکو دەشزانین ئەم مەسەلەیە پێوەندیی بە پەروەردەوە هەیە. هەست و ئیحساساتی بەهێز دەتوانێ ببێتە هۆکار و ئامرازێك بۆ لە سەرەخۆیی و دان بە جەرگ داگرتن، بە مەرجێك کە بۆ ئەم مەبەستە پەروەردە کرابێ. ئەگەر وای لێ بێ، ئەم جۆرە کەسانە نەك هەر دەبنە قارەمانی پەرچەکردارە بزوێنەرەکان، بەڵکو دەبنە قارەمانانی "بە سەر خۆدا زاڵبوون" یش. ئەزموون و مێژوو نیشاندەری ئەوەن کە لە جۆشترین کەسەکان، بە مەرجێك تاسە و جۆش و خرۆشیان لە ئاراستەی بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیاندا ڕاهێنراِبێ، بە پێداگرێ و دەمارگرژییەکی سەرسووڕهێنەرانەوە ئەرك و بەرپرسیارەتییەکانیان رادەپەڕێنن. دادوەرێك کە تەواوی هەست و نەستی بە قازانجی لایەنێك بزوابێ و بەو حاڵەشەوە دێ و لە دەرکردنی بڕیارەکەیدا دادپەروەری ڕەچاو دەکا، ئەوە هەستی بەرپرسیارەتییە کە هێزی زاڵبوونی بە سەر خۆیدا پێ دەبەخشێ. تین و گوڕێك کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ کەسایەتیی ڕۆژانەی خۆی وەلا بنێ و شوێن و کاریگەریی لە سەر ئەم کەسایەتیی ڕۆژانەیەش دادەنێ. ئارمانج و تواناکانی مرۆڤ، لەو دەمەیدا ئەو لەم حاڵەتە ناوازەیە دایە، دەبنە نموونەیەك کە مرۆڤ لە کات و ساتەکانی دیکەدا کردە و سۆزەکانی خۆی بە بالآیان دەگرێ و هەر لە سەر بنەمای ئەم نموونانەش مەزەندەی تواناکانی خۆی دەکا و ساتەکانی هەژان و خرۆشی (بنیاتنەر) ئەگەرچی وەکو بڵێسە بە گیانی مرۆڤدا تێدەپەڕن، ﴿بەڵام﴾ دەبنە توانستێك کە ماهیەتی ئامانجەکانی مرۆڤ لە چوارچێوەی ئەودا بیچم دەگرێ و لەگەڵی یەك دەگرێ. ئەزموونی گەلانی جۆراوجۆر، هەروەها کەسانی جۆراوجۆر دەریخستووە کە، کەسانی لە جۆش و نەسرەوتوو بە گشتی، نەك لە پانتایی و بواری هزریدا و نە لە بواری کردەییدا، توانایان کەمتر نییە لەو کەسانەی هێمن و لەسەرخۆن. بۆ وێنە، گومان لەوەدا نییە



فەڕەنسییەکان و ئیتاڵییەکان لە چاو نەژادەکانی تیۆتنیك کە نەژادێکی ئەڵمانیی کۆن بوون، دەمارگرژتر (عصبی)ن و ژیانی ڕۆژانەشیان، لانیکەم لە چاو بریتانییەکان، پتر تێکەڵاوی سۆز و هەستە، بەڵام ئایا لە گۆڕەپانی زانست و بازرگانی یا ماف و یاسادانان دا یا لە شەڕ دا لە نەژادەکانی تیۆتنیك دواکەوتوون؟ بەڵگەکان دەیسەلمێنن کە ﴿خەڵکی﴾ یۆنانی کۆن، وەکوو وەچە و تۆرەمەی ئێستایان، یەکێك بوون لە بەتین و گوڕترین ڕەچەڵەکی مرۆڤ. بەڵام هیچ گۆڕەپانێك هەیە ئەوان تێیدا یەکەم نەبووبێتن؟ ڕۆمییەکان، لە بەر ئەوەی وەکو یۆنییانییەکان سەر بە ناوچە باشوورییەکانن، وێدەچێ خووخدەیەکی دەمارگرژانەیان (عصبی) بووبێ. بەڵام ئەوانیش وەکو خەڵکی سپارتە، توندوتیژیی زاڵ بە سەر ژیانیان و تەکووزیی گشتی وای دەخواست کە وەکو نەتەوەیەك، بە پێچەوانەی سروشتیان، ببنە نموونەیەك لە خوێنساردی و لە سەرخۆیی و بەهێزترین سۆز و هەستی سروشتیان بە گشتی لە جیددی بوون و پێداگریدا دەرکەوت و بوو بە هۆی ئەوەی کە خووخدەی ڕەسەن ببێتە خووخدەی دەستکرد. ئەگەر بمانەوێ نموونەیەك وەکو بەڵگە بێنینەوە بۆ ئەوەی دەریخا کە ئەگەر واز لە خەڵکی بە گوڕوتین و لە جۆش بهێندرێ، چییان لێ دێ، دەبێ گەلانی سێلتی ئیرلەندی یەکێك لە باشترین نموونەکان لە قەڵەم دەین (هەڵبەت ئەگەر بکرێ بە خەڵکێکی کە چەندین سەدە لە ژێر دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆی حکوومەتێکی نەشیاو و لە ژێر فێرکارییە ڕاستەوخۆکانی کڵێسەی کاسۆلیك دابوون و خۆیان دڵپاکانە ئیمانیان بە ئایینزای کاسۆلیك هەبووە بڵێین "لێیان گەڕاوین"). بەو پێیە، دەبێ چاوەڕوانیمان هەبێ کە، کەسایەتیی ئیرلەندییەکان، کەسایەتییەکی نادڵخواز و ناماقووڵ بێ. بەڵام هەر کات هەر لەم خەڵکە کەسانێك دەرفەتێکی تا ڕادەیەك لەباریان بۆ ڕەخسابێ، نیشانیان داوە کە دەتوانن لە تەواوی ئەو بوارانە دا کە گەلانی دیکە تێیاندا سەرکەوتوو بوون ئەوانیش سەرکەوتن وەدەست بێنن. ئاکامێك کە دەتوانین لەم باسەی وەرگرین ئەوەیە کە لە بواری تواناکاندا ئەوەندەی فەڕەنسییەکان لە بریتانییەکان و ئیرلەندییەکان لە سوئیسییەکان یا یۆنانی و ئیتاڵییەکان لە ئەڵمانییەکان نزیکن، ژنانیش ئەوەندە لە پیاوان نزیکن. بەو مانایە کە ژنانیش دەتوانن بە گشتی تەواوی ئەو کارانە ڕاپەڕێنن

كه پیاوان له دەستیان دێ بیكەن، هەر چەندە دوور نییە كە لە هێندێ بوارەكاندا لە باری ئاستی پێگەیشتووییەوە جیاوازیگەلێك لەنێوان كاری ئەوان و پیاواندا هەبێ. بەڵام من هیچ گومانم لەوەدا نییە كە ئەگەر پەروەردە و راهێنانی ژنان بە جۆرێك بێ كە خاڵە لاوازە سروشتییەكانیان تێدا نەهێڵێتەوە (لابەرێ)، نەك خراپتریان بكا، ئەوا بە گشتی ئەوان لە دەستیان دێ بەو پەڕی وردی و سەلامەتی كارەكانی پیاوان راپەڕێنن.

بەڵام وای دانێین كە زەینی ژنان بە پێی سروشتی خۆی، لە چاو زەینی پیاوان، بگۆڕتره (زیاتر دەگۆڕدرێ) و ژنان ناتوانن بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ لە بوارێكی تایبەتدا هەوڵی بەردەوام بدەن و بۆیان گونجاوترە كە هێز و توانای خۆیان لە چەند بواردا بخەنە كار هەتا ئەوەی كە لە بوارێكی دیاریكراو و لە ئاراستەی گەیشتن بە بەرزترین پێگەی شیاو. ئەو گریمانەیەی ئێمە، لەوانەیە وەسفی ژیانی ژنانی هەنووكە بێ (هەڵبەت لە نێو ئەم ژنانەشدا گەلێك ژنی دەگمەن و ریزپەڕ هەن كە لەم رێسایەدا جێ ناگرن). هۆكاری دواكەوتنی ژنان لەو بوارانەدا كە پیاوان بە بەرزترین ئاست گەیشتوون لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی مەرجی یەكەمی سەركەوتن لەم بوارگەلە دا ئەوە بووبێ كە كۆمەڵێك چەمك و بەرپرسیارەتیی دیاریكراو هەموو زەینی داگیر كردبێ و تاك تەواوی توانای زەینیی خۆی خستبێتە سەر ئەوانە. بەڵام ئەو جیاوازییە جیاوازییەكە، كە كاریگەری لە سەر بالاترین ئاستی كار دادەنێ نەك لە سەر "كەماڵ" ی ئەو یا لە سەر بەهای پراكتیكی كار. سەرەڕای ئەوەش، هێشتا دیار نییە كە ئایا چالاكیی چڕی بەشێك لە مێشك (زەین) و خەریككردنی تەواوی هێزی بیركردنەوە لە یەك ئاراستەدا و كۆكردنەوەی لە سەر بابەتێكی دەستنیشانكراو، رەوشێكە كە بۆ تواناكانی مرۆڤ سەلامەتیهێنەر و سروشتییە تەنانەت ئەو دەمەش كە لە بواری تیۆریكیشدا ئیشیان پێ دەكرێ؟ من لە سەر ئەو باوەڕەم كە لە بڕی ئەو پێشكەوتنانەی كە لە رێگەی ئەو بە سەنتەركردنەی زەیندا بە مرۆڤ دەبردرێ لە ئامانج و بوارەكانی دیكەی ژیاندا لە توانا زەینییەكانی مرۆڤ، كەم دەبێتەوە و دڵنیاشم تەنانەت لە تێفكرینی ئابستراكتیشدا ئەگەر بە جێگەی ئەوەی كە بێ وچان خەریكی تاقە یەك بابەت بین، چەندین جار بە جێی بێڵین و بچینەوە سەری، ئەوا توانای زەین



زیاتر دەبێ. بە هەر حاڵ بۆ ئامانجە پراكتیكییەكان، لە كەمترینیانەوە بگرە هەتا دەگاتە بالاترینیان، توانستی بە جێ هێشتنی بابەتێك و چوونە سەر بابەتێكیتر، بە بێ ئەوەی لە هێزی زەین كەم بێتەوە، توانستێكی ئێجگار بە نرخن و ژنان پتر خاوەنی ئەم تواناییەن و هەر لە بەر ئەم توانایی و خۆڕێكخستن و و گۆڕانهەڵگرییەشە كە دەكەونە بەر لۆمەو سەركۆنە. لەوانەیە سروشت وەها توانایەكی پێ بەخشیبێن، بەڵام هیچ گومان لەوە دا نییە كە پەروەردە و فێركردنی ژنان وەهایە كە ئەم تایبەتمەندییەیان تێدا بەهێزتر دەكا، چونكە نزیكەی هەموو ئەو كارانەی لە ئەستۆی ژنانن پێویستیان بە وردبوونەوە و وردبینییە لە پاژ و وردەكارییە جۆراوجۆرەكان. وردەكاریگەلێك كە زەین تەنانەت ناتوانێ بۆ ساتێكیش هەڵوێستەیان لە سەر بكا، لە بەر ئەوەی دەبێ بە وردەكارییەكانی دیكەوە خەریك بێ. جا ئەگەر مەسەلەیەك بێتە پێش كە پێویستیی بە تێڕامانی زیاتر بێ، ئەوا ژن دەبێ لە كاتی پشوودانداا هیچ ساتێك لە كیس خۆی نەدا و بەردەوام بیری لێ بكاتەوە. زۆر كەس ئەو راستییەیان بۆ دەركەوتووە كە ژنان دەتوانن لە هەلومەرجی ئەوتۆدا بیر بكەنەوە كە ئەگەر پیاوان بە گشتی لەوەها دۆخێكدا بن، ئەوا دەیكەنە بیانوویەك بۆ خۆدەربازكردن لە تێڕامان و بیركردنەوە، زەینی ژن دەكرێ بڵێین هەمیشە خەریكە تەنانەت ئەگەر بەشتێكی بچووكیشەوە بێ و ئەستەمە ئیزن بە خۆی بدا كە یەكسەر ئازاد ﴿بێ خەم﴾ بێ، بەڵام زەینی پیاوان جگە لەو كاتانەدا كە خەریكی ئەو كارەن كە بە ئەركی خۆیانی دەزانن، ئازادە و بە مەسەلەی وردەوە خەریك نابێ. ژن لە ژیانی رۆژانەدا مێشكی بە مەسەلەی ئێجگار جۆراوجۆرەوە خەریكە و هەروەكو زەوی ناتوانێ لە گەڕ بكەوێ، زەینی ئەویش ناتوانێ خەریك نەبێ.

بەڵام دەڵێن بەڵگەكانی توێكاری جەستە ئەوە دەسەلمێنن كە پیاوان لە بواری بیركردنەوەدا لە ژنان سەرترن و ئیدعای ئەوە دەكرێ مێشكی پیاوان لە ئی ژنان گەورەترە. وەڵامی من ئەوەیە كە بەر لە هەر شتێك پێویستە ئەوە بزانین كە راستیی ئەم بانگەشەیە گومانی لە سەرە. بە هیچ جۆرێك بە لێبڕاوی نەسەلمێنراوە كە مێشكی ژنان لە هی پیاوان گچكەترە. ئەگەر تەنیا بە پێی ئەو راستییەی كە بە گشتی

جەستەی ژنان لە چاو پیاوان وردترە، ئەو دەرەنجامە وەرگرین کە مێشکیشیان بچووکترە، پێوەرێکمان هەڵبژاردووە کە ئەنجامی سەیر و سەمەرەی لێدەکەوێتەوە. بە پێی ئەم پێودانگە، پیاوێکی چوارشانەی زل، دەبێ زۆر زیرەکتر و بە مشوورتر بێ لە پیاوێکی وردیلانە و فیل و نەهەنگیش دەبێ لە نەژادی مرۆڤ زیرەکتر و بە مشوورتر بن. بە وتەی توێکارانی جەستە، جیاوازیی نێوان گەورەیی مێشکی مرۆڤەکان زۆر کەمترە لە جیاوازیی نێوان ئەندامەکانی دیکەی تەنانەت سەریش. بە هیچ جۆرێك ناکرێ بە پێی گەورەیی ئەم یا ئەو ئەندامی جەستە، گەورەیی مێشك دیاریبکەین. دیارە کە هێندێ ژن مێشکیان بە ئەندازەی ﴿مێشکی﴾ پیاو گەورەیە. تا ئەو جێگەی من ئاگادار بم بە وتەی پیاوێك کە مێشکی گەلێك مرۆڤی کێشابوو، قورسترین میشك ی ژنێك بووە و مێشکی، ئەو تەنانەت لە مێشکی کوڤیەی سروشتناسی فەڕەنسی (١٧٦٩-١٨٣٢) -کە هەتا ئەو کات بە قورسترین مێشك دەژمێردرا) قورستر بووە. خاڵێکی گرینگی دیکە ئەوەیە کە هێشتا بە وردی روون نەبۆتەوە کە چ پێوەندییەك هەیە لەنێوان مێشك و تواناییە زەینییەکاندا و ئەو مەسەلەیە جێی گەلێك باس و مشتومڕە. هەڵبەت گومان لەوە دا نییە کە پێوەندییەکی نزیکیان لە نێواندایە. مێشك ئەندامی ماددیی هەست و بیرکردنەویە، بەڵام ناکۆکی و مشتومڕ زۆرە لە سەر ئەوەی کە هەر کام لە بەشەکانی مێشك بۆ چ تواناییەکی زەینی تەرخانە. بەڵام بە رای من، جگە لە تەواوی ئەم ناکۆکییانە، دەبێ ئەوە قەبووڵبکەین کە ئەگەر ئەندازەی ئەندامێك پێوەندیی بەو ئەرکەوە نەبێ کە لەئەستۆیەتی و گەورەتربوونی ئەو ئەندامە هێزێکی پتری لێ نەکەوێتەوە، ئەوا لەگەڵ شتێکی نائاسایی و سەیر رووبەڕووین، شتێکی ناوازە لە هەموو زانیارییەکانمان لەمەڕ یاسا گشتییەکانی ژیان و نەزمی زاڵ بە سەر جیهاندا. بەڵام ئەگەر ئەو ئەندامە بەس بە رێگەی قەبارەکەیەوە هێزوتوانایی خۆی سەپاندبا، دیسانیش هەر لەگەڵ شتێکی بەمشێوەیە ناوازە و سەیر رووبەڕوو دەبووین. لە هەموو ئافرێنراوە ورد و پڕ وردەکارییەکانی سروشتدا (کە گیانلەبەران لە هەمووان پڕ وردەکاریترن و لە نێو گیانلەبەرانیشدا سیستەمی دەمارەکان (عصبی) لە هەموان پڕ وردەکاریترە) ئەوەندەی جیاوازیی ئاستی تواناییەکان بە چەندایەتییەوە



گرێدراوە ئەوەندەش بە چلۆنایەتیی توخمە پێکهێنەرەکانەوە بەستراوەتەوە و ئەگەر چلۆنایەتیی ئەندام بە پێی وردی و وردەکاریی ئیشەکەی هەڵسەنگێنین، لە بەڵگەکانەوە وا دەردەکەوێ کە مێشك و سیستەمی دەماریی ژنان- لە چاو پیاوان، لە باری چلۆنایەتییەوە تا ئاستێکی نێونج لە سەرترە. بەڵام ئێمە واز لە جیاوازیی چلۆنایەتی دێنین کە مەسەلەیەکی ئابستراکتە و سەلماندنیشی ئەستەمە. لە بڕی ئەوە جەخت دەکەینەوە لە سەر ئەوەی کە نابێ کارلێهاتوویی ئەندامێك تەنیا بە پێی قەبارەکەی هەڵسەنگێندرێ، بەڵکو دەبێ رادەی چالاکییەکەشی لە بەر چاو بگیردرێ. تەوژمی گەڕانی خوێن لەئەندامێکدا بەڵگەیەکە، کە تا رادەیەك رادەی چالاکیی ئەو ئەندامە پێشان دەدا و هێزی چالاکی و خۆداڕشتنەوەشی بە گشتی بەستراوەتەوە بە رادەی گەڕانی خوێن. کەواتە، سەیر نابێ ئەگەر بە گشتی پیاوان مێشکیان لە مێشکی ژنان گەورەتر بێ و سووڕی خوێنیش لە مێشکی ژناندا باشتر بێ لە چاو پیاوان. هەڵبەت لە بیرمان نەچێ کە ئەوە تەنیا گریمانەیەکە، بەڵام سازگارە لەگەڵ ئەو جیاوازییانەی لە کردەوەی زەینیی ژن و پیاودا بەدی دەکرێن.

بە سەرنجدان لەو گریمانەیە و لە رێگەی ئەم بەراوردکارییەوە، هێندێ چاوەڕوانیمان بۆ دروست دەبێ کە هێندێکیان لەگەڵ ئەو شتەی بە شێوەی گشتی دەیبینین یەك دەگرنەوە. بەر لە هەرشتێك، وا چاوەڕوان دەکرێ کە کارکردە زەینییەکانی پیاوان هێواشتر بێ، بەو مانایە کە ئەوان ناتوانن بە خێراییەکی وەك ژنان هەست پێ بکەن و بیربکەنەوە. لە بنەڕەتدا مێشکی گەورەتر کاتی پتری دەوێ بۆ ئەوەی بگاتە تەشقی جووڵە و کارایی، لەلایەکی دیکەشەوە، کاتێك بەو ئاستە گەیشت تاقەت و خۆڕاگرییەکی زیاتری بۆ کارپێکردن هەیە. وەها مێشکێك لەو بوارە و ئاراستەیەدا کە لە سەرەتاوە بۆ کارکردن هەڵیدەبژێرێ تۆکمەتر و قایمتر کار دەکا، بەڵام بەلایەوە دژوارە کارێك وەلابنێ و بچێتەوە سەر کارێکیتر. بەڵام دەتوانێ هەر لەم ئاراستەیەدا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەبێ ئەوەی هێز و وزەی دابەزێ یا هەست بە ماندووبوون بکا، درێژە بە کارەکەی بدا و

بەردەوام بێ. بۆ مەگەر نابینین کە پیاوان لەو بوارانە دا خۆیان زۆر پێ لە ژنان زیاتر بووە کە بەر لە هەر شتێك پێویستی بە کاری بەردەوام و یەك شێوە لە سەر بابەتێك بووە؟ ئایا ژنان لەو کارانە دا کە دەبێ بە خێرایی بچنە پێش و راپەڕێندرێن باشتر کارایی لە خۆیان نانوێنن؟

مێشکی ئافرەتێك خێراتر ماندوو دەبێ و تاقەتی نامێنێ، بەڵام دەکرێ چاوەڕوانیت لێی هەبێ کە بە پێی رادەی ماندووبوونەکەی، زووتر وەك خۆی لێ بێتەوە؟ دیسانیش دووبارەی دەکەمەوە کە ئەوەی باسمکرد لە گریمانەیەك بەو لاوە نییە و تەنیا ئاراستەیەك بۆ توێژینەوە و شەنوکەوکردن پێشنیار دەکا. من خۆم بەر لەوەش وتم کە ناتوانین لێبڕاوانە بڵێین: لە رووی نیونجی توانایی یا توانا و گرۆییەکانەوە جیاوازییەکی سروشتی لەنێوان ژن و پیاودا هەیە، جا چ بگا بەوەی کە پێمان وابێ ماهیەتی ئەم جیاوازییەمان ناسیوە. ئێستاکە یاسا سایکۆلۆژییەکانی پێکهاتنی کەسایەتیی تەنانەت لە ئاستێکی گشتیشدا وا بە کەمی موتاڵێ کراون و دەکرێ بڵێین هیچ تاوتوێ کردنێکی زانستی لەم مەسەلەیە نەکراوە، ناتوانین بڵێین لە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو تێ گەیشتووین. هەروەها کاتێك دیارترینی ئەو فاکتەرە دەرەکییانەی جیاوازیی لەنێوان کەسایەتییەکان پێکدێنن بە پێی عادەت پشتگوێ دەخرێن ئیتر ناسینی ئەم جیاوازییانە مەیسەر نابێ (بینەر کە هیچ گرینگییەك بەم فاکتەرانە نادا کە  هەردووك قوتابخانەی باو، واتە مێژووی سروشتی و فەلسەفەی زەینیMental Philosophy بە چاوی سووکەوە لەم فاکتەرانە دەڕوانن، لایەنگرانی هەر دووك قوتابخانەکە، چ ئەوانەی کە لە چوارچێوەی ماددەدا بە شوێن ئەوە دابوون کە سەرچاوەی ئەو جیاوازییانە بدۆزنەوە وا کۆمەڵانی خەڵك لێك جوێ دەکەنەوە، چ ئەوانەی لە هەرێمی رۆحدا لە سەرچاوەی ئەم جیاوازییانە دەگەڕێن، لە سەر ئەم خاڵە کۆکن کە دەبێ دژبەرانیان لە مەیدان بڕەتێنن، واتە ئەو کەسانەی کە هەوڵدەدەن ئەو جیاوازییانە لە سەر بنەمای ئەو پێوەندییە جۆراوجۆرانە لێکدەنەوە کە مرۆڤەکان لەگەڵ کۆمەڵگە و ژیان هەیانە).



گاڵتەجاڕتر لە هەموو ئەوانە، ئەو بۆچوونانەن کە سەبارەت بە سروشتی ژنان لە نێو خەڵکدا باون. ئەو بۆچوونانە، بەس گشتاندنێکی ئەزموونین کە بەبێ پاڵپشتی تیۆری و یا شیکارانە، لە سەر بنەمای یەکەمین نموونە بینراوەکان بیچمیان گرتووە. لە نێو هەر گەل و نەتەوەیەکدا وێنایەکی تایبەت لە ژن باوی هەیە ئەو وێنایەش سەرچاوەکەی لە بیروبڕوای خەڵك و هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکان دایە. هەلومەرجێك کە ئیزنی بە ژنان داوە لەم یا لەو بوارەدا گەشە بکەن یا لە گەشەکردن لە بوارێکدا پێشی گرتوون. بۆ وێنە، رۆژهەڵاتییەکان دەڵێن ژن لە بواری سێکسدا سروشتێکی بە تینی هەیە و لە نووسراوە هیندییەکاندا، زۆر کەڵکی خراپ لەم بوارەدا لە ژنان وەرگیراوە، بەڵام بریتانییەکان ئافرەتیان پێ کائینێکی ساردوسڕە. ئەو پەندانەی تێیاندا ژن بە ڕاڕایی ناسێندراون بە گشتی زۆربەیان سەرچاوەی فەڕەنسییان هەیە: هەر لەو تاکە شیعرەوە کە فەڕەنسیسی یەکەم لەم بارەیەوە هۆنیوێتەوە هەتا دەگاتە پەندەکانی بەر لەو و پاش ئەویش. لە بریتانیا زیاتر دەڵێن ژنان زۆر لە پیاوان پێداگرترن. ڕاڕایی بوون لەو تایبەتمەندییانەیە کە بۆ ژنان بە سیفەتێکی خراپ لە قەڵەم دەدرێ و  پێشینەی ئەم بۆچوونە لە بریتانیا پترە لە فەڕەنسا. سەرەڕای ئەوە، بیروڕای گشتی لە بریتانیا زۆر پتر لە فەڕەنسا، نهێنیترین تایبەتمەندییەکانی ژنانی خستۆتە بەر داوەریکردن. با ئەو خاڵەشی لێ زیاد کەین کە خەڵکی بریتانیا بۆ داوەریکردن لە سەر ئەوەی کە چ شتێك سروشتییە و چ شتێك ناسروشتی، لە بارودۆخێکی خراپ و نادڵخوازدان. بە تایبەتی ئەگەر بیانەوێ لە سەر بنەمای ئەزموونە نەتەوەییەکانیان بکەونە داوەریکردن.

ئەم نەتوانینە لە داوەریکردندا تەنیا پێوەندیی بە مەسەلەی ژنانەوە نییە. بەڵکو پێوەندیی هەیە بە داوەریکردن لە سەر پیاوان، بە گشتی تەواوی نەژادی مرۆڤیشەوە و هۆیەکەشی ئەوەیە کە لە بریتانیا نەبێ لە هیچ جێگەیەکی دیکە سروشتی مرۆڤ ئاوا بە کەمی تایبەتمەندییە رەسەنەکانی خۆی نەخستۆتە روو. بریتانیاییەکان، هەم بە واتای پڕ بە پێستی وشە و هەم بە باری خراپییەکەیدا، پتر لە تەواوی ئەو نەتەوانەی

پێیان ناوەتە نێو چاخی مودێڕنەوە، لە حاڵەتی سروشتیی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە. ئەوان پتر لە هەر خەڵکێکی دیکە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ژیار و ئەو تەکووزی و دسیپلینەی بە سەریدا زاڵە. بریتانیا وڵاتێکە کە دیسپلینی کۆمەڵایەتی لە هەموو جێگەیەکی دیکە پتر تێیدا پەرەی گرتووە و هەرچی دژایەتیی لەگەڵ ئەم دیسپلینە هەبووە نەك هەر شکستی پێ هێنراوە بەڵکو سەرکوت کراوە و داپڵۆسێنراوە. بریتانیاییەکان، لە هەموو نەتەوەیەك پتر بە پێی یاسا دەجووڵێنەوە، نەك هەر کردەوەیان، بەڵکو هەستیشیان هەر لە سەر بنەمای یاسایە. لە وڵاتانی دیکە، لەوانەیە بیروڕا فەرمییەکان یا پێویستییە کۆمەڵایەتییەکان لە حەز و ئۆگرییە تاکەکەسییەکان بەهێزتر بن، بەڵام دیسانیش لەو دیوی ئەوانەوە حەز و ئۆگرییە سروشتییە تاکەکەسییەکان هەر بەرچاون و زۆر جاریش دەکەوێتە دژایەتییانەوە، بە واتایەکی دیکە، لە وڵاتانی دیکە، لەوانەیە یاسا لە سروشت بەهێزتر بێ، بەڵام سروشتیش هەر هەیە. بەڵام لە بریتانیا یاسا تا رادەیەك جێگەی سروشتی گرتۆتەوە و بەشی مەزنی هەرە زۆری ژیان نەك بە پەیڕەوی لە ویستە سروشتییەکان و لە ژێر چاودێریی یاسادا، بەڵکو بەبێ هیچ حەزێك و تەنیا بە پەیڕەوی لە یاسا، بەڕێوەدەچێ. دیارە ئەم رەوشە هەم خاڵی لاوازی هەیە هەم خاڵی بەهێز و باش. بەڵام بە هەر حاڵ ئەو خەڵکە بە هیچ شێوەیەك ناتوانن بە پێی ئەزموونە تاکەکەسییەکانی خۆیان، داوەری لە سەر حەز و ویستە رەسەنە سروشتییەکانی مرۆڤ بکەن. هەر کاتێکیش وادەکەن، بیروبۆچوونیان لە راستی و دروستی دوورە. هەڵبەت خەڵکانی دیکەش لە داوەریکردندا تووشی هەڵە دەبن، بەڵام خەتاکانی ئەوان ماهیەتێکی جیاوازی هەیە. بۆ وێنە، بریتانی، بە سروشتی مرۆڤ نامۆیە، بەڵام فەرەنسی داوەریی پێشوەختی لە سەری هەیە. خەتاکانی بەریتانی سلبین، بەلام خەتاکانی فەرەنسی ئیجابین. بریتانی پێی وایە زۆربەی شتەکان هەر بوونیان نییە، چونکە لە دەوروبەری خۆی نایانبینێ. بەڵام فەرەنسییەکان پێیان وایە ئەو شتانە هەمیشە هەن و هەر دەشبێ هەبن، چونکە دەیان بینێ. بریتانی سروشتی مرۆڤ ناناسێ، لە بەر ئەوەی کە دەرفەتی نەبووە بیان بینێ. کەچی فەرنسی



زۆر شتیان لەو بارەوە دەزانێ، بەڵام لە داوەریکردنەکانیدا زۆربەی تووشی هەڵە دێ. چونکە تەنیا بەشێوەی چەواشەکراو و دەستکرد سروشتی بینیوە. ئەم روانگە جیاوازانە بۆیە سەر هەڵدەدەن چونکە کۆمەڵگە رەوشێکی ناسروشتی بە سەر مرۆدا دەسەپێنێ و ئەم رەوشە بە دوو شێوە ئەو گرۆیی و ئینتیما سروشتییانەی لە ژێر کۆنترۆل و خوێندنەوەدان دادەپۆشێ: یەکەم لە رێگەی سڕینەوەی تایبەتمەندییە سروشتییەکان، دووهەم لە رێگەی گۆڕینی تایبەتمەندییەکانیانەوە. لە حاڵەتی یەکەمدا، تەنیا بەشێکی لاواز و تواوە بۆ خوێندنەوە و موتالا ماوەتەوە، لە حاڵەتی دووهەمدا، گەلێك رەگەز بۆ موتالا لە بەردەستن، بەڵام واقیعی بەر موتالا لەوانەیە لە ئاراستەگەلێکی پێچەوانەی ئاراستەی سروشتی و  خۆڕسکدا پەروەردە کرابێ.

من پێشتریش گوتم کە ئێستا بە هیچ شێوەیەك ناتوانین بڵێین لەو جیاوازییانەی لە نێوان ژن و پیاودا هەن، کامیان سروشتین و کامیان ناسروشتین (دەستکرد). هەروەها ناتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە ئایا بە شێوەی بنەمایی هیچ جیاوازی یا جیاوازیگەلێك لەنێوان ژن و پیاودا هەیە یانە. ئەی ئەگەر تەواوی ئەو فاکتەرە ناسروشتییانەی بەدیهێنەری ئەم جیاوازییانەن لە نێو ببردرێن کەسایەتیی مرۆڤ بە چ شێوەیەکی لێ دێ؟ من نامەوێ دەست بۆ کارێك بەرم کە خۆم پێم مەحاڵە. بەڵام لە جێگەیەك کە گومان هەیە، گریمانەو بۆچوون بڤە نییە. لە جێگەیەکیش کە دڵنیایی رێگەی نییە، لەوانەیە گەیشتن بە "ئەگەر" بلوێ و  باش بێ.

یەکەم شت سەبارەت بە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو دۆزینەوەی چاوگەی ئەو جیاوازییانەیە کە ئێستا هەن. هەر ئەو مەسەلەیە، ساکارترین مەسەلەیە بۆ تێگەیشتن کە دەکرێ تێی بفکری و من هەوڵ دەدەم لەو تاقە رێگەیەوە کە بۆ ئەوە دەبێ بیری لێ بکەیتەوە بچمە سەری، واتە بە شەنوکەوی ئەوەی کە فاکتەرە دەرکییەکان لەوانەیە چ کاریگەرییەك لە سەر زەین بە جێ بهێڵن. ئاشکرایە کە ناتوانین هیچ مرۆڤێك لەو هەلومەرج و ژینگەیە دابڕین کە تێیدا ژیاوە. بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە بە پشتبەستن بە ئەزموون لەوە تێ بگەین کە سروشت چ جۆرە کەسایەتییەك

دەخوازێ، بەڵام دەتوانین سەرنجی خۆ بدەینە ئەو ڕەوشەی هەنووکە ئەوی تێدایە، هەروەها بە هەلومەرجێك کە تێیدا ژیاوە، بزانین کە لەو هەلومەرجانەدا دەکرا شتێکی دیکە بەرهەم بێ؟

ئیزن بدەن لێرەدا بچینە سەر ئاشکراترین و ڕوونترین جیاوازییەك کە لەنێوان ژن و پیاودا هەیە و ژنانی خستۆتە خوار پیاوانەوە ( لێرەدا، بە ئانقەست، باسمان لە هێزی فیزیکی (جەستەیی) نەکردووە کە پێوەندیی بە جەستەوە هەیە). ئەم جیاوازییە ئێجگار ڕوونە پێوەندیی بە دەستکەوتەکانی مرۆڤەوە هەیە: لە گۆڕەپانی زانست و فەلسەفە و هونەردا هیچ دەستکەوتێکی پلە یەکەم ئی ژنێك نەبووە. ﴿هیچ ژنێك دەستکەوتێکی پلەی یەکەمی لەم بوارانەدا نەبووە﴾. ئایا دەتوانین بەبێ گریمانەی ئەوەی کە بە پێی سروشت ژنان نەیانتوانیوە  خۆ لەم کارانە بدەن، ڕوونکردنەوەیەکی لۆژیکانە لەم ڕاستییە بخەینەڕوو؟

بەر لە هەر شتێك دەبێ بپرسین ئایا ئەزموونەکان ئەوەندەمان زانیاری دەخەنە بەردەست کە بتوانین لێبڕاوانە ڕادەربڕین؟ ئەگەر شتە ڕیزپەڕەکان وەلابنێین، ئەوە تازە سێ نەوەیە کە ژنان بواریان بۆ ڕەخساوە تواناکانیان لە پانتایی زانست و فەلسەفە و هونەردا بخەنەگەڕ و تەنیا لەم نەوەیەی ئێستایان ژمارەیەکی زۆریان ڕوویان لەم بوارانە کردووە. تەنانەت هەر ئێستاش (سەردەمی نووسەر) لە هەموو شوێنێك، بێجگە لە بریتانیا و فەڕەنسا، ژمارەی ئەو ژنانە ئێجگار کەمە.کەوابوو جێی خۆیەتی بپرسین کە ئایا دەکرێ چاوەڕوان بین کە لەم ماوە کورتەدا، ژن گەلێك لە گۆڕەپانی بیر و داهێنانی هونەریدا سەریان هەڵبدەن، کە شان لە شانی کەڵە پیاوان بدەن؟ ئایا بە سەرنجدان بە کەمیی ڕێژەی ئەو ژنانە کە زەوق و پێگەی کەسێنییان ئیزنی دەدا ڕووبکەنە  ئەم جۆرە ئیشانە، دەکرێ چاوەڕوانیمان هەبێ ژنی لەم چەشنە سەرهەڵ بدەن؟ من پێموایە تەنانەت ئەگەر تەنیا بە پێودانگی ژمارەی دەرفەتەکان داوەری بکەین، وەها چاوەڕوانییەك بێ جێ و ناهەقە. لەم بوارانەدا کە ژنان توانایی خۆیان تاقی کردۆتەوە، بە سەرنجدان بە ماوەی چالاکییان و ژمارەی ڕکەبەرەکانیان، ئەوەی بە دەستیان هێناوە، هەروەها چەند و چۆنێتی ئەو



خەڵاتانەی بردوویانەتەوە، بەو چەشنە بووە کە چاوەڕوانی دەکرا. و ئەوەش جگە لەو بارەیەوە کە ئەوپەڕی پێگەیشتوویی لە بەر چاو بووە، لە هەموو شتێکدا ڕاستە. بە تایبەت لە باری ئەدەبیات (هەم شیعر و هەم پەخشان) ئەوە ڕاستە. واتە ئەو بیاڤەی چالاکیی ژنان تێیدا لە هەموو بیاڤەکانی دیکە پتر بووە. بە ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو دەبینین کە تەنانەت لەسەردەمێکدا کە ڕێژەی ئەو ژنانەی توانای خۆیان لە ئەدەبیاتدا تاقی دەکردەوە، دیسانیش ئافرەت گەلێك دەبینین کە لە کاری خۆیاندا زۆر سەرکەوتوو بوون. یۆنانییەکان هەمیشە سافۆ Sappho (سەدەی هەشتەمی بەر لە زایین) بە یەکێك لە شاعیرانی گەورەی خۆیان لە قەڵەم دەدەن. یا ئەوەی کە میرتیس Myrtis کە دەڵێن مامۆستای پیندارpindar (سەدەی پێنجەمی بەر لە زایین) بووە هەروەها کۆرینا Corinna (سەدەی پێنجەمی بەر لە زایین) کە پێنج جار خەڵاتی شاعیریی لە پیندار بردەوە، لەوانەیە شیاوی ئەوە بن کە ناویان بێتە ڕیزی سافۆ، ئەسپازیا Aspasia، بەرپرسی کۆڕێکی ئەدەبیی و  فەلسەفی لە یۆنان (٤٧٠-٤١٠ی بەر لە زایین) هەر چەندە هیچ بەرهەمێکی فەلسەفیی لە پاش بە جێ نەما بەڵام هەموان دان بەوە دادەنێن کە سوقرات بۆ شت فێربوون دەچووە لای ئەو، خۆی سوقراتیش دانی بەوە دا دێنا کە گەلێك وانەی لێ فێر بووە.

ئەگەر بەرهەمەکانی ژنان لە چاخی مودێڕندا لە بەر چاو بگرین و لەگەڵ بەرهەمی پیاوان لە بواری هونەری ئەدەبیاتدا بەراوەردیان بکەین تێدەگەین کە ژنان بە لای زۆرەوە، لە ڕوویەکەوە لە خوار پیاوانەوەن، ئەویش لە ئافراندن و داهێنانی نوێ دایە کە بە دڵنیاییەوە گەلێك گرینگە. هەڵبەت نەك ئەوەی کە بڵێین هیچ ئافراندن و داهێنانێك لە بەرهەمەکانی ژناندا نییە، چونکە هەر کام لە بەرهەمەکانی زەینی مرۆڤ کە بەهایەکی سروشتی هەبێ، خولقێنەری و  ڕەسەنایەتیی تایبەت بە خۆی پێوەیە، بەو مانایە کە هەڵقوڵاوی خودی زەینە، نەك لاساییکردنەوەی شتێکی دیکە. لە نووسینەکانی ژناندا گەلێك بیرۆکەی ڕەسەن بەدیدەکرێن (مەبەست لە ڕەسەنایەتیی لێرەدا، ئەوەیە کە وەرنەگیرابێ، بەو واتایە کە لە بینین و پرۆسە زەینییەکانی نووسەر

خۆیەوە، سەرچاوەیان گرتووە). بەڵام هەتا ئێستاش هیچ کام لەو هزرە مەزنانەی دەروویەکی نوێیان لە یەکێك لە بیاڤە هزرییەکاندا کردۆتەوە، لە زەینی ئافرەتەوە سەرچاوەیان نەگرتووە و هیچ ژنێکیش لە بیاڤی هونەردا داهێنانێکی ئەوتۆی نەبووە کە دوورەدیمەنێکی نوێ بخولقێنێ و قوتابخانەیەکی نوێ وەدی بێنێ. بەرهەمەکانی ژنان بە زۆرەوە، لە کۆی ئەو هزرانە ئاو دەخۆنەوە کە هەن و بەرهەمەکانیان لەو نموونانەی لە گۆڕێدان زۆر دوور ناکەونەوە. تەنیا فاکتەرێك کە بەرهەمەکانی ژنان دەخاتە خوارەوەی پیاوان هەر ئەوەیە، بەڵام ئەگەر بە پێی شێوەی بەڕێوەبردن و بە کار هێنانی وردی هزر و پوختەیی ستایل ناسیی بەرهەمەکانیان هەڵسەنگێنین، لە بەرهەمەکانی پیاوان کەمتر نین. باشترین ڕۆماننووسەکانی ئێمە لە رووی چیرۆك داڕشتنەوە و ڕێکخستن و ڕێکوپێك کردنی وردەکارییەکان زۆربەی جاران ئافرەت بوون. لە سەرانسەری ئەدەبیاتی مودێڕنە دا ناتوانین بڵێین شێوازێك هەیە لە شێوازی مادام دۆستاڵ ڕەوانتر بێ بۆ دەربڕینی هزر و بیر. لە رووی ڕەسەنایەتیی هونەریشەوە، هیچ دەقێکی پەخشانی لە پەخشانی مادام سێند باشتر و بەرزتر بەدی ناکرێ. کاریگەریی شێوازەکەی ئەو لە سەر دەزگای دەماری (عصبی) مرۆڤ وەکو کاریگەریی سەمفۆنیاکانی هایدێن و موزارت وایە. بەڵام هەروەکو پێشتر گوتمان، کەمایەسیی ژنان بە گشتی ئەوەیە کە خولقاندنیان لە ئاستی لوتکەدا نییە. با بزانین ئێستا دەتوانین پاساوێکی لۆژیکییانە بۆ ئەم کەموکورتییە بخەینە روو؟

ئەگەر لە روانگەی بیر و فیکرێکی رووت و رەبەنەوە لێی بڕوانین، بەر لە هەر شتێك دەبێ ئەوەمان لە بەر چاو بێ کە بە درێژایی ژینی مرۆڤ و لە ئاراستەی گەشە و هەڵدانی کولتوور و شارستانییەت، قۆناغێك هەبووە کە دەکرا (لەو قۆناغەدا) بە بڕێك موتاڵا کردن و بەو زانیارییە کەمەوە و تەنیا بە پشتبەستن بە هەڵکەوتوویی (نبوغ)، کۆمەڵێك حەقیقەتی گرینگ و باش دەستەبەر بکەین. بەڵام لە سەرانسەری ئەو قۆناغەدا ژنان بە هیچ شێوەیەك ڕێگەیان پێنەدرابوو بێنە بیاڤی هزرەوە. لە سەردەمی "هاپیی شیا"۱ وە هەتا قۆناغی "ریفۆرمی ئایینی"، زۆر وێدەچێ



هێلۆییز۲ تاقانە ئافرەتێك بێ کە لە بیاڤی هزردا گەیشتبووە پلەیەکی بەرز. ناشزانین ئەگەر ئەو لە ژیانیدا تووشی قۆرتی[1]* گەورە نەهاتبایە چ هزرگەلێکی مەزنی بۆ مرۆڤ بە یادگاری لە پاش بە جێ دەما. بەڵام کاتێك ژنان بە ڕێژەیەکی بەرچاو هاتنە نێو بیاڤی هزر و بیرەوە، ئیتر داهێنان و خولقاندن بە سادەیی و بە پشتبەستن بە هەڵکەوتەیی (نبوغ)ی رووت و ئابستراکت کردەنی نەبوو.

١. hypatia: ژنێکی یۆنانی کە لە ئەسکەندەرییە مامۆستا بوو و دامەزرێنەری قوتابخانەی ینۆئەفلاتوونی بوو. لە ماتماتیکیشدا بەرهەمگەلێکی لە پاش بە جێ ماون. (٣٧٠ ـ ٤١٥ز)

٢. Heloisa هزرڤانی ئایینیی فەڕەنسی (١٠٩٨-١١٦٤ز)

هەتا ئێستا نزیك بە تەواوی ئەو هزرانەی کە دەکرا تەنیا بە پاڵپشتی توانا سروشتییەکان دەستەبەر بکرێن، پشکوون و داهێنانی نوێ، لە بەرزترین ئاستی خۆیدا، دەکرێ بڵێین هیچ کات مەیسەر نابێ مەگەر بۆ ئەو مێشك و زەینە بە توانایانەی کە بە ڕێکوپێکی موتاڵایان کردووە و بە قووڵی بیروڕای پێشینانیان ناسیوە. پێموایە موریس بووە کە سەبارەت بە چاخی ئێستا گوتوویەتی: ڕەسەنترین هزرڤانان ئەوانەن کە بیروڕای پێشینانی خۆیان بە باشترین شێوە دەناسن و لەمەو دواش هەر وا دەبێ. ئێستا هەر کەس بیەوێ بەردێکی دیکە لە سەر شوورەی کۆشکی مەزنی هزر زیاد بکا، دەبێ لە سەر ئەو هەموو بەردە دابنێ کە لەم بینایەدا دانراون. بە واتایەکی دیکە، بۆ ئەوەی لە قۆناخی هەنووکەی ئیشکردندا شتێك وەئەستۆ بگرێ، دەبێ تاڵی و سوێری سەرکەوتن لەم بینایە لە بەر خۆی شیرن بکا. هەتا ئێستا چەند ئافرەت وەها ڕێگەیەکی دژواریان بڕیوە؟ لەوانەیە خاتوو سۆمێرڤیل *[2] Somerville تاقانە ژنێك

---

١- نسیبەت، بەڵا

٢- ژنێکی سکۆتلەندی کە لە ماتماتیك و زانستی سروشت ناسیدا خاوەن بەرهەمە.(١٧٨٠ ـ ١٨٣٢)

بێ کە زانیارییەکانی لە بارەی ماتماتیکەوە ئەوەندەیە کە بتوانێ لەم بیاڤەدا داهێنانی نوێ بکا، ئێستاکە ئەم یەك کەسە نەیتوانیوە ناوی خۆی بخاتە پاڵ دوو یا سێ کەسەوە کە بە درێژایی ژیانی ئەو ماتماتیکیان چەند هەنگاوێك بەرەو پێش بردووە، ئایا ئەوە بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی کەمتوانایی ژنان؟ لەو کاتەوە کە ئابووریی سیاسی بووەتە زانستێك، تەنیا دوو ژن بە جۆرێك فێری ئابووریی سیاسی بوونە کە بتوانن بابەتگەلێکی بەسوودی لە سەر بنووسن. بە سەرنجدان بەو هەموو پیاوەی لەم بوارەدا دەستیان داوتە نووسین، ئایا دەکرێ چاوەڕوانیمان هەبێ کە دەستکەوتەکانی ژنان لەم بوارەدا بۆ ئەوە بن لەگەڵ ئی پیاوان بەراورد بکرێن؟ ڕاستە هەتا ئێستاش ﴿سەردەمی نووسەر﴾ هیچ ژنێك نەبۆتە مێژووزانێکی گەورە، بەڵام کامە ژن لەم بوارەدا زانیاریی پێویستی وەدەست هێناوە؟ دیارە لە نێو واژەناسانی مەزندا هەتا ئێستاش ناوی هیچ ژنێك بە دی ناکەین، بەڵام کامە ژن فێری زمانی سەن سکریت یا سلاوی یا گووتی یا فارسیی زەند ئاڤێستایی بووە؟ تەنانەت لە مەسەلە زانستییەکانیشدا "نبوغ" ی پەروەردەنەکراو لە بواری داهێناندا ناگاتە هیچ کوێ و هەروەکو هەمووشمان دەزانین دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاك ئەو شتانە سەر لە نوێ دروستبکاتەوە کە پێشتر دروستکراو و وەستاکارانی دوایی تەواویان کردووە و ئەو پێی وابێ داهێنانی کردووە. تەنیا کاتێك دەتوانین بە پێی بەڵگە ئەزموونکراوەکان داوەری لە سەر داهێنانی ژنان بکەین، کە ئەوان پێویستییەکانی داهێنانیان لەم یا لەو بوارەدا وەدەستهێنابێ و لەم بارەیەوە پێگەیەکی یەکسانیان هەبێ لەگەڵ پیاوان.

بێگومان زۆر هەڵدەکەوێ کەسێك بەبێ ئەوەی بیروڕای خەڵکانی دیکەی لە سەر مەسەلەیەك بە وردی و لە هەموو ڕەهەندەکانەوە موتالا کردبێ، دەتوانێ لە سایەی هۆشیاری و زیرەکیی سروشتیی خۆیەوە لە هێندێ شت تێبگا و بیرۆکەی وا بێنییە گۆڕێ کە ئەگەر پوختە بکرێن خەرمانی زانستی مرۆیی دەوڵەمەندتر دەکەن. بەڵام تەنانەت لەم حاڵەتانەشدا ئەم کەسە ناتوانێ ڕاستیی بۆچوونەکانی خۆی بسەلمێنێ. ناشکرێ لە سەر بۆچوونەکەی داوەری بکرێ هەتا ئەوەی کە کەسێکیتر کە پێشەکییە



پێویستەکان فێر بووە و ئاگاداری بیروڕای پێشینیانە، بیروڕاکەی ئەو هەڵسەنگێنی و فۆرمێکی زانستی یا کردەیی پێ بدا و لە نێو حەقیقەتە فەلسەفی و زانستییەکاندا لە پێگەیەکی شیاودا دایبنێ. ئایا بیرۆکەگەلی ئاوا باش قەت بە مێشکی ژناندا ختوورە ناکەن؟ بێگومان وانییە و چیها بیرۆکەی نوێ لە زەینی ژنانی خاوەن ئاوەز و ژیردا شێوە دەگرن و بەبێ ئاکام وەلادەنرێن و بە بادا دەچن. چونکە ژنان زۆربەیان هاوڕێ یان هاوسەرێکی وایان نییە کە زانیاریی پێویستیان هەبێ و بتوانن ئەندێشە و هزرەکانی ئەو لە محەك بدەن و بیخەنە بەر دیدی بیروڕای گشتی. تەنانەت ئەگەر ژنێك شتێکی لەم جۆرەشی بۆ هەڵکەوێ و بتوانێ بیرۆکەی خۆی بگەیەنێتە لای خاوەن ڕایان دیسانیش لەوانەیە بیرۆکەکەی ئەو بە بیرۆکەی پیاوێك لە قەڵەم دەن و ﴿بڵێین پێشتر لەوانەیە پیاوێك دەری بڕیبێ﴾. کێ دەتوانێ بڵێ ڕەسەنترینی ئەو بیرۆکانەی پیاوان دەریان بڕیون، تا چ ڕادەیەك کاریگەریی بیروڕا و پێشنیارەکانی ژنانیان بە سەرەوەیە؟ من بە پێی ئەزموونی خۆم دەڵێم تا ڕادەیەکی زۆر.

ئەگەر ئێمە بیرکردنەوە بە واتا گشتییەکەی وەلانێین و سەرنج بدەینە ئەدەبیات، لەو ئاستە بەرتەسکەیدا و هەروەها بە هونەرە جوانەکان، بۆمان دەرکەوێ کە ئەدەبیاتی ژنان بە گشتی و لە ڕووی تایبەتمەندییە سەرکییەکانیشەوە لاساییکردنەوەی ئەدەبیاتی پیاوان بووە و هۆکارەکەشی ڕوونە بۆچی وەکو ڕەخنەگران بەردەوام دەیلێینەوە و دەیلێینەوە، ئەدەبیاتی ڕۆم ڕەسەن نییە و لاساییکردنەوەیەکە لە ئەدەبیاتی یۆنان؟ هۆیەکەی ڕوونە: یۆنانییەکان بەر لە ڕۆمییەکان بوون. ئەگەر ژنان لە نیشتمانێکی دوور لە پیاوان ژیابان و هەرگیز نووسینەکانیان نەخوێندبایەوە، ئەدەبیاتی تایبەت بە خۆیانیان دەخولڤاند. بەڵام ئێستا کە ڕەوشەکە وەها نەبووە، ئەوان ڕوویان نەکردە خولڤاندنی وەها ئەدەبیاتێك، چونکە ئەدەبیاتێکی ئێجگار پێشکەوتوانەیان لە بەر دەستدا بووە. ئەگەر هەتا بەر لە ڕێنیسانس پسانەوەیەك لە ناسینی سەردەمی کەونارادا ڕووی نەدابا، یا ئەگەر ڕێنسانس بەر لەوەی کڵێسەکانی گوتیك سازکران ڕووی دابایە، ئەمجۆرە کڵێسەیانە هیچ کات ساز نەدەکران. دەزانین کە

لە فەرەنسا و ئیتاڵیا، لاساییکردنەوەی ئەدەبیاتی کەونارا داهێنان لە بواری ئەدەبیدا، تەنانەت پاش ئەوەی کە دەستی پێکردبوو، راگرت. تەواوی ئەو ژنانەی رووددەکەنە نووسین بە قوتابیانی نووسەرانی پیاو لە قەڵەم دەردرێن. هەر شێوەکارێك تەنانەت ئەگەر لە ئاستی رافائێل دابێ. بەرهەمە سەرەتاییەکانی لە بەرهەمی مامۆستاکەی دەچن. تەنانەت ئاوازدانەرێکی مەزنی وەکو موتزارتیش، لە یەکەمین بەرهەمەکانیدا، خوڵقێنەریی سەرسوورهێنەری خۆی دەرناخا. هەروەکو گەلێك سالآنی پێ دەوێ تا تواناکانی کەسێك بێنە بەرهەم، چەندین نەوەی دەوێ بۆ ئەوەی توانا شاراوەکانی نێو جەماوەری ژنانیش بپشکوێن. ئەگەر بڕیار بێ ماهیەتی گشتیی ئەدەبیاتی ژنان لە ئی پیاوان جیاوازبێ و ئەم جیاوازییەش سەرچاوەی لە گرۆیی و ئینتیما سروشتییەکانی ژن و پیاو دابێ، بۆ ئەوەی ژنان بتوانن ئەدەبیاتی خۆیان لە ژێر کارتێکەریی نموونە سەرمەشقەکانی باو رزگار بکەن و وەشوێن هەست و حەزە تایبەتییەکانی خۆیان بکەون، دەم و کاتێکی دوور و درێژی پێویستە. بەڵام ئەگەر هەروەکو من باوەڕم وایە، جیاوازییەك لەنێوان گرۆیی و مەیلە سروشتییەکانی ژن و پیاودا نەبێ و جۆری توانا جەوهەرییەکانیان لێك جیاواز نەبن، دیسانیش هەرنووسەرێك حەز و ویستی تایبەت بە خۆی هەیە. بەڵام ئێستا ئەم گرۆیی و ئارەزوانە لە ژێر کاریگەریی نموونەی بالآدەستدا توانایی خۆدەرخستنیان نییە و چەندین نەوە دێن و دەڕۆن تا نووسەران بتوانن لە ژێر ئەم کاریگەرییە دەرباز بن و تاکبوونی خۆیان وەدی بێنن.

لەرواڵەتدا وا دەردەکەوێ کە ژنان لە هونەرە جوانەکاندا ( بە مانای پڕ بە پێستی وشە)، لە چاو پیاوان کەمتر داهێنەرن و کەمتوانایی ئەوان لەم بوارەدا لە هەموو بوارەکانی دیکە پتر بەدیدەکرێ. چونکە بۆچوون وایە کە بیروڕای گشتی نەك ژنان لە ئیشکردن لەم بوارەدا ناگرێتەوە بەڵکو هانیشیان دەدا و ژنان لە پەروەردەکران لەم بوارەدا نەك بێبەش نین بەڵکو خول و پۆلی تایبەتییان بەس بۆ ئەم مەبەستە بۆ تەرخان کراوە. بەو حاڵەشەوە، ژنان لەم بوارەدا تا لە هەموو بوارەکانی پتر لە پیاوان وەدواکەوتوون و بەرهەمەکانیشیان لە باشترین بەرهەمی پیاوان دوور کەوتوونەتەوە.



بەڵام لاوازیی ژنان لەم بوارەدا سەرچاوەی لە راستییەکی ئێجگار ئاشنا دایە، ئەو راستییەی کە زیاتر لە هەر شوێنێکیتر، لە هونەرەجوانەکاندا بەرچاو دەکەوێ ئەویش بالآدەستبوونی بێ سنووری پرۆفشناڵەکانە بە سەر ئاماتۆرەکاندا. راستە نزیك بە هەمووی ژنان لەم یا لەو بواری هونەرە جوانەکاندا کەم و زۆر پەروەردە دەکرێن، بەڵام فێرکارییەکان لەو ئاراستەیەدا نییە کە کاریگەریی لە سەر پێگە کۆمەڵایەتییەکەیان هەبێ یا بتوانن لە رێگەی هونەرەکەیانەوە خۆی بژێنن. بە واتایەکی دیکە تەواوی ئافرەتە هونەرمەندەکان ئاماتۆرن و ئەو ریزپەڕانەش کە هەن لەو جۆرەن کە راستی و دروستی ئەم وتەیە پشتڕاست دەکەنەوە. ژنان فێری مۆسیقا دەکەن، بەڵان نەك بەو مەبەستەی ببنە ئاوازدانەر، بەڵکو بەو مەبەستەی ﴿ئامێری مۆسیقاییی﴾ بژەنن، هەر بۆیەش دەبینین پیاوان لە بواری مۆسیقادا تەنیا لە ئاوازدانەریدا لە ژنان لە سەرتر و بالآدەستتر بوون. تەنیا بوارێکی هونەری کە ژنان بە شێوی پرۆفشناڵ (پسپۆڕی) بە دوایدا دەچن، ئەکتەرییە، لەم بوارەشدا ئەگەر نەڵێین لە سەرووی پیاوانەوەن، بێگومان شانیان لە شانی پیاوان داوە. ئەگەر بمانەوێ بەراوردێکی دادوەرانە بکەین، دەبێ بەرهەمەکانی ژنان لە بوارە جیاجیاکانی هونەردا لەگەڵ بەرهەمی پیاوان بەراوەرد بکەین کە هونەریان نەکردۆتە پیشەی خۆیان. بۆ وێنە، ژنان لە بیاڤی ئاواز دانان دا بەرهەمگەلێکیان خستۆتە روو کە بێگومان شان لە شانی بەرهەمگەلی ئاماتۆری پیاوان دەدەن هەنووکە دەگمەنن ئەو ئافرەتانەی شێوەکارییان کردۆتە ئیشی خۆیان، بەڵام هەر لە نێو ئەم رێژە کەمەشدا، ئەو توانایانەی پشکووتوونە، لەوەی چاوەڕوانکراوە کەمتر نین. تەنانەت لە نێو پیاوانی شێوەکاریشدا، (بە پێچەوانەی بیروڕای راسکین*) لە ماوەی چەند سەدەی رابردوودا کەسایەتییەکی بە ناوبانگ هەڵنەکەوتووە و بەم زوانەش هەڵناکەوێ. شێوەکارانی رابردوو بۆیە لە چاو شێوەکارانی نوێ هەڵکەوتە بوون، چونکە لە قۆناخێکی تایبەتدا پیاوانی زۆر لێوەشاوە لەم بوارە هونەرییەدا توانای خۆیان خستەگەڕ. لە سەدەکانی چواردە و پازدەدا شێوەکارانی ئیتاڵیایی سەرکەوتووترین پیاوانی سەردەمی خۆیان بوون. مەزنترینیان،

وەکو کەڵە پیاوانی یۆنانی کەونار، هەنبانەی زانیاریی سەردەمی خۆیان بوون. بەڵام لەو سەردەمەدا کە ئەوان دەژیان، لە هەست و بیری پیاواندا، هونەر لەو شتە ئێجگار بەنرخانە بوو کە مرۆڤ دەیتوانی تێیدا ببێتە پێشەنگی ئەوانیتر. هەر هونەریش بوو کە پیاوانی دەکردە هاونیشنی پادشایان و دەیهێنانە ریزی نەجیم و مەزنەکان. هەروەکو ئێستا سەرکەوتنە سیاسی و سەربازییەکان چۆن پیاوان دەگەیەننە دەسەڵات و مەزنایەتی. لەسەردەمی ئێمەدا، ئەو پیاوانەی کە تواناییەکی ئەوتۆیان هەیە لە بوارێکدا ئیشدەکەن کە بە لایانەوە لە شێوەکاری گرینگترە، بەو مانایە کە ناوبانگی پتریان بە دیاری بۆ دێنێ و بۆ کۆمەڵگەی مۆێرنیش بە کەڵکترە. تەنیا جاروبار کەسانێکی وەك رێنولدێزو تێرنەر (کە من ناڵێم ئاگاداری پێگەیان لە نێو پیاوانی بەناوبانگدا هەم) خۆیان بۆ ئەم هونەرە تەرخاندەکەن.بەڵام مۆسیقا لە چەشنێکی دیکەیە، بەو مانایە کە پێویستیی بە توانایی گشتیی زەینیی نییە، بەڵکو وا وێدەچێ پێویستیی بە توانای سروشتییە و لەوانەیە زۆر سەیر بنوێنێ کە هیچ کام لە ئاوازدانەرە مەزنەکان ژن نەبوون. بەڵام هەر ئەم توانا سروشتییەش بە مەرجێك دەبێتە هۆی خولڤانی بەرهەمگەلی مەزن کە لەگەڵ فێرکردن و پرۆڤە و موتالا بێ و تاك وەکو پیشەیەك وەشوێن مۆسیقا بکەوێ. ئەوەشمان لە بیر بێ کە، کەڵە پیاوانی مۆسیقاش تەنیا لە نێو دوو نەتەوەی ئەڵمان و ئیتاڵیادا هەڵکەوتوون و لە هەر دووك وڵاتیشدا، ژنان هەم لە بواری پەروەردە و فێرکردنی گشتی و هەم لە بواری پسپۆریدا، لە پاش فەڕەنسا و بریتانیاوەن و زۆربەی ژنان (بەبێ زێدەبێژی) ئاستی خوێندەوارییان زۆر نزمە و ئەستەمە کە تواناییە زەینییەکانیان لە هیچ بوارێکدا بە شێوەیەکی ئەوتۆ پەروەردە بکرێ. لەم دوو وڵاتە دا رێژەی ئەو پیاوانەی فێری بنەماکانی ئاوازدانەری دەکرێن سەر لە سەدان و لەوانەیە هەزاران کەس دەدەن لە حاڵێکدا ژمارەی ژنان ناگەنە چەند کەسیش. ئەگەر بمانەوێ بە پێی نێونج داوەری بکەین نابێ چاوەڕوانیمان هەبێ کە لە بەرانبەر پەنجا هەڵکەوتە دا زیاتر لە یەك ئافرەتی هەڵکەوتوو لە بواری



مۆسیقادا دەردەکەوێ و دەشزانین کە لە سێ سەدەی رابردوودا لە هیچ کام لەو دوو وڵاتەدا پەنجا پیاوی گەورەی تێدا هەڵنەکەوتووە.

بێجگە لەو هۆکارانەی خستمانە بەر باس، بەلگەگەلی دیکەش هەن بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدەن کە بڵێین بۆچی ژنان لە چاو پیاوان تەنانەت لەو بوارانەشدا کە بۆ هەر دووکیان دەرفەتی لەبار هەیە دوواکەوتووترن. یەکێك لە هۆکارەکان ئەوەیە کە ژنان کاتی پێویستیان بۆ ئەم کارانە نییە. هەر چەندە لەوانەیە ئەم قسەیە پارادۆکسیکاڵ بنوێنێ، بەڵام راستییەکی کۆمەڵایەتییە. کات و وزەی هەر ژنێك بە ناچاری لەو چالاکییە پراکتیکییانەدا دەخرێتەگەڕ کە بە ئەرکی ژنان لە قەڵەم دەدرێن. یەکەمین ئەرکی هەر ژنێك لە بنەماڵەدا بەڕێوەبردن و پێڕاگەیشتنە بە بنەماڵە و راپەڕاندنی ئەم ئەرکەش پێگەیشتوویی و ئەزموونی دەوێ. ژن تەنیا کاتێك ئەم ئەرکەی لە کۆڵ دەبێتەوە کە بنەماڵەکەی ئەوەندە دەستڕۆیشتوو بێ بتوانێ ئەم ئەرکە بە کەسێکی دیکە بسپێرێ. کە لەم حاڵەتەدا دەبێ دەرەنجام و زیانەکانیشی وەئەستۆ بگرێ. بەڕێوەبردنی بنەماڵە، ئەگەر لە لایەنەکانی دیکەشەوە دژواری و چەرمەسەریی نەبێ، بۆ زەینی مرۆڤ تاقەتپڕووکێنە. چونکە زیرەکی و هۆشیاریی بێوچانی دەوێ بۆ ئەوەی نەکا ئەم یا ئەو شتە چووکەیە، لە بیر بکرێ، تاك لە هەر کات و ساتێکی رۆژدا تووشی مەسەلەیەکی پێشبینی کراو یان پێشبێنی نەکراو دەبێ کە دەبێ رێگەچارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە. ئەو کەسەش کە ئەرکێکی وەهای لە سەرشانە، بە دەگمەن دەتوانێ خۆی لە کۆتوبەندیان رزگار بکا. ئەگەر ئافرەت خاوەنی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بێ و دەستی بگاتە دمی خۆی و بتوانێ لەو شتانە دەرباز بێ، بە هەر حاڵ، لە رێکخستنی پێوەندییەکانی بنەماڵەییدا، واتە ئەو شتەی کە پێی دەگوترێ هاونشینی و هەڵسوکەوت، لە ئەستۆی ئەوە و هەر چەندەی ئەو ئەرکانەی باسمان کردن سووکتر بن، ئەم ئەرکە قورستر دەبێ. ئەرکێك کە رێکخستنی کۆنسێرت و شەو میوانی و عەسرانە و چاوپێکەوتنەکانی پێش نیوەڕۆ، هەروەها نامەنووسین و بانگهێشتنامە، بەشێکی ئەو ئەرکەن. سەرەڕای تەواوی ئەوانە، ئەو ئەرکە گرینگەی کۆمەڵگە تایبەت بە سەر ژنانی دادەسەپێنێ، ئەرکی دلڕفێنی و سەرنجڕاکیشییە.

هەموو ژنێکی زیرەك و بە هۆشی چینە دەوڵەمەندەکان، بەشێکی مەزنی تواناکانی خۆی بۆ زانینی دامودەستوور و هونەری قسەکردن تەرخان دەکا. ئیزن بدەن تەنیا بیر لە لایەنی دەرەکیی ئەم مەسەلەیە بکەینەوە. هەر ژنێك کە گرینگی بە رواڵەت و جلوبەرگی خۆی دەدا، بەردەوام بەشێکی زۆری بیروفیکری خۆی بۆ دابینکردنی جلوبەرگی گونجاو بۆ خۆی و لەوانەیە بۆ کچەکانیشی تەرخاندەکا (مەبەستم جلی گران نییە، بەڵکو جلوبەرگێکە کە لەگەڵ سەلیقە و هەستی سروشتی یا ناسروشتی کۆمەڵگە سازگار بێ) ئەگەر ئەو هەر ئەم کات و هێزە هزری و فیکرییەی خۆی بە تەواوی بۆ هونەر و ئەدەبیات و زانست تەرخانکردبایە، ئەگەری زۆری هەبوو کە گەلێك پێشکەوتنی لەم بوارەدا وەدەستهێنابا* ئەگەر تەواوی ئەو کەڵکەڵە پراکتیکییە گەورە و بچووکانە (کە بە لای ژنانەوە گەورەن) وەلا نرابایەن و ژنان سەریان سووکتر بوایە و توانیبایان وزە و هێزی زیاتر بۆ هزر و هونەر تەرخان بکەن، زۆر وێدەچێ لە

* دیارە هەر ئەو توانایەی کە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لەکاروباری جوانکاریدا حەقیقەت بدۆزێتەوە، واتە بزانێت چ کارێك بەجێیە، لە بیاڤە گرنگە هونەرییەکانیشدا بەکار دێت. هەم ئەو توانایە و هەمیش توانای هونەری، هەردووکیان یەك ناوەندیان هەیە بۆ کامڵبوون و پێگەیشتن، بەڵام کامڵبوونی هەنەری بە جەغزێکی هەرواتر و بەرینتر دەوری دراوە. بۆ وێنە دەکرێ مۆدیلی جلوبەرگ بە نموونە بێنینەوە کە یەکێك لە هەڵبژاردنیدا خۆش سەلیقە یانبێ بێت. فۆڕمی گشتیی پاژە پێکهێنەرەکانی جلوبەرگ نەگۆڕە، بەڵام قەبارەیان (سایز) بەردەوام لە گۆڕان دایە. جارێ گەورە و جارێ بچووك، جارێك درێژ و جارێك کورت دەکرێنەوە. هەر مۆدێلێکی نوێ جلوبەرگ کە دێتە بازاڕەوە، لە فۆرمە گشتییەکەیدا تا رادەیەك هەر هەمان فۆڕمە نەگۆڕەکەی هەیە. ئەم فۆڕمە گشتییە ئەگەرچی سادە و ساکارە، بەڵام تەواوی مۆدیلەکانی لەسەر ئەو بنەمایە فۆڕم دەگرن. ئەو کەسەی باشترین دیزان و مۆدیلی جلوبەرگ دادەرێژێت یان لە هەڵبژاردنی جلوبەرگدا بەسەلیقەیە، لەوانەیە، ئەویش ئەو توانایەی تێدابێت کە بۆ ئامانجگەلی گرنگتر و بۆ بەرزترین چالاکییە هونەرییەکان بەکار دێت، بەڵام ئەو تواناکەی خۆی لەڕێگەیەکی دیکەوە بۆ وێنە لە دیزانکردن، یان هەڵبژاردنی، جلوبەرگدا بەکارهێناوە.



بواری خولقاندنیشدا لە زۆربەی پیاوان پتر توانایی خۆیان وەگەڕ خستبا. بەڵام کاری ئەوتۆ کردەنی نییە. سەرەڕای ئەوەی کە بەرپرسیارەتییەکانی رۆژانە کە بەردەوام لە سەر شانی ژنانن، چاوەڕوانیشیان لێدەکرێ کات و تواناکانیان بۆ هەموان تەرخانبکەن. ئەگەر پیاوێکیش بێ کاربێ وەها چاوەڕوانییەکی لێدەکرێ، بەڵام ئەگەر خەریکی کارێك بێ هیچ کەس لە بەر ئەوەی کە کاتەکەی بۆ ئەو کارە تەرخانکردووە دڵی لێی نایەشێ. کار بۆ پیاو بیانوویەکی باشە بۆ ئەوەی خۆی لە ویستی گەورە و بچووك بدزێتەوە. بەڵام ئایا کاری ئافرەت، بە تایبەتی ئەگەر بەدڵی خۆی هەڵیبژاردبێ، ئیزنی ئەوەی پێدەدا خۆ لە هاموشۆ و هاونشینی ببوێرێ؟ تەنیا پێویستترین و باوترین ئەرکەکانی ژن ئیزنی خۆبواردن لە بەڕێوەبردنی ویستەکانی دیترانی پێدەدەن. تەنیا ئەگەر کەسێکی بنەماڵە نەخۆش بێ یا رووداوێکی نائاسایی بقەومێ، ژن ئیزنی هەیە کارەکەی خۆی بخاتە سەرووی رابواردنی ئەوانی دیکەوە. ژن بەردەوام دەبێ گوێ لە مستی یەکێك‌و زۆر جار ئی هەمووان بێ. ئەگەر بخوازێ خەریکی موتالاّ یا کارێکی جیددی بێت، دەبێ ئەوپەڕی کەڵك لەو هەلو دەرفەتگەلە وەرگرێ کە جاروبار رێك دەکەون. ژنێکی هەڵکەوتوو کە لەو کتێبەدا کە هیوادارم رۆژێك بڵاوبێتەوە دەڵێ: ئەوەی ژنان کردوویانە لەو کاتە بێکارییا نەدا کراون کە بە رێکەوت پێش هاتوون ـ کەوابوو، سەیر نییە کە ژنان لە هێندێ بواردا ناتوانن پێ بگەن، چونکە هیچ کارێك مەیسەر نابێ مەگەر ئەوان تەواوی سەرنجی خۆیان بێوچان بدەنە تاقە بابەتێك و ئەو بابەتە بە گەورەترین عەشقی خۆیان بزانن. پێشکەوتن لە فەلسەفەدا و لەوەش زیاتر لە هونەردا کەشێکی لەم چەشنەی پێویستە، چونکە لە هونەردا بێجگە لە بیر و فیکر و سۆز، دەبێ دەستیش بێوچان لە پرۆڤەدابێ هەتا دەگاتە تەشقی کارامەیی.

دەبێ خاڵێکی دیکە لە تەواوی ئەو شتانە زیاد بکەین کە باسمانکردن. لە هونەرە جۆراوجۆرەکاندا، هەروەها لە کارە فیکرییەکانیشدا تاك بۆ ئەوەی بتوانێ لەم رێگەیەوە خۆ بژێنێ، پێویستی بە پلەیەکی دیاریکراوی کارامەیی (مهارت)ە. بەڵام ئەگەر بیەوێ دەستکەوتگەلێکی وای هەبێ کە ناوی بە نەمری بمێنێتەوە دەبێ پێ بنێتە قۆناخێکی باڵاتر. تەواوی ئەوانەی کە لقێکی زانستی یا هونەرییان

کردۆتە پیشەی خۆیان، پاڵنەری تەواویان بۆ گەیشتن بە قۆناخی یەکەم هەیە، بەڵام گەیشتن بە قۆناخی سەرووتر مەیسەر نابێ مەگەر ئەوەی کە مرۆڤ لە قۆناخێکی ژیانی خۆیدا بە جیددی بە شوێن ناو و ناوبانگەوە بێ. زیاتر ئەوە تەنیا پاڵنەرێکیشە کە دەتوانێ مرۆڤ وا لێ بکا بە سێبووری و پشوودرێژییەوە بۆماوەیەکی دوورودرێژ وەشوێن کارێکی تاقەتپڕووکێن بکەوێ. بۆ گەیشتن بە لوتکەی پێگەیشتوویی لەو بوارانەدا کە پێشتر گەورەترین کەسەکان (نوابغ) گەلێك یادگاریی بە شکۆیان بۆ بە جێ هیشتووین، چار نییە جگە لەوەی مل بۆ ئەم ئیشە تاقەتپڕووکێنانە راکێشین، تەنانەت بۆ ئەو کەسانەی کە سروشت باڵاترین تواناکانی پێ بەخشیون. بەڵام ژنان، چ بە هۆی سروشتی بێ یا ناسروشتی، ئەستەمە ئەوەندە خوازیاری ناوبانگ بن. ناوبانگخوازی و دەسەڵاتپەرستیی ژنان زیاتر چوارچێوەیەکی بەرتەسکی هەیە. ئەوان دەیانەوێ کاریگەرییان لە سەر کەسانێك هەبێ کە پێوەندییان لەگەڵیان هەیە. ژنان حەزیان لێیە عەشق و دلۆڤانی و سەرنجی ئەو کەسانە بەرەو خۆیان راکێشن کە بە چاوی خۆیان دەتوانن بیانبینن. لە زانست و هونەریشدا بەوەندە دەستکەوت و کارامەییە قایل دەبن کە وەها پێگەیەکیان بۆ دەستەبەر بکەن و دڵیان بەوەندە خۆش دەبێ. ئەگەر بمانەوێ لە سەر ژنان بەو جۆرەی کە هەن داوەری بکەین، ناتوانین ئەم تایبەتمەندییەیان لە بەرچاو نەگرین. هەڵبەت من لە سەر ئەو باوەڕەم کە ئەم تایبەتمەندییەی ژنان لە سروشتیانەوە سەرچاوە ناگرێ بەڵکو دەرەنجامی سروشتیی ئەو ژینگەیەیە کە ژنانی تێدا پەروەردە دەکرێن. ئەوە پەروەردە و بیروڕای گشتییە کە ناو و ناوبانگ لە بەرچاوی پیاوان شیرن دەکا، "چونکە بە هیچ نەگرتنی خۆشی و هەوڵی ماندووییەناسانە و تاقەتپڕووکین" لەپێناو بەدەستهێنانی ناوبانگدا بە یەکێك لە تایبەتمەنییەکانی (زەینە مەزنەکان) "لە قەڵەم دەدرێ (تەنانەت ئەگەر ئەم جۆرە خسڵەتانە بە خراپیش دانرێن). لە حاڵێکدا ناوبانگ بۆ پیاوان ﴿شتێکە﴾ کە هەرچی حەزیان لێی بێ بە دیاری پێشکەشیان دەکا (تەنانەت سەرنجی ئافرەتانیش)، ناوبەدەرەوەیی هیچ بەرهەمێکی بۆ ژنان پێوە نییە، چونکە گەیشتن بەو ئامانجەی پیاوان لە مێشکیان



دایە، بۆ ژنان قەدەغەیە و خۆی ناوبانگخوازییش بە چەشنێك رووهەڵماڵدراوی و دژایەتی لەگەڵ ژنبوون لەقەڵەم دەدرێ. سەرەڕای ئەوەش، لە حاڵێکدا کۆمەڵگە ژنان ناچار بەوە دەکا کە بە هەموو تواناوە هەوڵبدەن لە سەر کەسانێك شوێندانەر بن کە لە ژیانی رۆژانەیاندا پێوەندییان پێکەوە هەیە و لەحاڵێکدا ئاسوودەیی ژنان گرێدراوە بە سەرکەوتنیان لەو کارەدا، چۆن دەکرێ چاوەڕوانیت لێیان هەبێ کە شتی دیکەیان بە لاوە گرینگ بێ و بایەخی پێ بدەن؟ ژن و پیاو وەك یەك حەزیان لەوەیە سەرنجی خەڵك راکێشن و ئەوەش راکێشانێکی سروشتییە لە هەر دووکیاندا، بەڵام رەوشی کۆمەڵگە جۆرێکە کە ئافرەت، لە هەموو بوارە ئاساییەکاندا تەنیا لە رێگەی بایەخپێدانی مێرد یا کەسوکار و خزمە نێرینەکانی خۆیەوە دەتوانێ بکەوێتە بەر سەرنجی گشتی و ئەگەر خۆی پێگەیەکی بەرزی دەستکەوێ یا کەسایەتییەکی سەربەخۆ وەدەستبێنێ، نەك ئەوەی وەکو پاشکۆی پیاوان بژی، نزیکترین کەسانی خۆی وەلای دەنێن و پشتی تێدەکەن. وەها رەوشێك کاریگەریی لە سەر پێگەی کۆمەڵایەتی و بنەماڵەیی، هەروەها عادەتەکانی ژیان دادەنێ و هەر کەسێك تۆسقاڵێك لەو رەوشە تێبگا بە سانایی بۆی دەردەکەوێ کە ئەم رەوشە کەموزۆر روونکردنەوەیەکی ورد لە سەر تەواوی ئەو جیاوازییە ئاشکرایانەی کە لەنێوان ژن و پیاودا هەن دەخاتەڕوو، بە تایبەت تەواوی ئەو جیاوازییانەی کە نیشانەی نایەکسانین.

سەبارەت بە ئەخلاقیش، دەڵێن گەلێك جیاوازی لە بواری ئەخلاقی لەنێوان ژن و پیاودا هەیە و ئەو جیاوازییانە جوێن لە جیاوازییە زەینییەکان و لەم بوارەدا زیاتر تای تەرازوو بە قازانجی ئافرەتان دەشکێتەوە. باوەڕی باو ئەوەیە کە ژنان لە پیاوان باشترن، بەڵام ئەم ئیدیعایە شتێکی بێ نێوەڕۆکە و هەموو ژنێکی زیت و تێگەیشتوو بیبیستێ بزەیەکی تاڵی دەزێتە لێو، چونکە لە هیچ جێگەیەکی ژیاندا، سیستەمی دامەزراو، گوێڕایەڵیی باشتر لە ﴿گوێڕایەڵیی﴾ خراپتر بە سروشتی و بە جێ نازانێ. ئەو قسە بێ نێوەڕۆکە تەنیا قازانجێکی هەیەتی ئەوەیە کە دەری دەخا دەسەڵات پیاوانی گەندەڵ

کردووە. ئەویش تەنیا حەقیقەتێکە کە ئەم واقیعییەتەی (باشتربوونی ژنان لە رووی ئەخلاقەوە)، تازە ئەگەر وابێ، دەیسەلمێنێ یا روونی دەکاتەوە. ئەوەش راستە کە سیستەمی کۆیلەدارێتی بێجگە لەو جێگەیانەی ناچاری بە توندوتیژی دەکا، ئەگەرچی بۆ کۆیلە و کۆیلەدار گەندەڵیی بە دوایەوەیە، بەڵام خاوەن کۆیلە پتر لە بەردەم گەندەڵی دایە. ئەگەر مرۆڤ لە ئاستەنگی دابێ و ئەو ئاستەنگییەش بە دەسەڵاتێکی داپلۆسێنەرانەوە لە سەری بێ، سروشتی ئەخلاقییەکەی بێ خەوشتر دەمێنێتەوە لەوەی کە ئازاد بێ و بەبێ هیچ لەمپەر و بەربەستێك دەسەڵاتدارێتی بکا. دەڵێن سزاکان بە دەگمەن ژنان دەگرنەوە و ئەو ژنانەش کە تووشی جەنایەت دەبن زۆر کەمترن لەو پیاوانەی تووشی وەها کردەوەیەك دەبن، من گومانم لەوەدا نییە کە ئەم شتە، هەر بە راستی کۆیلە رەشەکانیش دەگرێتەوە. ئەوانەی لە ژێر دەسەڵات و چاودێریی کەسانی دیکەدان زۆر تووشی جەنایەت نابن، مەگەر بە فەرمان و قازانجی سەرۆکەکانیان. ئەوەی کە لە بواری هزردا ژنان بە کەم بگرن و لە پانتایی ئەخلاقدا بە گەورەیان بزانن، نیشانەی گەمژەییەکی سەرسوورهێنەرە لە وەبەرچاونەگرتنی کاریگەریی هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکاندا، گەمژەییەك کە هەموو خەڵك و تەنانەت پیاوانی وردبین و تێگەیشتووش هەیانە و ئەوەندە بەرچاوە کە وێنەی نییە.

لە پەنای ئەو قسە موجامەلەئامێزەی دەربارەی بالاتربوونی ژنان لە رووی ئەخلاقییەوە دەگوترێ، بۆچوونێکی بە کەم زانینیش سەبارەت بە ئەخلاقی ژنان باوە کە پێی وایە ژنان زیاتر لە پیاوان پێشداوەری دەکەن. دەڵێن ژنان لە بەرانبەر حەزەکانیاندا خۆیان بۆ راناگیرێ و داوەریکردنەکانیان لە سەر شتە گرینگەکان، بە توندی دەکەونە ژێر کاریگەریی ویستن و نەویستنە کەسێنییەکانەوە. تەنانەت ئەگەر ئەو ئیدیعایەش بە راست وەربگرین، دیسانیش دەبێ بسەلمێندرێ کە چەواشەبوونی ژنان بە هۆی پەیرەوی لە ئیحساساتە کەسێنییەکانیان، زۆر پترە لە چەواشەبوونی پیاوان بە هۆی پەیڕەوی لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان. وەك دیارە ئەو جیاوازییە گرینگەی، کە لێرە لەنێوان ژن و پیاودا هەیە ئەوەیە کە پیاوان لە بەر خۆیان لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان خۆ دەبوێرن و



بەپێچەوانەی بەرژەوەندیی گشتی دەجوولێنەوە و ژنان (کە ئیزنیان نییە کەڵك لە بەرژەوەندییە کەسێنییەکانیان وەرگرن) لە بەر کەسێك یا کەسانێکی دیکە ئەو کارە دەکەن. سەرەڕای ئەوەش، دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە کۆمەڵگە لە هەموو حاڵێکدا ئەوە فێری ژنان دەکا کە ئەوان تەنیا دەبێ لە هەمبەر کەسانێکدا هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن کە پێوەندییان لەگەڵیان هەیە، واتە کەسانێك کە چاودێریکردن لێیان لە ئەستۆی ژنانە و تا ئەو جێگەیەی پێوەندیی بە پەروەردە و فێرکردنەوە هەیە، ژنان تەنانەت لەگەڵ چەمکە سەرەتاییەکانی چاودێر بە سەر بەرژەوەندییە گشتییەکان یا ئامانجە بەرزە ئەخلاقییەکانیش نامۆ دەبن، چەمکگەلێك کە هەر چەشنە سەرنج و بایەخپێدانێك بەو بەرژەوەندی و ئامانجانە لە سەر ئەوان دادەمەزرێ. بەڵام ئەگەر سکاڵامان لەوەیە کە ژنان بۆچی وادەکەن، لە راستیدا دەڵێین بۆچی ژنان بەنیسبەت ئەو تاقە ئەرکەی بۆی پەروەردە کراون و تا رادەیەك تەنیا ئەرکێکیشە کە ئیزنی ئەنجامدانیان هەیە، ئاوا بە دڵپاکییەوە دەجوولێنەوە.

بۆ ئەوەی خاوەن پوانەکان (ئیمتیبازەکان)، مافی پوان لێ خوراوان بگەڕێننەوە، هیچ پاڵنەرێك لەوە بەهێزتر نییە کە بەشخوراوان خۆیان لە سەر مافەکانیان سوور بن و هەوڵ بدەن ئەو پوانگەلە دەستەبەر بکەن کە مافی رەوای خۆیانە ـ هەر بۆیەش کە هەر چەشنە بەڵگەهێنانەوەیەك دژی مافی تایبەتیی پیاوان، هەتا ئەو کاتەی ژن قڕوقپ و بێدەنگ بێ، لە نێو خەڵکدا دەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی نابێ، چونکە هەموان لەبەر خۆیانەوە دەڵێن: ژنان هیچ سکاڵاو نارەزایەتییەکیان لەم رەوشە نییە ـ بێدەنگی ژنان بێگومان ئەو هەلە بۆ پیاو دەڕەخسێنێ کە بۆ ماوەیەکی زیاتر کەڵك لە پوانگەلی نادادپەروەرانە وەرگرن، بەڵام تۆسقاڵێکیش لە نادادپەروەریی ئەم پوانانە کەم ناکاتەوە. لەوانەیە سەبارەت بە ژنانی حەرەمسەرای خۆرهەڵاتی زەویش هەر ئەو شتە بڵێن: ئەوان قەت سکاڵایان نییە لەوەی کە وەکو ژنانی ئەورووپی ئازاد نین. ئەو ئافرەتانە پێیان وایە کە ژنانی ئەورووپی ئێجگار رووهەڵماڵدراون و ئەدگار و کرداریان

دووره له ژنایەتیی. خاڵێکی ئەستەمتر ئەوەیە کە پیاوان نارەزایەتیی بە نیسبەت ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەوە دەربڕن کە ژنان لەوان بە کەمتر دەزانێ و ئەگەر نەزانن کە لە شوێنگەلی دیکەی جیهان سیستەمێکی جیاواز لە گۆڕێدایە، دژایەتیکردنیان لەگەڵ سیستەمە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیان زۆر ئەستەمتر دەبێ. ژنان هیچ نارەزایەتی و سکاڵایەکیان لەو بەشە لە ژیان نییە کە پێیان دراوە، ئەگەر سکاڵایەکیشیان هەبێ لە ئاستی نووزانەوە و کڕووزانەوەدا دەبێ کە لەنووسینە ئەم سەردەمەیاندا زۆر باوی هەیە. وێدەچێ کە ئەم کڕووزانەوانەش هەتا ئەو کاتەی ئامانجی گشتی و دیاریکراویان نییە بەبێ هیچ نارەزایەتی دەربڕینێك درێژەیان دەبێ و پێوەشیان زیاد دەبێ. ئەم ئاخ هەڵکیشان و ناڵە و نووزەیەی ژنان، لە گوێن ئەو سکاڵایانەن کە پیاوان لە بەر ناڵەباریی رەوشی ژیان دەیانکەن. سکاڵای لەم چەشنە نەك هەڵگری باوەڕێکی پتەو و نەخوازیاری گۆڕانی بارودۆخەکە- بەڵام هەر چەندەی ژنان وەکو پرەنسیپێکی گشتی بە نیسبەت ئۆتۆریتەی پیاوان بە سەریاندا، هیچ نارەزایەتییەکیان نییە، هەر کام لەو ژنانە گلەیی لە باڵادەستیی مێردەکەی خۆی یان لە زاڵبوونی مێردی هاوڕێکانی هەیە ئەوە رەوشێکە لە سەرەتای تەواوی بزووتنەوە رزگاریخواز و دژە باڵادەستەکاندا بە دی دەکرێ. "سێرف" ەکان لەسەرەتادا نارەزایەتییان بە نیسبەت دەسەڵاتی هەموو ئاغاکانیان دەرنەدەبڕی، بەڵکو تەنیا سکاڵایان لەو ئاغایانە بوو کە فەرمانیان بە سەردا لێدەدان. جەماوەری خەڵك لەسەرەتادا بەس خوازیاری یەك دوو پوان لە کاروباری شاریدا بوون و دواتر داوایان کرد کە لەو ماڵیاتانەیان خۆش بن کە بەبێ ئیزنی ئەوان دانرابوون. بەڵام لەو سەردەمدا تەنانەت بیریشیان لەوە نەدەکردەوە، کە ئەوان داوای ئەوە بکەن کە بەشێك لە دەسەڵاتی پادشایەتییان پێ ببڕدرێ.

رەوشی ژنان لە ئێستادا تاقە رەوشێکە کە یاخیبوون لە دژی ئەم رەوشە، وەکو یاخیبوونی رەعیەت لە دژی پادشا لە رابردوودا، چاوی لێدەکرێ. ژنێك کە دەچێتە نێو



بزووتنەوەیەکەوە کە مێردەکەی باوەڕی پێی نییە (لەگەڵی سازگار نییە)، خۆی دەکاتە شەهیدێك کە تەنانەت ناتوانێ بانگەشە بۆ رێبازەکەی خۆی بکا، چونکە مێردەکەی بە پێی یاسا دەتوانێ نەهێڵێ پڕوپاگەندە بکا. هەتا ئەو کاتەی ژمارەیەکی بەرچاو لە پیاوانی ئێستا نەکەونە گەڵ ژنان، ناکرێ چاوەڕوانیت لێیان هەبێ هەوڵی جیددی بۆ رزگارکردنی خۆیان بدەن.

## بەشی چوارەم

پرسیارێکیتر ماوەتەوە کە زیاتر کەسانێکی دژبەر دەیهێننە گۆڕی و پێداگرن لە سەر ئەوەی کە باوەڕیان بە راستبوون و رەوایی ئۆتۆریتەی پیاوان بە سەر ژناندا نییە. پرسیاری پرسیارەکەیان کە لەو پرسانەی پێشتر هێنامانەگۆڕێ کەم بایەخترنییە، ئەوەیە: گۆڕانکاری لە دامەزراو و نەریتەکان چ قازانجێکی هەیە؟ ئەگەر ژنان ئازاد بکرێن، ئایا هەیە رەوشی مرۆڤ بەرەو باشتر بوون دەچێ؟ ئەگەر وانییە. بۆچی مێشکی خۆمان بشێوێنین و هەولبدەین لە بەر مافێکی نارِوون و لێڵ شۆڕشێکی کۆمەلایەتی وەڕێ بخەین؟

وێناچێ لەو پرسیارەدا ئەو گۆڕانە مەبەست بێ کە پێشنیار کراوە لە رەوشی هاوسەرگیریی ژناندا وەدی بێ. ئەو دزێوی و بێ سەرەوبەریی و ئازارانەی کە بەرهەمی کۆیلەکردنی ژنانن لەلایەن پیاوانەوە، ئەوەندە بەربلاو و سامناکن کە هیچ کەس ناتوانێ چاوپۆشییان لێ بکا. کەسانی گەمژە یا دەمتەڕ لەوانەیە تەنیا ئەو شتانەیان لە بەرچاو بێ کە زۆر باون یا بە لای خەلکەوە گرینگن و بلێین دزێوی و خراپە لەم بابەتەدا ناوازەیە، بەلام کەس ناتوانێ نکۆلیی لێ بکا و لە زۆر بواردا حاشا لە بنجدار (توند) بوونەکەی بکا. دیارە هەتا دەسەلات هەبێ ناکرێ بە تەواوەتی پێش بە کەلکوەرگرتنی نابەجێ ﴿لە ژنان﴾ بگیردرێ. چونکە ئەم دەسەلاتە تەنیا بە پیاوانی باش و شیاو و ماقوول نادرێ، بەلکو تەنانەت بە وەحشیترین و جەنایەتکارترین پیاوەکانیش دەدرێ. هیچ چاودێرییەك بە سەر ئەم دەسەلاتەوە نییە، جگە لە رای خەلکان (دیتران) و پیاوە چەپەلەکان زیاتر لە ژێر دەسەلاتی کەسانی لە گوێن خۆیاندا و دوورن لە بیروڕا و بۆچوونی خەلکی دیکە، ئەگەر ئەمجۆرە پیاوانە بالادەست بوونی زالمانەی خۆیان بە سەر



ئەوکەسەدا نەسەپێنن کە بە پێی یاسا بێجگە لە ملکەچی لە بەرانبەریدا چارەیەکی نییە، بەو مانایەیە کە کۆمەلگەی مرۆیی بۆتە بەهەشتی بەرین و ئیتر پێویستیمان بە یاساگەلێك نییە کە هەوەس و ویستە شەیتانییەکانی پیاو هەوسار دەکەن و واستریئەی خواژنی دادپەروەری، نەك هەر دابەزیوەتە سەر زەوی، بەلکو لە نێو دلی خراپترین پیاواندا پەرستگەی داناوە. یاسای ملکەچی و کۆیلەیی، کە ئێستا لە هاوسەرگیریدا هەیە، لەگەل تەواوی بنەماکانی جیهانی مودێڕن و هەروەها لەگەل هەموو ئەو ئەزموونانەی کە ئەم پرەنسیپگەلە بە ئازار و تال و سوێریی زۆرەوە لە ناخیانەوە هاتوونەتە دەرێ، بە توندی دژایەتیی هەیە. ئێستا کە کۆیلایەتیی قولەڕەشەکان راگیراوە، کۆیلایەتیی ژنان تەنیا شتێکە، کە مرۆڤێك بە هەموو تواناکانییەوە لە بەر دەستی کەسێکی دیکە دەنی و بەو هیوایەی کە ئەو بە جوامێری و دلۆڤانییەوە لە دەسەلاتی خۆی تەنیا بە قازانجی ئەو کەسە کەلك وەرگرێ کە لە بەر دەستی دایە. هاوسەرگیری تەنیا کۆیلایەتییەکە، کە یاسای ئێمە بە کردەوە و بە فەرمی دەیناسێ. هەنووکە هیچ مرۆڤێك بە بڕیاری یاسا کۆیلە نییە، جگە لە ژنی هەر مالێك.

کەواتە ئەستەمە پرسیاری ئازادیی ژنان بە قازانجی کێیە؟ رووی لەم رەهەند و لایەنانەی مەسەلەکە بێ. لەوانەیە بلێین: راستە ژێردەستبوونی ژنان زیانی پترە لە قازانجی، بەلام هیچ قسە لەوەدا نییە کە قازانجیشی تێدایە. دەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێ کە مەسەلەی گەورەتر بۆئێمە وەدیهێنانی هەلومەرجێکە کە دەستەوەستانی[1]* و کەمتوانایی ژنان بنبڕ بکا، دیارە ئەو شتە گرینگەش بە، بە فەرمی ناسینی یەکسانیی ژن و پیاو لە تەواوی مافەکانی هاوولاتیبووندا وەدی دێ. واتە بە ئاوالەکردنی رێگەی ژنان بۆ هەموو ئەو کار و ئیشگەلەی لەگەل خۆیان رێز و حورمەت دێنن، هەروەها بەشدارکردنی ژنان لەو فێرکردن و راهێنانەی کە بۆ وەرگرتنی ئەو ئیش و کارە ئامادەیان دەکا. زۆرن ئەو کەسانەش کە بە لایانەوە گرینگ نییە کە ژێردەستبوونی

---

١- کەسێك کە هیچی لە دەست نەیە. کورد دەلێ: بۆ پیاوی دەستەوەستان... چ گەرمێن و چ کوێستان؟

ژنان دادپەروەرانە نییە یا پاساوێکی لۆژیکیی بۆ نییە. ئەوەی ئەوانە پێویستیانە، ئەوەیە کە تێبگەن لەوەی کە نەهێشتنی نایەکسانی چ قازانجێکی لێ دەکەوێتەوە.

ئیزن بدەن لە پێشدا بچینە سەر ئەو مەسەلەیە: ئەگەر گشتیترین و هەمەگیرترین ئەو پێوەندییانەی لە نێو مرۆڤەکاندا وەدی هاتوون لە سەر بنەمای دادپەروەری بن نەك بێدادی، چ قازانجێکی هەیە؟ ئەگەر بمانەوێ ئەو کاریگەرییە گەورەیەی دادپەروەری لە سەر باشبوونی جەوهەرەی مرۆڤ هەیەتی بۆ کەسێك شیبکەینەوە کە چەمکی ئەخلاقیی وشەکان بە لایەوە گرینگە، ئەستەمە روونتر لە وتەی بێ پێچ و پەنا شتێکی دیکە بۆ روونکردنەوەو شیکردنەوەی بدۆزینەوە. ئەو خۆبەزل زانین و بەرزەدەماخی و خۆپەرستییانەی لە نێو مرۆڤدا هەن، سەرچاوەی هەمووی لە پێوەندییەکانی نێوان ژن و پیاو دایە و لەوێوە ئاو دەخۆنەوە. پیاوێك بێننە بەر چاوتان کە هەر لە منداڵییەوە بەو باوەڕەوە گۆش کراوە کە بەبێ هیچ لێوەشاوەیی یا هەوڵ و تێکۆشانێك بەڵکو تەنیا لە بەر ئەوەی کە بە نێرینەیی لە دایك بووە، لە نیوەی نەژادی مرۆڤ گەورەترە و ئەو مەزنایەتییەش هەر لە جێی خۆی دەبێ تەنانەت ئەگەر لە نێو رەگەزی مرۆڤدا، بێ هەستتر و نەزانتر و بێ مایەتر لەو دەست نەکەوێ و لە نێو بندەستەکاندا کەسانێك هەبن کە ئەو هەموو رۆژ و کات و ساتێك بە تەواو مانا هەست بە لێوەشاوەیی و باشتر بوونیان بکا، وەها کەسێك ئەگەر بە پێی عادەت لە تەواوی رەفتار و ئەدگاریدا پەیڕەوی لە ئافرەتێك بکا، ئەگەر گەمژە بێ وادەزانێ کە ئەو ژنە بە هیچ شێوەیەك لە توانا و هێزی تێگەیشتن[1]* دا لەگەڵ ئەو یەکسان نییە و ناتوانێ ببێ، ئەگەر گەمژەش نەبێ، ئەوا کاری خراپتر دەستی ماچدەکا: دەبینێ ئەو ئافرەتە لەو لێوەشاوەترە، بەڵام باوەڕی وایە کە ژن سەرەڕای لێوەشاوییش دەبێ ملکەچی ئەو بێ و ئەو مافی ئەوەی هەیە کە فەرمانی بە سەردا لێبدا. رەوشێکی ئەوتۆ چ کاریگەرییەکی لە سەر کەسایەتیی رەگەزی نێرینە دەبێ؟ پیاوانی چینی هەڵکەوتوو نازانن کە ئەم هەستی خۆ بە گەورەتر زانینە تا چ رادەیەك تەشەنەی کردۆتە نێو مێشکی پیاوانەوە، چونکە لە نێو خەڵکی تێگەیشتوو و

١ـ لە جوێ کردنەوەی خراپە لە چاکە دا ...



پەروەردەکراودا، تا ئەو جێگەیەی بلوێ نایەکسانی دادەپۆشرێ، بە تایبەت لە بەر چاوی منداڵان. کوڕان وەك یەك بە قسەی دایك و باوکیان دەکەن و ئیزنیان نییە فەرمان بە سەر خوشکەکانیاندا لێ بدەن و عادەتیشیان نییە خۆیان بخەنە پێش خۆشکەکانیانەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، خوشکان هەمیشە لە پێش ئەوانەوەن. لایەنە باشەکانی هەستی جوامێری هەلی گەشەیان بۆ دەرەخسێ و بەرجەستە دەبن، بەڵام باڵادەستخوازی کە بەدیهێنەری ئەم هەستەیە کەمتر رێگەی دەرکەوتنی پێدەدرێ. بەمجۆرە، گەنجانی چینی دەوڵەمەند لە ساڵەکانی سەرەتای ژیاندا باش پەروەردە دەکرێن و لە کاریگەریی خراپ دوور دەبن و ئەو کاتەش پێ دەنێنە قۆناخی پیاوەتی، لە نایەکسانییەکان تێدەگەن‌و دەکەونە ژێر هێژموونی واقیعیەتەکانەوە. ئەمجۆرە کەسانە نازانن کاتێك کوڕان لە جێگەیەکی دیکە و بە شێوەیەکی جیاواز پەروەردە دەکرێن، هەستی خۆ لە کچان بە مەزنتر زانین تا چ رادەیەك رۆح و زەینیان دەئاخنێ، ئەوانە نازانن کە کوڕان هەرچی گەورەتر و بەهێزتر دەبن ئەم هەستەش لە وجودیاندا بەهێزتر دەبێ، ئەوانە نازانن چۆن ئەم هەستە لە کوڕێکەوە دەگاتە کوڕێکیتر، ئەوانە نازانن کوڕێکی گەنج چ زوو خۆی پێ لە دایکی زیاتر دەبینێ، هەر چەند لەوانەیە لە هەمبەر ئەودا دان بە خۆی دابگرێ، بەڵام شوێنەوارێك لە رێزی راستەقینە بەدی ناکرێ. ئەوانە نازانن کە ئەمجۆرە کوڕانە کاتێك دەگەنە تەمەنی ژنهێنان بە چ فیزێکی پادشایانەوە لە ژن دەڕوانن بە تایبەتی لەو ژنەی کە شانازییان پێ بەخشیوە باقی تەمەنی خۆی لە پەنایان تێپەڕ بکا. ئایا، وێناچێ کە وەها رەوشێك، پیاو چ وەکو تاك و چ وەکو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، لە رێگەی راستی ژیان چەواشە بکا؟ هەستی پیاو راست وەکو هەستی پادشا یا بەگزادەیەکە، کەپێی وایە، بەس بە هۆی ئەوەی لە فلان بنەماڵەدا لە دایك بووە لە خەڵکی دیکە سەرترە. پێوەندیی نێوان ژن و مێرد زۆر لە پێوەندیی نێوان نۆکەر و ئاغا دەچێ بەو جیاوازییەی کە ملکەچیی ژن لە بەرامبەر مێردەکەیدا بێ سنوورترە لە گوێڕایەڵیی نۆکەر بۆ ئاغاکەی، کەسایەتیی نۆکەر لەوانەیە بە هۆی ژێردەستەیی باشتر یا خراپتر بێ. بەڵام ئایا کەس هەیە حاشا لەوە بکا کە فەرمانڕەوایی کاریگەریی خراپ لە سەر کەسایەتیی ئاغا دادەنێ؟ پێگەی ئاغا دەیتوانی دوو روانگەی تێدا وەدی بێنێ: یەکەم ئەوەی کە ئەو بە راستی لە نۆکەرەکەی گەورەتر و

زیاتره. دووهەم ئەوەی کە ئەو فەرمان بە سەر مرۆڤگەلێکی لە گوێن خۆیدا لێدەدا چ بە شێوەی زاتی و چ بە شێوەی وەدەستهێنراو*[1] ﴿اکتسابی﴾ لەوان زیاتر نییە و فیگارۆ وتەنی: تەنیا زەحمەتی لەدایکبوون ئەو پێگەیەی پێ بەخشیوە. خۆپەرستیی پادشا یا ئاغا، لەگەڵ خۆپەرستیی رەگەزی نێر سازگارە. ئەو کەسانەی لە منداڵییەوە خاوەنی پوانگەلێکی وەدەست نەهێنراون پێوەیان گەورە دەبێ، گومان لەوەدا نییە بە هۆی بەهرەمەندی لەو پوانانەی لە خۆیان دەردەچن. ئەو کەسانەی کە بێ ئەوەی شیاوبن خاوەنی پوانگەلێکن، ئەگەر بگەنە ئەو قەناعەت و باوەڕە کە ئەو پوانانە مافی ئەوان نین، دوو هێندە هەستی خۆبەکەمگرتن گیانیان دەتەنێ. بەڵام ئەوانە هەمیشە کەمن و باشترین کەمایەتی هەر ئەوانەن. بەڵام زۆربەی ئەوانە لێوڕێژن لە بەرزەدەماخی، ئەویش خراپترین جۆری بەرزەدەماخی، لەخۆباییبوون لە بەر ئەو پوانانەی خۆش شانسی پێ بەخشیون، نەك پوانگەلێك کە بە کار و تێکۆشان بە دەستیان هێنابێ. لەوەش گرینگتر ئەوەی کە، کاتێك هەستی مەزنتربوون لە رەگەزێکیتر تێکەڵاوی ئۆتۆریتەی واقیعیی پیاوێك بە سەر یەکێك لە ئەندامانی ئەو رەگەزە دا دەبێ، حاڵەتێکی خراپتر دێتە گۆڕێ. ئەو حاڵەتە بۆ ئەو پیاوانەی کە دڵۆڤانی و بێ خەوشی لەگەڵ کەسایەتییان ئاوێتەیە، قوتابخانەی دان بە خۆداگرییەکی تێکەڵاو لەگەڵ عەشقە. بەڵام هەر ئەو حاڵەتە بۆ ئەو پیاوانەی جۆرێکی دیکەن، وەك قوتابخانە یا وەرزشگەیەکە، کە لەخۆبایی بوون و دەسەڵاتخوازییان تێدا دەگورێنێ و جۆرێك دزێوی و چەپەڵیی هەناویان دەخاتە روو کە هەرگیز لە هەڵسوکەوتەکانیان لەگەڵ پیاوانی دیکەدا دەرناکەون، چونکە ترس لە تۆڵە لێ ئەستاندنەوە، هەوسار لە ئاکاریان دەدا کەچی ئەوانە لە هەمبەر ئەو ژنە چارەڕەشەی کە ناچارە لێیان قەبووڵبکا چ ناهەقییەکی لە دەستیان بێ دەیکەن و زۆر جار تۆڵەی تەواوی ئەو ئاستەنگییانەی لە بوارەکانی دیکەدا بە سەریاندا سەپاوە لە ژنەکەیان دەکەنەوە.

ژیانی بنەماڵەیی لەسەر بنەمایەك دامەزراوە کە لەگەڵ پرەنسیپە سەرەتاییەکانی دادپەروەریی ناتەبایە، چونکە ئەو ژیانە، نموونە و پەروەردەیەك پەرەپێدەدا کە

۱ـ ئەو شتانەی لە دەوروبەر وەرگیردرێن و لە ژیاندا مرۆڤ وەدەستیان دێنێ.



کاریگەرییەکی خراپی لەسەر سروشتی مرۆڤ هەیە و ئەم کاریگەرییە هێندە گەورەیە کە ناکرێ بە پێی ئەزموونەکان، مەزندەی گۆڕانی گەورە و باشی وای لێبکەین کە بە نەمانی ئەم شێوە ژیانە وەدی بێن. ئەوەی مرۆڤ لە رێگەی پەروەردە و ژیارەوە کردوویەتی، بۆ ئەوەی کەسایەتیی خۆی لە ژێر کاریگەریی یاسای زۆرەملێ دەرهاوێ و لە بری ئەوە دادپەروەری دامەزرێنێ، وەکو بلقی سەر ئاو وایە. چونکە هەتا ئەو کاتەی ئەم قەڵایەی دوژمن نەگیرێ سەقامگیر بوونی دادپەروەری مەحاڵە. پرەنسیپی بنەمایی بزووتنەوەی مودێڕن لە پانتایی ئەخلاق و سیاسەتدا ئەوەیە کە ئاکاری مرۆ ، تەنیا کرداری ئەو ـ شیاوی سەرنج و بایەخە و گرینگ ئەوەیە کە مرۆڤەکان چی دەکەن، نەك ئەوەی کە کێن. ئەوەی رێز و متمانە بە مرۆڤ دەبەخشێ کردەوەکەیانە و لەوەش گرینگتر لێوەشاوەیی و تواناییەکە، کە مافی گەیشتن بە دەسەڵات و سامان بە مرۆڤەکان دەدا، نەك لەدایکبوون لە فلان بنەماڵەدا. ئەگەر بنەماڵە بە جۆرێك رێك بخرێ کە فەرمانڕەوایی یەکێك بە سەر ئەوی دیکە دا، نەمێنێ (فەرمانڕەوایی کاتیی گەورەکان بە سەر منداڵەکاندا شتێکی دیکەیە)، ئیتر کۆمەڵگە ناچار نابێ دژی ئەو ویست و گرۆییانە بێ کە خۆی لە وەدیهێنانیاندا دەوری هەبووە. لەو حاڵەتەدا، بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، منداڵی بنیادەم بەو جۆرەی شیاوە پەروەردە دەکرێ کە کاتێك گەورە بوو، ئەوەی تێدایە کە ئەم پەروەردەیە فەرامۆش نەکا. بەڵام تا ئەو کاتەی فەرمانڕەوایی بەهێز بەسەر بێهێز لە دڵی کۆمەڵگەدا واتە خێزان، بە فەرمی دەناسرێ بۆ کۆمەڵگە دژوار و ئەستەم دەبێ کە مافی وەك یەك بداتە، بەهێز و بێهێز و پرەنسیپی یەکسانی بە سەر پێوەندیی نێوان مرۆڤەکاندا زاڵ بکا. لە وەها رەوشێکدا بنەمای دادپەروەری، کە لە بنەماکانی مەسیحییەتیشە، هەرگیز تەشەنە ناکاتە نێو رۆح و زەینی مرۆڤەوە، تەنانەت ئەو کاتەش کە مرۆڤەکان روو دەکەنە دادپەروەری، ﴿هێشتا﴾ بەشێك لە وجودیان دژی ئەوە دەجوولێتەوە.

ئێستا با بگەڕێینەوە لای دووهەمین قازانج کە چاوەڕوان دەکرێ ئازادبوونی ژنان لە کەڵکوەرگرتن لە توانا و بەهرەکانیان بە کۆمەڵگەی بگەیەنێ. ئەگەر ژنان ئیزنیان هەبێ سەربەستانە ئیشی خۆیان هەڵبژێرن و تەواوی ئەو بوارانەی چالاکی نواندن کە بۆ پیاوان

ئاواڵەن بۆ ئەوانیش بکرێنەوە، ئەوانیش بتوانن ئەو پاداشت و خەڵاتانە وەرگرن کە بە پیاوان دەدرێن، لەو حاڵەتەدا، کۆی ئەو بەهرە زەینییانەی دەخرێنە خزمەتی مرۆڤایەتییەوە دوو هێندە دەبن. ئەگەر ئەمڕۆکە کەسێك دەتوانێ وەکو مامۆستا یا بەڕێوەبەری فلانە کەرتی کاروباری کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی، لە خزمەتی کۆمەڵگە دابێ، ئەو جارەیان دوو کەس لێوەشاویی ئەو کارانەیان دەبێ. ئەمڕۆ لە هەموو بوارەکاندا توانا زەینییە باڵاکان لە رادەی پێویست زۆر کەمترن. ئەو کەسە بە توانایانەی کەبتوانن بە باشترین شێوە ئەرکەکانیان راپەڕێنن، ئەوەندە کەمن کە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو کەمایەسییە دەبێ هەرچی لە تواناماندایە تەرخانی بکەین. وەلانانی تواناکانی نیوەی جەماوەر، خەسارێکی زۆر توند لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەدا. راستە کە تواناکانی ژنان بە تەواوی نافەوتێن و بەشێکیان بە شیوەی جۆراوجۆر دەکار دەکرێن، بۆ وێنە لە بەڕێوەبەریی خێزان و هێندێ لەو کارانەدا کە بۆ ژنان ئازادن، ئەوەش راستە کە ژنان ناڕاستەوخۆ لە زۆربەی بوارەکاندا هێندێ خزمەت دەکەن، بۆ وێنە بە کارتێکەریی لە سەر فلانە ژن یا پیاو، بەڵام ئەوانە هەموان پاژێکین و پانتاییەکی بەرتەسك دەگرنەوە و بەشێکی بچووکە لەو هێزە کۆمەڵایەتییەی کە بە ئازادبوونی ژنان بە کۆمەڵگە دەبڕدرێ. ئازادبوونی نیوەی تەواوی هێزی عەقڵانیی مرۆڤ قازانجێکیتریشی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە پاڵنەرێکی نوێ بە هێزی عەقڵانیی پیاوان دەبەخشن، پاڵنەرێك کە بەرهەمی هەڤرکێیە و بە واتایەکی دروستتر بەرهەمی پێویستیی ئەوەی کە، پیاوان بەر لە وەدەستهێنانی ئەو ئیش و پلەیەی خوازیارین ﴿دەبێ﴾ لێوەشاوەیی خۆیان بسەلمێنن.

ئەم هێزە مەزنەی کە دێتە سەر توانای عەقڵانیی مرۆڤ و توانای بەڕێوەبەریی کاروبارەکان، تا رادەیەك لە رێگەی باشتر و کاملتر پەروەردەکردنی ژنانەوە بەرهەم دێ. پەروەردەیەك کە لە ئاستی پەروەردەی پیاوان دابێ. کەوابوو، ژنان بە شیوەیەك پەروەردە دەکرێن کە لە فامکردنی بابەتگەلی کاری و کۆمەڵایەتی و فیکریدا لەگەڵ پیاوانی هاوتوێژی خۆیان، توانایییەکی یەکسان وەدەستبێنن. ئەو ژمارە کەمە خەڵکە بە توانایەش کە نەك هەر دەتوانن لەو شتە تێ بگەن کە خەڵکانی دیکە



بیریان لێکردۆتەوە و لێی تێگەیشتوون، بەڵکو خۆیشیان لە بواری هزر و کردەوەدا داهێنان دەکەن، سەر بە هەر دووك رەگەزەکە دەبن، چونکە پەروەردە و ئاسانکاریی پێویست بۆ پەروەردەکردنی تواناکان بۆ هەر دوو رەگەز تەرخان دەکرێ. بەم شێوەیە بە بەرزکردنەوەی ئاستی پەروەردەی ژنان تا رادەی پیاوان، هەروەها بە هاندانی هەر دوو رەگەز کە بۆ بەشداریکردن لە تەواوی ئەو پێشکەوتنانەی بۆ رەگەزەکەیتر مەیسەر بووە، چالاکیی ئافرەتان لە قەڵەمڕەوێکی هەراوتردا دەبێتە واقیعێکی هەمیشەیی. بەڵام سەرەڕای تەواوی ئەوانەش، نەهێشتنی کۆت و بەندەکانی ژنان، لە خۆیدا، هەڵگری فەزیلەتێکی پەروەردەییە بە بەهایەکی ئێجگار مەزنەوە. ئەگەر ئەو باوەڕە هەڵەیەی لە بارەی ژنانەوە باوی هەیە، نەمێنێ و ئەگەر ژنان وەکو مرۆڤێك مافەکانی خۆیان بناسن، ئەو کات تواناکانیان لە ئاست و رەهەندگەلێکی بەرینتردا گەشە دەکا و سۆزە ئەخلاقییەکانیشیان بیاڤێکی هەراوتر لەخۆ دەگرێ. ئەو باوەڕەی دەبێ لە کۆمەڵگەدا باروبنەی تێك بنێ ئەوە کە: "تەواوی مەسەلە هزری و پراکتیکییە گرینگەکان و تەواوی کاروبارە کۆمەڵایەتی و غەیرە شەخسییەکان، ئەو کارانەن کە تەنیا پێوەندییان بە پیاوانەوە هەیە و دەبێ نەهێڵن ژنان خۆیان تێ هەڵ قورتێنن. بەو واتایە کە بە تەواوەتی لێیان قەدەغە بکرێ کە خۆ لە هێندێ کار هەڵقورتێنن و لەو بڕە ئیشەدا کە مافی دەستتێوەردانیان هەیە (رادەربڕین) بە هێند وەرنەگیرێن و ئەو مافانەی دەبێ ژن بیانناسێ ئەوەیە کە ژنیش وەکو پیاو مرۆڤێکە و بۆی هەیە پیشەی خۆی، هەڵبژێرێ و وەکو هەموو مرۆڤەکانی دیکە دەتوانێ بە هەر شێوەیەك کە حەزەکانی سەرنجی رادەکێشن (وەشوێن حەزی دڵی بکەوێ) بکەوێتە شوێنیان و ئەویش مافی ئەوەی هەیە کە وەکو تاکێك لە قەدەر خۆی سەبارەت بە هەموو پرسەکانی کۆمەڵگە بیروڕای خۆی دەربڕێ، جا چ بە کردەوە بەشداریی لەو پرسگەلەدا بووبێ یا نەیبووبێ.

هەروەکو وتمان، ئازادیی ژنان، گەلێك توانای نوێ دەخاتە سەر [خەرمانی] ئەو توانایانەی کە ئێستا بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە بە کار دەهێنرێن. جا لە بەر ئەوەی کە

ئەو توانایانەی ئێستا [لەکاردان] بە هیچ جۆرێك ئەوەندە زۆر نین کە بتوانن نیوەی ئەو توانایانە وەلا بنێین کە سروشت پێی داوین، کەوابوو، چار نییە لەوەدا دەبێ کار لە ژنان بکێشرێ. بەلاّم سەرەڕای ئەوەش، هێزی هزریی ژنان ئەگەر ئازاد بێ، نەك هەر کاریگەرییەکی گەورەتر بەڵکو بەسوودتری بەهرەتری لە سەر باوەڕ و هەستی مرۆڤ دەبێ. ئەوەی کە دەڵێم کاریگەرییەکی نەك گەورەتر بەڵکو پڕ سوودبەخشتر، هۆی تایبەتی هەیە، کاریگەریی ژنان بە سەر بیروباوەڕی گشتییەوە بەردەوام، یا لانیکەم لە کۆنی کۆنەوە، ئێجگار گەورە بووە. کاریگەریی دایکان لە سەر کەسایەتیی سەرەتایی کوڕەکانیان و حەز و گرۆیی پیاوانی گەنج لەوەی کە بکەونە بەر دڵی ئافرەتە گەنجەکان، ڕۆڵێکی گرینگی هەبووە لە بیچمگرتنی کەسایەتیی پیاواندا و لە مێژووی نووسراودا گەلێك بەڵگە لەم بوارەدا هەن. تەنانەت لە سەردەمی هۆمەردا ڕێزگرتن لە ژنان بۆ هێکتۆری مەزن هاندەرێکی بەهێز بوو بۆ شەڕکردن و لەنێو خەڵکی ئەو کاتیشدا ئەم پاڵنەرە جێی پەسەند بووە. ژنان بە دوو شێوە کاریگەرییان لە سەر خووخدەی پیاوان دادەنا، یەکەم ئەوەی کە پیاوانیان هاندەدا هێدی و هێمن بن. ئەوان کە زیاتر لە هەموان لەوانەیە بووبنە قوربانیی توندوتیژی، بە پێی سروشت هەولّیاندەدا هەتا بۆیان دەلویّ بازنەی توندوتیژی تەسکتر کەنەوە و تەوژمەکەی دابەزێنن. ئەوان، کە فێری شەڕکردن نەدەبوون، وایان پێ باشتر بوو نەك لە ڕێگەی شەڕکردن [بەڵکو] بە جۆرێکی دیکە ناکۆکییەکان چارەسەر بکرێن. بە گشتی ئەوانەی بە هۆی تووڕەیی خۆپەرستییانەوە، زیاترین تاڵییەکانیان دەچێشت، لایەنگرانی گەرموگوڕی ئەو بنەما ئەخلاقییانە بوون کە خوازیاری هەوسارکردن (کۆنترۆڵکردن)ی توندوتیژی بوون. ژنان ڕۆڵێکی گرینگیان هەبوو لەوەدا کە گەلانی سەرکەوتووی باکوور بێنە سەر ئایینی مەسیح. چونکە مەسیحییەت لە تەواوی ئایینەکانی بەر لە خۆی بۆ ژنان باشتر بوو. لەوانەیە بتوانین بڵێین کە ئەنگلۆساکسۆنەکان و فرانکییەکان ئەو کاتە روویان کردە ئایینی مەسیحییەت کە هاوسەرەکانی ئێتێلبێرت و کلۆفیس چوونە سەر ئەو ئایینە. بەلاّم ژنان بە شێوەی دیکەش کاریگەرییان لە سەر پیاون داناوە، ئەوان هەولّیانداوە ئەو خەسڵەتگەلەی کە نەیانتوانیوە لە خۆیاندا بێپشکوێنن لە پیاواندا پەروەردەی بکەن و



بە پێویستیان زانیوە کە پیاوان وەکو پشتیوانی ئەوان، خاونی ئەم خەسڵەتانەبن. بوێری و بە گشتی فەزیلەتە سەربازەییەکان، لە تەواوی سەردەمەکاندا تا رادەیەکی زۆر بۆ ئەوە بوونە کە پیاوان ویستوویانە ژنان تاریفیان بکەن و ئەم پاڵنەرە رەهەندگەلێك دەگرێتەوە کە زۆر لە سنووری بوێری و فەزیلەتە سەربازییەکان زیاتر هەڵدەکشێ ـ چونکە پیاوان لە بەر پێگەی تەواو سروشتییان ـ دلۆڤانی و تاریفاتی ژنانیان زۆر بە لاوە گرینگە. بە تێکەڵکردنی ئەم دوو شێوە کاریگەرییە ئەخلاقییەی کە ژنان بە سەر پیاوانەوە هەیانە، ڕۆحیەی شوالّییەگەری[1]* لە پیاواندا سەر هەڵدەدا، کە تایبەتمەندییە دانسقەکەی (ئەم حالّەتە) ئەوەیە کە هەولّدەدا دوو جۆر فەزیلەتی تەواو لێك جیاواز تێکەڵ بە یەکتر بکا. واتە فەزیلەتی شەڕکەری و بوێری لەگەڵ فەزیلەتگەلێکی وەك، هێدی و هێمنی و جوامێری و فیداکاری بە نیسبەت خەڵکی سیڤیل و بێ دیفاع و هەروەها خاکەڕایی و پەسنی ژنان تێکەڵ بکا. ئەوەی کە شوالّییەگەری لەلایەکەوە دەرهەق بە ژنان و لەلایەکیشەوە دەرهەق بە خەڵك دەیکرد لێك جوێ بوون، ژنان دەیانتوانی بە کەیفی خۆیان هەر خەلاّتێکی حەزیان لێ با، بەو کەسانە ببەخشن کە هەولّیاندەدا هەستی خۆشەویستییان ببزوێنن، بەلاّم ئیترخەڵك دەبوونە گوێ لە مستی شوالّییەکان. هەڵبەت دیارە کە شوالّییەگەری لە بواری کردەوەدا جیاواز بوو لەگەڵ شوالّییەگەری لە بواری تیۆریدا. بەلاّم ڕێوشوێنی شوالّییەگەری لە هەر حالّەتێکدا لە بواری ئەخلاقدا یەکێکە لە پڕبەهاترین یادگارەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، نموونەیەکی سەرەنجڕاکێشە لە هەولّێکی ڕێکوپێك و ڕێکخراو کە لەلایەن کۆمەڵگایەکی ئاڵۆزو شێواوەوە پێکهاتووە و مەبەستی ئەوە بوو کە ئارمانجێکی ئەخلاقی بێنێتە گۆڕێ و بەڕێوەی بەرێ، کە زۆر لە هەلومەرج و دامەزراوە کۆمەلاّیەتییەکانی سەردەمی خۆی پێشکەوتووتر بوو. ئەوەندە پێشکەوتوتر کە ڕێبازی شوالّییەگەری نەیتوانی بە ئامانجە سەرەکییەکەی خۆی بگات، بەلاّم بێ سوودیش نەبوو. بە هەر حالّ شوالّییەگەری،

---

١- وشەیەکی فەڕەنسییە بە مانای جوامێر و نەجیبزادە دێت کە لە سەدەی ناڤیندا بە نەجیبزادەیەك دەگوترا کە لەلایەن شاوە پلەی شانازیی پێدەدرا.

کاریگەرییەکی تەواو هەستپێکراو و بە گشتی پڕ بایەخی لە سەر ئامانج و باوەڕەکانی سەردەمی دوای خۆی بە جێ هێشت. ئارمانجی شوالێییەگەری ئەوپەڕی کارتێکەریی سۆزی ژنانە لە سەر پەروەردەی ئەخلاقیی مرۆڤ دەخاتە روو و ئەگەر قەرار بێ کە ژنان هەر لەو پێگەیەی ئێستایاندا بمێننەوە، جێی داخ و کەسەرە کە نەریتی شوالێییەگەری هەرەسی هێناوە. چونکی ئەم نەریتە تاقانە فاکتەرێك بوو کە تا رادەیەك لە کاریگەریی جێی داخی، کوێلەکردنی ژنانی کەم دەکردەوە. بەڵام ئەو گۆڕانانەی بە سەر رەوشی کۆمەڵایەتی داهاتن، وایان دەخواست کە ئارمانجێکی تەواو جیاواز جێگەی ئارمانجی شوالێیگەری بگرێتەوە. شوالێییەگەری هەوڵێك بوو بۆ گۆنجاندنی توخمگەلی ئەخلاقی لە کۆمەڵگەیەکدا کە تێیدا هەموو شتێك بە چاك و خراپەوە بە دەسەڵاتی تاکەوە گرێ درابووە. ئەم ئارمانجی شوالێیەگە دەبوایە بە پاڵپشتی [ئەوانە] کاریگەرییە هاوسەنگکەرەوەکانی دلۆڤانی و جوامێریی تاکەکەسی وەدی بێنن. لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا، هەموو شتێك، تەنانەت لە بەشی کاروباری سەربازیشدا، نەك بە هەوڵ و تێکۆشانی تاکەکەسی بەڵکو بە کردەوە رێکوپێکەکانی چەندین کەس بەڕێوە دەچێ و لەم حاڵەدا، سەرقاڵییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە لە شەڕکردنەوە جێگەی خۆی داوە بە کاروکاسبی و لە بواری سەربازییەوە گوازراوەتەوە بۆ بواری پیشەیی (سەنعەتی). ئەگەرچی پێویستییەکانی ژیانی ئەوڕۆیی فەزیلەتگەلێکی وەك جوامێری و گەورەیی رەت ناکەنەوە، بەڵام تەنیا هەر پشت بەوانەش نابەستن. دادپەروەری و مشوورخواردن لە بنەما سەرەکییەکانی ژیانی ئەخلاقیی سەردەمی نوێن کە بە واتای گرینگیدانی هەر کەسە بە مافی ئەوانی دیکە و توانایی هەر کەس لە پاراستنی خۆیدا. شیوالێییەگە بە بێ ئەوەی هیچ چاوەدێرییەکی یاسایی لە بەرچاو بگرێ، تەواوی ئەو کردە ناڕەوایانەی کە بەبێ هیچ سزایەك لە کۆمەڵگەدا دەکران، وەلادەنا و تەنیا کۆمەڵە کەسێکی هان دەدا کە چاکەیان پێ لە خراپە باشتر بێ بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە تاریف بکرێن و پێیان هەڵ بڵێن. بەڵام ئەخلاق دەبێ گەرەنتییەك هەبێ بۆ بەڕێوەبردنی، بۆ ئەوەی بتوانێ پێش بە خراپە بگرێ. ناکرێ ئاسایشی کۆمەڵگە تەنیا بە شەرافەت و راستگۆیی تاکەکان بسپێردرێ، چونکە بە شێوەیەکی رێژەیی پاڵنەری رەوشتپاکی لە زۆربەی



خەڵکدا لاوازە و هیچ کاریگەرییەکی لە سەر زۆر لە خەڵك نابێ. کۆمەڵگەی مۆدێرن لە کەڵکوەرگرتنی بە جێ و رێ لەو دەسەڵاتەی شارستانییەت پێی بەخشیوە، دەتوانێ لە تەواوی بەشەکانی ژیاندا ناهەقی لە نێوبەرێ و لەم رێگەیەوە ژیان بۆ تاکە هەژارەکانی کۆمەڵگە (کە ئیتر بێ پشت و پەنا نین و لە پەنای یاسادان) سووکتر بکا، بەبێ ئەوەی پشتی بە ئیحساساتی جوامێرانەی کەسێکەوە بەستبێ کە [ئەو کەسە] خۆی هەڵسوکەوتێکی پاوانخوازانەی هەیە, ئێستاش جوانی و چاکەکانی شوالێییەگەری هەر ئەوانەن کە پێشتر بوون، بەڵام ئێستاش مافی هەژاران و هێمنایەتیی گشتیی خەڵك لە سەر بنەمایەکی جێی متمانەتر و پتەوتر دامەزراوە، هەر چەندە لە ژیانی هاوبەشدا ئەو مافانە باسیشیان نییە.

هەنووکە، کاریگەریی ئەخلاقیی ژنان لە رابردوو کەمتر نییە، بەڵام ئیتر ماهیەتێکی ئاوا دیار و لێبڕاوانەی نییە و زیاتر تێکەڵاوی ئەو کاریگەرییە گشتگیرە بووە کە بیروڕای گشتی هەیەتی. ئیحساساتی ژنان، هەم بە هۆی حەز و تاسەی پیاوان بە کەوتنە بەر دڵی ژنان و هەم بە هۆی پەرەپێدانی هاودڵی و هاودەردی لەگەڵ ژنان، کاریگەرییەکی گەورەی لە سەر زیندووراگرتنی هێندێ لایەنی ئارمانجی شوالێییەگەری هەبووە و هەیە. ئەو کاریگەرییە بە روونی لەو رۆڵ و دەورەدا دەردەکەوێ کە بۆ پەروەردە کردنی سۆز و ئیحساسات و بەردەوامیی نەریتگەلی چاوە دێر بە سەر بوێری و جوامێریدا لە ئەستۆی ژنانە. کەسایەتیی ژنان لەم رەهەندانەدا، لە چاو کەسایەتیی پیاوان پلەیەکی بەرزتری هەیە. بەڵام کەسایەتییان لەڕووی عەداڵەتخوازییەوە تۆزێ خوارترە لەپیاوان. لەوانەیە بکرێ بڵێین ژنان بە گشتی لە ژیانی تایبەتیدا هاندەری هێمنی و لەسەرخۆیین و دژی گرژی و توندوتیژیین، بەڵام لەم بوارەدا دەبێ ئەو جیاوازییانەش لە بەر چاو بگرین کە لە کەسێتیی تاکەکەسیی هەر ژنێکەوە سەرچاوە دەگرن. لەو ئەزموونە گەورەترانەی لە ژیاندا دێنەپێش و فەزیلەت و چاکە بەوانەوە گرێدراون (واتە دژوازی نێوان بنەماکان و بەرژەوەندییەکان)، کاریگەریی ژنان ماهیەتێکی زۆر تێکەڵاوی هەیە. کاتێك دژوازی دەکەوێتە نێوان بەرژەوەندییەکان و بنەماکانەوە، ئەگەر پرەنسیپی مەبەست لە ریزی ئەو دەگمەن بنەمایانە بێ کە

پەروەردەی ئەخلاقی و ئایینی ژنان جەختیان لە سەر دەکاتەوە، ئیتر ژنان دەبنە پشتیوانێکی بەتین و گوڕ بۆ چاکەکاری و کوڕ و مێردیان بۆ هێندێ فیداکاری و لە خۆبوردوویی هاندەدەن کە ئەگەر هاندانی ئەوان نەبوایە هیچ کات نەیاندەتوانی (ئەم ئەرکانە) بەڕێوە بەرن. بەڵام بە پێی پەروەردە و پێگەی هەنووکەیی ژنان، ئەو بنەما ئەخلاقییانەی کە ئەوان پابەندن پێیان، بەشێکی گچکەی قەڵەمڕەوی چاکەکان دەگرنەوە، تازە هەر ئەو بنەمایانەش زۆریان ماهیەتێکی نەرێنییان هەیە. واتە ژنان لە هێندێ کردەوە دەگێڕنەوە، بەڵام کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە سەر ئاراستەی گشتیی هزر و ئامانجەکانی ژنان نییە. دەبێ بڵێین بە داخەوە کەمتەرخەمیی ژنان بە نیسبەت ڕەوشی گشتیی ژیان، واتە بێ مەیلیی ئەوان بە هەوڵ و تێکۆشان لەپێناو ئامانجگەلێکدا کە پێوەندییان بە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خێزانەوە نییە، بووەتە هۆی ئەوەی کە کاریگەریی ژنان لەم بوارەی ژیاندا زۆر کەم بێ. هەڵبەت ژنان فێری لایەنە باشەکانی شتە گشتییەکان نەبوون. هەر بۆیەش ناکرێ لۆمەیان کەین کە بۆچی بۆ ئەم ئامانجانە هەوڵنادەن و بۆچی ناهێڵن مێردەکانیان بایەخیان پێ بدەن، لە حاڵێکدا ئەم ئامانجانە لە بەرژەوەندیی بنەماڵەش دان. بە گشتی ئەم ڕەوشە بووەتە هۆی ئەوەی کە کاریگەریی ژنان زۆر لە ئاراستەی بەرژەوەندیی گشتیی دا نەبێ.

بەڵام لەو کاتەوە کە پانتایی چالاکییەکانی ژنان هێندێك بەرفراوان بووەتەوە و ڕێژەیەکی بەرچاویان بە کردەوە بۆ بەرەوپێشبردنی ئامانج گەلێك هەوڵدەدەن کە سەرووترن لە مەسەلەی بنەماڵەیی و بەشێکیان لە بیچمپێدان بە ئەخلاقیاتی گشتی پێدراوە. کاریگەریی ژنان لە سەر دوو تایبەتمەندیی لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی ئەورووپای مۆدێڕنن، بایەخ و گرینگییەکی زۆری هەیە، کە یەکێکیان دژایەتیکردنی شەڕ و ئەویتر کاروباری مرۆڤدۆستانەیە. هەر دووکی ئەم تایبەتمەندییانە جێی ڕێزن، بەڵام کاریگەریی ژنان هەرچەندە لە هاندان و وزە بەخشین بەو ئیحساساتانەدا بە گشتی پڕ بایەخن، بەڵام بە داخەوە کاریگەرییەکەیان لە هێندێ بواری تایبەتدا لانیکەم چەندە بە قازانجە ئەوەندەش زیانی هەیە و ئەوەش بە تایبەتی لایەنی چالاکییەکانی مرۆڤدۆستانە دەگرێتەوە. ژنان گرینگی زیاتریان بە دوو بواری چالاکیی مرۆڤدۆستانە



داوە: یەکێکیان بانگەشەی گۆڕینی ئایین دووهەم بەشداریکردن لە کاروباری خێرخوازیدا. بانگهێشت بۆ ئایینی نوێ ئەگەر لە نێوخۆی وڵات دابێ، جگە لە دوژمنکاری چی لێ شین نابێتەوە. ئەگەر لە دەرەوەی وڵاتیش بێ، زیاتر بزووتنێکی کوێرانەیە بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو. لە وەها بزاوتێکدا لەوانەیە لە ئامرازگەلێك کەڵك وەرگیردرێ کە هەم بۆ ئامانجی گۆڕین و هەم بۆ ئامانجە دڵخوازەکان شتی خراپی لێ بکەوێتەوە و ئەم شتە خراپانەش هیچ کات لە پێشدا دیار نین و ئەگەر دیاریش بن گرینگییان پێ نادرێ. بەڵام کاروباری خێرخوازانە، ئەوەی لێرەدا مەبەستە: کاریگەریی خێرا و ڕاستەوخۆیە لە سەر کەسانێك کە ئاتاجیان پێیەتی. بەڵام دەبێ ئەوەندە بزانین کە دواجار ئاکامی ئەو کارە بە قازانجی کۆمەڵگە نییە، لە ڕاستیدا کاریگەرییە کورت ماوە و درێژخایەنەکانیان لێکدژن. ژنان وا ڕاهێنراون کە هەست و سۆزیان بە سەر عەقڵ و لۆژیکیاندا زاڵە و لە تەواوی ژیانیاندا عادەتیان گرتووە کاریگەریی خێرای کردەوەی خۆیان بە سەر ئەم یا ئەو کەسەوە ببینین و سەرنج و بایەخێکی ئەوتۆ بە کاریگەرییە درێژخایەنەکانیان لە سەر توێژەکانی خەڵك نەدەن. هەر بۆیە، نە تێدەگەن و نە دەیانەوێ قەبووڵبکەن کە هەر کام لەو چالاکییە مرۆڤدۆستانە و چاکەکارانەیەی هەستی دڵسۆزییان تێردەکات، لە درێژماوەدا زیانی لێدەکەوێتەوە. بارستایی قورس و ڕوو لە زیاد بوونی ئەو چاکەکارییە ناهۆشیارانە و کورت بیرانەیەی کە بەڕێوەبردنی ژیانی کەسەکان لە چنگیان دەردێنی و لە دەرەنجامی خراپی کردەوەکانیان ڕزگاریان دەکا، بنەماکانی ڕۆحبەرزی و متمانە بە خۆیی و بە سەرخۆزاڵبوونیان تێدا کاولدەکا، لە حاڵێکدا ئەم بنەمایانە بۆ بەختەوەریی تاك و فەزیلەتی کۆمەڵگە ڕەگەزگەلێکی ئێجگار پێویستن. لە ڕاستیدا یارمەتی و بەخشینی لەم جۆرە بەفیڕۆدانی ئیمکانات و هەستی خێرخوازانەی خەڵکییە و لەبری ئەوەی دەرەنجامگەلێکی باشیان لێ بکەوێتەوە، دەرەنجامی خراپی بە شوێن دادێ و یارمەتی و هاوڕێیەتیی ژنان پانتایی ئەم دەرکەوتانە زۆر بەرفراوان دەکاتەوە و کاریگەرییەکەیان تەوژمەکەی زیاتر دەکا. هەڵبەت ئەو ژنانەی کە خۆیان بە کردەوە بەڕێوەبەرایەتیی و جڵەوی ئەم یارمەتییانەیان لە ئەستۆیە، لەوانەیە ئاگاداری ئاکامە خراپەکانی بن. لە هێندێ شوێندا، ئەو ژنانەی بەڕێوەبەرێتیی کاروباری خێرخوازانەیان لە

ئەستۆیە بەوپەڕی روونییەوە لە کاریگەریی هیوابڕیی بەخشین و یارمەتییەکان تێدەگەن و دەتوانن ئەو شتانەی فێری بوون فێری پیاوانی خاوەن رای بواری ئابووریی سیاسیی بکەن- ژنان بە هۆی ئەوەی کە لە فامکردنی واقیعەکان، بە تایبەتی لە تێگەیشتن لە بیروڕا و هەستی ئەوانەی پێوەندییان پێوەیانە، لە پیاوان بە تواناترن و لە پیاوان باشتر دەرەنجامە خراپەکانی ئەو کارانە هەست پێ دەکەن. بەڵام ئەو ژنانەی تەنیا پارەی خۆیان بۆ ئەم رێگەیە تەرخاندەکەن و دوا دەرەنجامەکانی ئەم کارە بە چاو نابینن، چۆن دەتوانن هەست بەم دەرکەوتە خراپانە بکەن؟ ژنێك کە لەم هەلومەرجانەدا پەروەردە کراوە و بەو رۆڵەی وەکو ژنێك دەینوێنێ قایلە، چۆن دەتوانێ بایەخی متمانەبەخۆیی بزانێ؟ ئەو کەسەی خۆی پشت بە خۆی نابەستێ و فێریان نەکردووە پشت بە خۆی ببەستێ، چارەنووسەکەی ئەوە دەبێ کە هەموو شتێکی خۆی لە خەڵکانی دیکەوە وەرگرێ. ناکرێ چاوەڕوانیت لە وەها کەسێك هەبێ کە بڵێ: ئەوەی بۆ ئەو باشە بۆ هەزاران خراپە. ئەو وێنانەی ئەو لە چاکە هەیەتی، چاکەیەکە، کە باڵادەست دەرهەق بە ژێردەست دەیکا. ئەو لە بیری دەچێتەوە کە خۆی سەربەست نییە، بەڵام هەزاران ئازادن و ئەگەر ئەوەی هەزاران خوازیارن بەبێ هیچ ماندووبوونێك بخرێتە بەر دەستیان، ئیتر پێویستیان بە خۆماندووکردن نابێ. ئەو لە بیری دەچێتەوە کە نابێ هیچ کەسێك بخرێتەوە ژێر چاودێریی کەسێکی دیکەوە و دەبێ تاکەکان هان بدرێن کە ئاگایان لە خۆیان بێ و دواجار، تەنیا یارمەتییەکی راستەقینە بەو کەسەی ساخ و سەلامەتە ئەوەیە کە یاریدەی بدەن کە بتوانێ یارمەتیی خۆی بکا.

ئەو تێبینییانە دەریدەخەن کە ئەگەر ژنان بە جۆرێك پەروەردە بکرێن کە گرینگی زیاتر بە پرسە گشتییەکان بدەن و ئەگەر بە کردەوە ئەو شتانەیان زیاتر پێ بناسێندرێن کە بیروڕاکانیان لە سەریان شوێندانەرن، ئەو رۆڵەی لە گەلاڵەکردنی بیروڕای گشتیدا دەیگێڕن بە ئاراستەی پۆزەتیف دا دەگۆڕدرێ، دیارە تەواوی ئەوانەش بەوەوە بەستراوەتەوە کە ژنان ئازادیی سیاسی و کۆمەڵایەتی وەدەستبێنن. و ئەگەر وای لێ بێ، ئەو کاریگەرییەی هەر ژنێك لە نێو بنەماڵەکەیدا دەیبێ، بە شێوەیەکی بەرچاو بەکەڵکتر دەبێ.



زۆر دەڵێن: لە نێو ئەو توێژانەدا کە زیاتر لە بەردەم هەڵەکردندان، ژن و منداڵی پیاو دەبنە هۆی ئەوەی ئەو لە هەڵە بەدوور بێ و ژیانێکی شەرافەتمەندانە بگرێتەبەر. چونکە هەم ژنە راستەوخۆ مێردەکەی بۆ وەها شتێك هاندەدا و هەم پیاویش بۆ بەختەوەریی بنەماڵەکەی وەها رێگەیەك دەگرێتەبەر. لەوانەیە ئەم پرسە راست بێ و لە نێو ئەو کەسانەی کە لە ناخیاندا کەمتوانایی زاڵە بەسەر خراپەدا، بێگومان زۆربەی جاران راستە. بەڵام دەبێ لە بەرچاومان بێ کە ئەگەر ژن و پیاو مافی وەك یەکیان هەبێ کاریگەریی باش (پۆزەتیڤ)ی ژن لە سەر پیاو نەك هەر دەمێنێتەوە بەڵکو بەهێزتریش دەبێ، چونکە ئەو کاریگەرییە بە ملکەچیی ژنەوە گرێ نەدراوە بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە ملکەی و گوێڕایەڵیی ژن کەم دەکاتەوە، چونکە پیاوە بوودەڵەکان هەمیشە لە ناخی خۆیاندا ئەو کەسانەیان پێ سووکە، کە ژێردەستیانن. کەچی کاتێك دەچینە ئاستی سەرووتر لەگەڵ کۆمەڵێك هانە (ئەنگیزە)ی تەواو لێك جیاواز رووبەڕوو دەبین. لێرەدا ژن زیاتر هەوڵی ئەوەیەتی نەهێڵێ کە مێردەکەی بکەوێتە خوارەوەی ئاستی پێوەرە باوەکانەوە، بەڵام بەهەمان رادەش هەوڵ دەدات نەهێڵێ پێبەندی پێوەرگەلی باڵاتر بێ. بە واتایەکی دیکە، ژن پشتیوانی بەها و باوەڕە باوەکانە. ئەو پیاوەی کە هاوسەرەکەی لە چاو خۆی ئاستی تێگەیشتنی نزمترە، وەکو بارێکی قورس دەیبینێ کە هەمیشە بە کوڵیەوەیەتی و لەوەش خراپتر وەکو کۆسپێکی دەبینێ وا بەندگەلێکی ئەوتۆی بە دەست و پێوەیە، زۆر ئەستەمە بتوانێ بەها مەزنەکان دەستەبەر بکا. کە لە رۆیشتنی لە رێڕەوی هەر ئارمانجێکدا کە لە بەها باوەکانی کۆمەڵگە باڵاترە، بەری پێ دەگرێ پیاوێك کە ئەگەر باوەڕەکانی ئەو لە باوەڕەکانی خەڵك جیاوازن، و ئەگەر حەقیقەتگەلێك دەبینێ کە هەر بە زەینی خەڵکیدا نەهاتوون، یا ئەگەر حەقیقەتگەلێك لە دڵی خۆیدا هەست پێدەکا کە خەڵکی ئاسایی تەنیا تێگەیشتنێکی رواڵەتییان لێی هەیە، لەوەها حاڵەتێکدا ئەو حەزی لێیە لە چاو خەڵك بە چاوکراوەیی و بەرپرسیارییەتییەکی زیاترەوە خۆی بە پێبەندی ئەو راستییانە بزانێ و زەماوەند و هاوسەرگیری، وەها پیاوێك لە تەواوی ئارمانج و باوەر

و ئارەزووەکانی دوور بخاتەوە، مەگەر ئەوەی کە لەگەڵ ژنێك ژیانی هاوبەش پێکبێنێ کە بە رادەی ئەو بیرکردنەوەکانی لە ئاستێکی باڵاتر لە باوەڕە باوەکاندا بێ.

پێبەندبوون بە باوەڕە باوەکانی کۆمەڵگە، لە هەنگاوی یەکەمدا دەخوازێ کە تاك هەتا رادەیەك بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی وەلا بنێ، بەرژەوەندیگەلێك کە لەوانەیە کۆمەڵایەتی یا ماددی بن و پێبەندی بە وەها باوەڕگەلێك زۆر جار لەوانەیە نان و دۆی ببڕن. لەوانەیە پیاو ئامادە بێ تەواوی تاڵی و سوێرییەکان بە گیان بکڕێ، بە مەرجێك تەنیا هەڕەشە لە خۆی بکەن، بەڵام کاتێك بنەماڵەکەشی بگرێتەوە لەوانەیە تووشی دوودڵی بێ. لێرەشدا مەبەست لە بنەماڵە، کچ و خێزانی کابران، چونکە ئەو هەمیشە بەو هیوایەیە کە کوڕەکانی هەستێکی وەك هەستی ئەویان هەبێ و ئەوانیش بە مەیل و حەزەوە لە پێناو ئارمانجەکانی ئەودا لەگەڵ گرفتەکان خۆ بگونجێنن. بەڵام بە نیسبەت هاوسەر و کچەکانەوە شتەکە تەواو جیاوازە. کچەکان لەوانەیە مێردکردنەکەیان لە کیس بچێ و ژنیش ئەو ئارمانجانەی کە ئەو هەموو فیداکارییەیان دەوێ یا لێیان تێناگا یا ناتوانێ بە ئی خۆییان بزانێ و ئەگەر رێزیکشیان لێدەگرێ تەنیا لە بەر هاوسەرەکەیەتی و ئەو متمانەیەی کە بەوی هەیە. بەم شێوەیە ژن دەبێ لە شتگەلێکدا بەشداری بکات کە وەك خۆی هیچ حەزی لێیان نییە لەحاڵێکدا تەواوی ئەو شتانەی کە پیاو دەبێ دەستیان لێ بەربدا پێوەندییان بە ژنەوە هەیە. لەوەها رەوشێکدا ئایا، باشترین و فیداکارترین پیاوەکانیش بەر لە کردنی هەر کارێك و سەپاندنی وەها دەرکەوتەگەلێك بە سەر هاوسەرەکەیاندا تووشی دڕدۆنگی نایەن؟ تەنانەت ئەگەر چالاکییەکانی پیاو نەك ژیان و هێمنایەتیی بنەماڵە بەڵکو تەنیا پێگە کۆمەلاتییەکانیان بخاتە مەترسییەوە، ئایا دیسانیش ویژدانی پیاو ناکەوێتە بن بارێکی ئێجگار قورس؟ هەر کەسێکی ژن و منداڵی هەبێ، کۆنەپارێز دەبی و مل بۆ [نۆرمە] باوەکانی کۆمەڵگە رادەکێشێ. پەیڕەوی لە شتە باوەکان لەوانەیە بەلای پیاوەوە گرینگییەکی ئەوتۆی نەبێ، بەڵام بۆ هاوسەرەکەی زۆر گرینگن. ئەو پیاوەی باوەڕکانی لە باوەڕی خەڵکی ئاسایی لە سەرترن، زۆر لەوانەیە



ئەو شتەی کە لە بەر باوەڕەکانی لە دەستی دەدا بەو گرینگییە قەرەبوو بکرێتەوە کە هاوبیرەکانی بۆی قایلن، بەڵام ئەو ناتوانێ قەرەبووی ئەو شتانە بکاتەوە کە هاوسەری و کچەکانی لە دەستی دەدەن. زۆر کەس بۆیە ژنان لۆمە و سەرکۆنە دەکەن چونکە هەمیشە حەزیان لێیە سەرنجی خەڵك راکێشن و ئەوەش بە خاڵی لاواز و نیشانەی کاڵی و کرچیی ئەوان دەزانن. کە وەها تێگەیشتنێك دادپەروەرانە نییە. لەنێوان ئەو چین و توێژانەدا کە ژیانیان دوورە لە ژان و ئازار و دەستکورتی، خۆبەخشی و فیداکاریی ژنان بەردەوام درێژەی هەیە، وەها رەوشێك دەخوازێ کە ژنان بەردەوام حەزە سروشتییەکانیان هەوسار کەن و تەواوی گرۆیی و حەزە شەخسییەکانیان وەلا نێن، بە جۆرێك کە زۆر جاران شیاوی ئەوەن پێیان بگوترێ ((شەهید)). ئەوەی ئەوان لە بەرانبەر تەواوی ئەو فیداکارییانەدا بە دەستی دێنن سەرنجی دەورووبەرییەکانە و ئەم سەرنجە لە هەنگاوی یەکەمدا سەرنجی مێردەکەیەتی. ژن پاش ئەوەی بە تەواوی نرخی ئەو سەرنجەی دا، کتوپڕ تێدەگا کە شتێکی وای نەماوە سەرنجی مێردەکەی لە کیس بچێ، بەبێ ئەوەی بتوانێ لە هۆکارەکەی تێبگا. ئەو تەواوی ژیانی خۆی کردۆتە فیدای ئەوەی کە سەرنجی مێردەکەی راکێشێ، بەڵام مێردەکە هیچ کام لە شەهوەت و هەڵسوکەوتە ناباوەکانی خۆی ناکاتە فیدای سەرنج و ویستی ئەو، ئەوەش خاڵێکە کەس لێی تێناگا و لە بەراوردەکانیدا لە بەر چاویان ناگرێ و هەموو کەس لەگەڵ رای ئەو ژنەن کە: گەمژەیی کردووە، هەڵبەت ئەگەر بۆچوونێکی خراپتریان لە سەری نەبێ! ئەم رەوشە بە تایبەتی لە سەر پیاوگەلێك کە هەڵسوکەوتەکانیان شایەنی ستایشن، دەگاتە ئەوپەڕی دژوارییی خۆی. ئەم پیاوانە لەو تواناگەلە بێبەشن کە دەبێتە هۆی کەسایەتییەکی بەرجەستە لە نێو هاوبیرەکانیدا. بەڵام ئەوان بە تەواوی هێزەوە پێبەندن بە ئارمانجەکانیان و بە ئەرکی خۆیانی دەزانن کە لە رێگەی بانگەشەی باوەڕەکانیان و بە تەرخانکردنی وزە و کات و تواناکانیان، بەوپەڕی دڵپاکییەوە بە رێبازی ئەو ئارمانجانەدا برۆن. خراپترین حاڵەت کاتێك روو دەدا کە ئەمجۆرە پیاوانە پێگەی کۆمەڵاتییان جۆرێك بێ کە لە خۆوە بە دڵخوازی خۆیان

بگەیەنیّ نەك ئەوەی کە لەوەها جێگەیەك بێبەشیان بکا. لەم حاڵەتەدا شکست یان سەرکەوتنی تاك لە نێو کۆمەڵدا زیاتر بەو وێنایەوە بەستراوەتەوە کە بە نیسبەت ئەو لە زەینی خەڵکدا بیچمی گرتووە. هەر چەندە لەوانەیە هیچ کەمایەسییەك لە پەروەردە و ئاکار و هەڵسوکەوتی وەها کەسێکدا نەبیّ، بەڵام سووربوونی لە سەر ئەو باوەڕگەلەی لە روانگەی کەسانی دەستڕۆیشتووەوە نامـاقووڵ دەنوێنن، لەوانەیە نەهێڵن بە زۆربەی ئەو پێگەیانە بگات. زۆرن ئەو ژنانەی دڵیان بەوە خۆش دەکەن (و لە هەر دە دانەیان نۆیان بە هەڵە) کە هیچ شتێك بەربەست نییە لەوەی کە ئەوان لەگەڵ مێردەکەیان بچنە باشترین کۆبوونەوەکان بێجگە لە نانەریتی (غیرسنتی) بوونی مێردەکەی یا بەناوبانگبوونی ئەو بە هەبوونی هەڵوێستی رادیکاڵانە لە بواری سیاسەتدا. چونکە ئەو دەبینیّ کەسانی هاوشانی خۆی و ئەوانەی ئەو بە تەواوی دەیانناسیّ بە هاسانی دەچنە ئەم کۆڕ و کۆبوونەوانە.

بەم جۆرە، ژن پێی وادەبیّ کە ئەوە ئارمانجەکانی مێردەکەیەتی کە ناهێڵن بگاتە فلان پلە و پایە. یا ئەوەی کە کچەکەی مێردێکی باشی دەستبکەویّ، یا دەبنە هۆی ئەوەی مێردەکەی بۆ فلانە میوانی یان رێورەسمی فەرمی بانگهێشت نەکریّ، چونکە دەبینیّ هیچی لەوانە کەم نییە کە بەو شوێنانە دەگەن. بە هەبوونی ئافرەتگەلی بەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە هەموو بنەماڵەکاندا، کە یا بە ئاشکرایی بۆچوونی خۆیان دەسەپێنن، یا بەبیّ ئەوەی کە بیروڕایان دەربڕن بەشێوەیەکی کاریگەرتر جێبەجێی دەکەن، ئایا شتێکی سەیرە کە ئەخلاقیاتی زۆربەی خەڵك لەوەها ئاستێکی نزم دابیّ؟ ئایا جێی سەرسووڕمانە کە ئەخلاقیاتی لەم چەشنە بووەتە روخسارێکی دیاری سەردەمی نویّ؟

ئەوەی هەتا ئێرە باسمانکرد ئەو خاڵە لاوازانە لە خۆ دەگریّ کە پەروەردە و ژینگەی کۆمەڵایەتیی ژنان بە سەریاندا دەسەپاند. کەچی لە پێوەندییەکانی ئێستای نێوان ژن و پیاو دا، لایەنێکی کاوڵکاری دیکەش هەیە کە راستەوخۆ پێوەندیی بە کەموکوڕی، لاوازییەکانی ژنانەوە نییە، بەڵکو پێوەندیی بەو جیاوازییە مەزنانەوە هەیە کە لەنێوان کەسایەتیی ژن و پیاو دان و ئەم جیاوازییانەش خۆیان بەرهەمی



ئەو کەموکوڕییانەن. یەکیەتیی نێوان هزر و حەزەکانی ژن و مێرد دڵخوازترین رەوش لە ژینی هاوبەشیاندا پێکدێنی و هیچ شتێك بۆ ئەم لەو جیاوازییە خراپتر نییە کە باسمانکرد. پێوەندیی خۆشی نێوان ئەوانەی کە زۆر لێك جیاوازن خەونێکی درۆیینە. جیاوازبوون لەوانەیە سەرنجی کەسەکان بۆ لای یەکتر راکێشیّ، بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە هاوڕایی و پێك گونجاوییەکی هاوڕیّ لەگەڵ وێکچوییە، کە بەختەوەری بۆ کەسەکان بە دیاری دێنیّ. لە کاتێکدا جیاوازییەکی وا گەورە لەنێوان ژنان و پیاواندا هەیە، سەیر نییە کە پیاوانی خۆپەرست بە پێویستی دەزانن کە خاوەنی دەسەڵاتی رەها بن بۆ ئەوەی بەر لە هەر شتێك دژبەری و جیاوازیی ئەبەدیی نێوان خۆیان و ژنەکانیان لە تەواوی بوارەکاندا بە قازانجی خۆیان چارەسەر بکەن. کاتێك تاکەکان بەمجۆرە لێك جیاوازن، ناکریّ یەکیەتیی بەرژەوەندییەك لە نێوانیاندا پێك بیّ. زۆرمان دیتووە کە لە سەر گرینگترین ئەرکەکان ناکۆکییەکی قووڵ لەنێوان ژن و مێرددا هەیە. لەوەها رەوشێك دا ئایا پێوەندیی هاوسەرێتی بنەمایەکی راستەقینەی هەیە؟ بەڵام دەسەڵاتی مێردیش هەمیشە لە هەموو جێیەك بیّ خەنیم (رەقیب) نییە، لە وڵاتانی کاسولیکی ئەو ژنانەی کەسایەتییەکی پتەوتریان هەیە لە زۆربەی کاتەکاندا بۆ دژایەتی لەگەڵ مێردەکانیان پەنا دەبەنە بەر دەسەڵاتێکیتر. ئەم دەسەڵاتە هەمان کڵێسەیە کە لە قەڵافەتی قەشەدا دەردەکەوی و ژن فێر بووە کە لە بەرانبەر ئەویشدا کرنۆش بەریّ. نووسەرە لیبراڵەکان و پرۆتستانییەکان بە توندی رەخنە لە کاریگەریی قەشەکان لە سەر ئافرەتان دەگرن. بەڵام نەك لە بەر ئەوەی ئەم کاریگەرییە لە جەوهەردا شتێکی خراپە بەڵکو لەبەر ئەوەی کە پیاوان عادەتیان بەوە نییە کە دەسەڵاتە بیّ سنوورەکەیان بکەوێتە بەر هەڕشە و کاریگەریی قەشەکان خەنیمێکە لە هەمبەر هێژموونیی پیاودا و هەڕشە لە بیّ هەڵەیی ئەو دەکا. لە بریتانیاش جاری وایە لەم ناکۆکییانە دێنە پێش و ئەوەش کاتێکە کە ژنێکی باوەڕمەند بە پرۆتستانی ئینجیلی مێردی بە پیاوێکی سەر بە ئایینزایەکیتر کردووە، بەڵام ئەوە کەمتر دەبێتە هۆی ناکۆکی، چونکە کۆمەڵگە هزری ژنانی ئەوەندە

دابەزاندووە کە جگە لە هێندێ بابەتی وەکو ڕێوشوێنی شەرم و حەیا و ئەو شتانەی مێردەکانیان پێیان دەڵێن، بۆچوونێکیتریان نییە. کاتێك لە نێوان هزر و باوەڕەکاندا جیاوازییەك نەبێ، ئەو جیاوازییانەی بەس بنەمای سەلیقە و حەزیان هەیە، لەوانەیە ژیان لە ڕێچکەی بەختەوەری دوور بخەنەوە. ئەگەر جیاوازیی سەلیقە و حەزەکان تێکەڵ بە جیاوازییە پەروەردەیی و هەروەها ئەو جیاوازییانە بن کە لە سروشتی ژن و مێردەوە سەرچاوە دەگرن، هەر چەندە لەوانەیە لەسەرەتادا حەزی سێکسیی پیاو ببزوێنن، بەڵام نابنە هۆی بەختەوەریی لە ژیانی هاوسەرێتیدا. ئەگەر ژن و مێرد هەڵسوکەوتی ماقول و جوانیان بێ، زەوق و سەلیقەی یەکتریش قەبووڵدەکەن، بەڵام ئایا وێکهەڵکردن و پێکەوە سازان هەر ئەو شتەیە کە ئەوان لە سەرەتای ژیانی هاوبەشدا بەبێ ئۆقرەیی چاوەڕوانین؟ سروشتییە حەزە جیاوازەکانی ژن و پیاو دەبێتە هۆی جیاوازبوونی تاسە و ئارەزووەکانیان، مەگەر ئەوەی کە هەستی بەرپرسیارییەتی یا خۆشەویستی ببێتەهۆی سنووردرابوونی جیاوازییەکان، هەروەکو لە ڕەوشی بنەماڵەییدا زۆر جاران بەو جۆرەیە.

زیاتر لەنێوان ژن و پیاودا ناکۆکیی گەورە هەیە لە سەر ئەوەی کە لەگەڵ کێ هەستن و دانیشن یا هاموشۆی کوێ و [کێ] بکەن. هەر کەسەی دەیەوێ لەگەڵ ئەو کەسانە سەروسڵاوی هەبێ کە لەگەڵ خووخدەی ئەو یەك دەگرنەوە و ئەو کەسانەی کە یەکێکیان زۆر کەیفی پێیان دێ، لەوانەیە ئەویتر نەك خۆشی نەوێن بەڵکو ناخۆشیشیی بوێن. ئەو کەسەی لانیکەم لە لای هەردووکیان ئاسایی دیار نییە، ناتوانێ بێتە ڕیزی دۆستەکانیانەوە. چونکە ئێستا ژن و پیاو وەکو سەردەمی لۆیی پازدەهەم نین کە هەر کام لە جێگەیەکی جیا لە بنەماڵە بژین و هاوڕێی تایبەت بەخۆیان هەبێ. هەر کام لە ژن و پیاو بۆ بارهێنانی منداڵەکانیان بۆچوون و ئارەزووی جیاوازیان هەیە و هەر کام دەیەوێ زەوق و باوەڕ و هەست و سۆزەکانی خۆی لە منداڵەکانیدا بژێنێتەوە. هەر بۆیەشە، یا دەبێ پێك بێن و هەر کام بە نیوە حەزەکانی قایل بێ یا ژن دەبێ پێملی مێردەکەی بێ ــ کە وەها پێمل بوونێك زۆر جاران ژان و ئازاری لەگەڵە و ژن بە



ویستی خۆی بێ یان بە ویستی خۆی نەبێ، کارتێکەریی خۆی دەخاتە گەڕ و ڕیسی مێردەکەی دەکاتەوە خوری.

هەڵبەت زۆر ساویلکانەیە کە پێمان وابێ ئەو هەست و حەزە جیاوازانەی لە ژنان و پیاوندا هەن تەنیا لەوەوە سەر هەڵدەدەن کە ژنان بە شێوازی جیاواز لە پیاوان پەروەردە دەکرێن و دەکرێ جیاوازیی زەوق و سەلیقە لە هەلومەرجی تایبەتدا لە نێو ببرێن. بەڵام بە هیچ شێوەیەك لەهەڵەدا نابین ئەگەر بڵێین پەروەردەی جیاواز ئەم جیاوازییانە زیاتر دەکا و وەکو شتێکی داسەپاو و چارەهەڵنەگر دەیانخاتە ڕوو - کاتێك ژنان بەو جۆرە پەروەردە دەکرێن کە ئێستا دەیبینین ئەستەمە ژن و پیاو لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بتوانن بە ڕاستی پێکبێن و حەز و ئارەزووکانیان وەك یەك بن. ژن و پیاو زیاتر پێکهاتن لەم بارە دا بە مەحاڵ دەزانن و چاوپۆشی لێدەکەن، لە حاڵێکدا لە پێوەندییەکانی ڕۆژانە دا، ویستن و نەویستنە یەکسانەکان دەستەبەرکەری هەر چەشنە دۆستایەتییەکی بێ خەوشە و ئەگەر ڕەوشەکە بە دڵی پیاوەکە بێ ئەوا ئەو سەرکەوتنە بە هەڵبژاردنی ژنێك بە نسیبی ئەو بووە کە بە چەشنێك بەتاڵە لە هەر هزر و باوەڕێك کە ویستن و نەویستن نازانێ و هەرچی پیاو بیڵێ دەیکا. بەڵام تەنانەت وەها هەڵبژاردنێکیش سەرکەوتنی بە دواوە نابێ چونکە بێ مشووری و بێ وەرەیی ئەو گوێڕایەڵەی وەدی ناهێنێ کە پیاو چاوەڕوانێتی و ئەگەر بشیهێنێ ئایا ئەوە ئەوپەڕی دڵخوازی ژیانی هاوبەشە؟ هەبوونی وەها ژنێك چ جیاوازییەکی لەگەڵ بوونی قەرەواشێك یا پەرستار یا مەعشوقەیك هەیە؟ ئەگەر هیچ کام لەو دووانە بێ نێوەرۆك نەبن و هەر کام بیروڕا و حەزی تایبەت بە خۆیانیان هەبێ، کاتێك دەکەونەوە لای یەك، جیاوازییەکانیان ئەوەندە نین کە نەتوانن ژیانی هاوبەش پێك بێنن، لەگەڵ ئەوەی ژیانی هاوبەشیان دەست پێکرد بەشدارییان لە شتە هاوبەشەکاندا، لەگەڵ خۆشەویستییەکەیان، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی توانا شاراوەکانی هەر کامێکیان بە هۆگرییان نیسبەت بەو شتانەی لە سەرەتادا یەکێکیان حەزی لێی بوو، لێرەوە وردە وردە ئینتیما و سەلیقە و

کەسایەتییەکانیان لە یەك دەچن[1]* و ئەم هاوچەشنییە تا رادەیەك بەرهەمی ئەو گۆڕانانەیە کە لە هەر کامێکیاندا پێك دێن و بەلاّم زیاتریش بەرهەمی دەولّەمەندبوونی کەسایەتییانە، چونکە هەرکام توانا و حەزەکانی ئەویتر دەخاتە سەر خەرمانی خۆی. ئەوە هەر ئەو حالّەتەیە کە زۆر جار لەنێوان دوو هەڤالّی هاوڕەگەزدا پێش دێ، ئەو کاتەی کە ئەو دووانە لە ژیانی رۆژانەیاندا پێوەندییەکی زۆریان پێکەوە هەیە. ئەگەر بارهێنانی ژن و مێرد ئاوا لێك جیاواز نەبوایە، وەها حالّەتێك لە ژیانی هاوسەرێتیدا، ئەگەر نەشلّێین باوترین حالّەتە، (لانیکەم) یەکێك بوو لە حالّەتە باوەکان. بەلاّم لە دۆخی ئێستادا پێوەندیی راستەقینەی هاوئاهەنگی نێوان ژن و مێرد تا رادەیەکی زۆر مەحالّە. ئەگەر ئەم رەوشە چاك بوایە، هەر چەندە جیاوازیی لە سەلیقە تاکەکەسییەکاندا لەوانە بوو هەر وا بمێنیتەوە، بەلاّم لە سەر ئامانجە سەرەکییەکانی ژیان یەکیەتی و هاوبیروڕاییەکی تەواو پێکدەهات و وەها یەکیەتییەك دەبوو بە رێسایەکی گشتی.

کاتێك دوو کەس لە سەر ئامانجە سەرەکییەکانی ژیانیان کۆك بن و لەم بوارەدا یارمەتیدەری یەکتر بن و هاندەری یەکتر بن، ئەو مەسەلە بچووکانەی کە ئەوان لە سەری ناکۆکن بە لایانەوە زۆر گرینگ نین و لە وەها رەوشێکدا بنەمایەکی پتەو بۆ دۆستایەتییەکی قایم لەنێوان ژن و مێرددا پێکدێ، بنەمایەك کە بە درێژایی ژیان لە جێی خۆی دەبێ و فاکتەری قایم بوونیشی بەر لە هەر شتێك، ئەو ورەیەیە کە چێژبەخشین بە ئەویتر بە لایەوە شیرینترە لە چێژی شەخسی.

ئەوەی هەتا ئێستا وتوومە سەبارەت بەو کاریگەرییە خراپانە بوو کە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو لە سەر چێژ و سوودەکانی ژیانی هاوبەش بە جێیان دێلّێ. بەلاّم ئەگەر جیاوازیی نێوان ژن و پیاو بە واتای سووکبوونی یەکێکیان و مەزنتر بوونی ئەویتر بێ کاریگەرییە نەرێنییەکانی زۆر بە تەوژمتر دەبێ. جیاوازی، ئەگەر

١ـ کورد دەلّێ: دوو گا لە پالّ یەکدا بن یا خووی یەك دەگرن یا رەنگی یەکتر.



تەنیا بە مانای جیاواز بوون لە خەسلّەتە باشەکاندا بێ، نەك هەر هێمنایەتیی ژیان ناشێوێنێ بەلّکو دەبێتە هۆی کاملّبوونی هەردووکیان. کاتێك کەسێك تایبەتمەندییەکانی ئەویتر دەکاتە سەرمەشقی خۆی حەز دەکا ئەو تایبەتمەندییانە وەدەست بێنێ، جیاوازیی نێوان ئەو دوانە نابێتە هۆی ناکۆکیی بەرژەوەندییەکان، بەلّکو بەرژەوەندییەکان پتر دەکاو دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەهای هەر کامێك لە لای ئەویتر زیاتر بێ. بەلاّم کاتێك توانا زەینی و کولتوورییەکانی کەسێك زۆر نزمتر بێ لە بەرانبەرەکەی و ئەو هیچ هەولّ نەدا خۆی پێ بگەیەنێ، ئەو کاریگەرییەی لایەنی بالاّتر لەوی وەردەگرێ هەمووی نەرێنی دەبی و ئەم کاریگەرییە نەرێنی یە لە هاوسەرگیرییە سەرکەوتووەکاندا ئێجگار پترە تا لە هاوسەرگیرییە ناسەرکەوتووەکان. کەسێك کە یەکێکی تر بۆ دۆستایەتیی هەلّدەبژێرێ کە لە هزرو ئاوەزدا لەو نزمترەو دەیکاتە تاقانە هاودەم و هاونشینی هەمیشەیی خۆی، بە هیچ شێوەیەك لە زیان پارێزراو نییە. هەر دۆستایەتییەکی نەبێتە هۆی پێگەیشتن، دەبێتە هۆی داڕمان و هەر چەندەی ئەم دۆستایەتییە نزیکتر و خۆمانەتر بێ، داکشانەکە پتر دەبێ. تەنانەت ئەو پیاوەی کە تایبەتمەندیگەلی بە راستی بالاّتری هەیە، ئەگەر هەمیشە لەگەلّ کەسانێك هەستێ و دانیشێ کە خۆی لە چاو ئەوان پادشایە، وردە وردە دەکەوێتە سەر رێچکەی داڕمان و پێوەندیی پیاوێك کە ژنێکی لە خۆی نزمتر [لە رووی تێگەیشتنەوە] هێناوە، پتر لە هەموو پێوەندییەکانی دیکە وەها حالّەتێکی هەیە. وەها پیاوێك هەر چەندە لەوانەیە لە خۆی رازی و قایل بێ، بەلاّم بەردەوام لە بەر دەم کەفوکولّ و روانگەگەلێك دایە کە لە زەینێکی رەشۆکیانەتر یا بەرتەسکتر لە زەینی خۆیەوەن، بێگومان دەکەوێتە ژێر کاریگەرییان. ئەم کاریگەرییە خراپە، ئەوڕۆکە، جیاوازیی هەیە لەگەلّ ئەوەی لە رابردوودا هەبووە. چونکە لە ئێستادا روو لە زیاد بوونە و هۆیەکەشی ئەوەیە کە پێوەندیی رۆژانەی پیاو و ژنان لە چاو رابردوو زیاتر و کاملّترە. ئەوڕۆکە، ژیانی پیاوان لە چاو رابردوو زیاتر لە مالّێدا تێپەڕ دەبێ. لە رابردوودا سەرگەرمی، هەروەها ئیشی پیاوانیش بە جۆرێك بوو کە ئەوان بەشی هەرە

زۆری کاتی خۆیان لەگەڵ پیاوان رادەبوارد و ژنەکانیان بەشێکی زۆرکەمی ژیانی ئەوانیان (ژیانی پیاوان) پڕ دەکردەوە. بەڵام هەنووکە لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانییەت و دژایەتیی بیرورای گشتی لەگەڵ ئەو رابورادن و دۆستایەتییانەی کە لە رابردوودا زۆربەی کاتەکانی پیاوانیان دەگرت، پیاوانیان ناچار کردووە کە لە رابواردنە شەخسی و کۆمەڵایەتییەکانیاندا کاتێکی پتر لەگەڵ بنەماڵەکانیان بە سەر بەرن (با ئەوەش بڵێم کە رۆحی زاڵ بە سەر جیهانی مۆدێڕندا پیاوانی ناچار کردووە بە نیسبەت هاوسەرەکانیانەوە هەست بە بەرپرسایەتی بکەن ، لەئەنجامدا کات و ساتێکی زیاتر لەگەڵیان بن). لە هەمان کاتیشدا ئەو پێشکەوتنەی لە باری چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لە پەروەردە و راهێنانی ژناندا پێکهاتووە، بووەتە هۆی ئەوەی کە ژنان بتوانن لە بواری هزر و حەزە زەینییەکانیاندا تا رادەیەك شان بدەن لە شانی پیاوان، هەر چەندە هێشتاش لە زۆر بواراندا بە شیوەیەکی هیوابڕ لە خوار پیاوانەوەن. لەوەها رەوشێکدا، تاسە و حەزی پیاو لە هەبوونی هاوبیر و هاوڕایەك بە دەستی یەکێك دادەمرکێ کە پیاو ناتوانێ شتێکی لێ فێر بێ. کەوابوو، نە پیاو لە بری هەستان و دانیشتن لەگەڵ هاوتایانی هزریی خۆی و دۆستایەتی لەگەڵ کەسانێك کە ئامانجە مەزنەکانی ئەو دەپێکن لەگەڵ کەسێك هاونشین دەبێ کە نە دەبێتە هۆی گەشە و هەڵدانی و نە زیاتر پاڵی پێوەدنێ (هاندەدا) (مەگەر ئەوەی کە پیاو بە ناچاری، لە شوێنێکیتردا بە شوێن گەشەدا بگەڕێ). هەر بۆیەشە دەبینین ئەو پیاوە گەنجانەی داهاتوویەکی گەشیان لێ چاوەڕوان دەکرێ، زۆر جار هەر لەگەڵ ئەوەی ژن دێنن نەك پێشکەوتنیان رادەوەستێ [گەشە ناکەن]، بەڵکو بەرەو داڕمانیش دەچن. ئەگەر ژنێك یاریدەری پێشکەوتنی مێردەکەی نەبێ، لە بەرەو دواوە گەڕانەوەیدا یارمەتیدەری دەبێ. پیاو وردەوردە ئەو شتانەی لە پێش چاو دەکەون کە بۆ ژنەکەی گرینگییەکیان نییە و کەفوکوڵ و تاسەی [پیاوەکە] دادەمرکێتەوە و دواجار لەو دۆستایەتییانەی کە لەگەڵ ئارمانجەکانی رابردووی سازگار بوون و ئێستا وەلانانیان دەبووە هۆی شەرمەزاربوونی ئەو، بێزار دەبێ. ئەو جۆرە، ئیتر توانا مەزنترەکانی رۆح و مێشکی



بانگهێشت ناکرێن [ناپشکوێن]. ئەم گۆڕانە خۆپەرستانەیەی ژیانی هاوسەرێتی لە هۆگری و حەزەکاندا پێکی دێنێ دەست دەدەنە دەستی یەکتر و پاش چەند ساڵ دەیکەنە پیاوێك کە جیاوازییەك نامێنێ لە رەهەندە گرینگەکانی ژیانی ئەو و ئەو پیاوانەی بێجگە لە ئامانجی ماددی و بێهودەیی ئاسایی هیچ کات ئارمانج و ئارەزوویەکیان نەبووە.

بە رای من لە ژیانی هاوسەرێتیدا، باشترین دەرفەت و هەلومەرجەکان کاتێك دەرەخسێن کە ژن و پیاوێك بە توانای پەروەردەکراوی وەك یەك و بیروڕا و ئامانجگەلی وەك یەك، پێکەوە پەیمان ببەستن و باشترین جۆری یەکسانی لە ژیانی هاوبەشیاندا هەبێ. واتە سەربەستی و تواناکانیان وەك یەك بن و رێز لە یەکتر بگرن و بەگشتی پێوەندییەکانیان بە جۆریك بێ کە هەر کام شانازیی بە ئەویترەوە بکات و جارێك ژنەکە پیاوە بەرەو پێشکەوتن رێنوێنی بکا و جارێك پیاوەکە دەستی ژنە بگرێ. دیارە من نامەوێ باسی ژیانی هاوبەشی کەسانێك بکەم کە لەوەها هەلومەرجێکدا ژیانی هاوبەشیان پێکهێناوە. ئەو کەسانەی دەتوانن ژیانی ئەوان بێننە پێش چاویان پێویستیان بە تەوسیف نییە و ئەوانەش کە ناتوانن وا بکەن، ئەو وەسفەی من بە خەیاڵپلاوی کەسێك لە قەڵەم دەدەن کە شێت و شەیدای وەها ژیانێکە. بەڵام من بە تەواوەتی لە سەر ئەو باوەڕەم کە تاقانە شێوەی ئایدیاڵیی هاوسەرێتی ئەو شێوەیەیە و تەواوی ئەو هزر و نەریت و دامەزراوگەلەی کە بانگەشە بۆ شێوازێکیتری هاوسەرێتی دەکەن، یا وێنا و ئامانجە پێوەندیدارەکان بەوەوە بەرەو لایەکیتر دەبەن، بە هەر بیانوویەکی بکەن، کارەکەیان بێجگە لە هەوڵدان بۆ پاراستنی پاشماوەکانی سەردەمی وەحشیگەری بەو لاوە شتێك نییە. نۆژەنکردنەوەی ئەخلاقیی نەژادی مرۆڤ تەنیا کاتێك دەست پێدەکا کە بنەڕەتیترین پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بخرێنە ژێر [دەسەڵاتی] یاسایەکی [دارێژراو] لە سەر بنەمای دادپەروەری و یەکسانی و مرۆڤەکان فێر بن کە پتەوترین پێوەندیی سۆزداری لەگەڵ یەکێك بگرن کە لە بواری ماف و کولتوور و پەروەردەدا لەگەڵیان یەکسان بێ.

ئەوەی هەتاکو ئێستا گوتمان، لێکدانەوەی ئەو قازانجە بووە کە لە کۆتاییهێنان بە جیاوازیی خستنی نێوان ژن و پیاودا بە کۆمەڵگە دەبەخشرێ، بەڵام قسەمان لەو قازانجانە نەکردووە کە بە تاکەکان دەبڕێن. هەروەکو گوتمان ئەگەر تەنیا بە تاوانی ژن بوونیان ئافرەتان لە زۆربەی پوانەکان بێ بەش نەکەین و نەیانکەینە کۆیلەی پیاوان، خەزێنە هزری و پراکتیکییەکانی کۆمەڵگە دەوڵەمەندتر دەبن و ژنان و پیاوان لە هەلومەرجێکی گونجاوتر دا پێوەندی بە یەکەوە دەگرن. بەڵام ئەگەر نەڵێین ئەم کارە راستەوخۆ چ قازانجێکی بۆ هەموو خەڵك دەبێ و نیوەی کۆمەڵ لە ژیانی تایبەتیی خۆیدا چ سوودێکی مەزنی لێ وەردەگرێ، حەقی خۆمان نەداوە بەو باسە و ئەم کردە پڕبایەخەمان بچووك کردۆتەوە. مانای ئەم هەنگاوە بۆ ژنان ئەوەیە کە لە ژیانی کۆیلەیی رزگاریان دەبێ و دێنە نێو ژیانێکی سەربەست و ماقووڵانە. بەهێزترین پێداویستی بۆ مرۆڤ، پاش پێداویستییە سەرەتاییەکان، واتە خۆراك و جلوبەرگ، ئازادییە. کاتێك بێ یاسایی بە سەر کۆمەڵگەی مرۆییدا زاڵبێ، خەڵکیش داوای ئازادییەکی بەدەر لە یاسا دەکەن. بەڵام ئەگەر مرۆڤەکان لە واتای ئەرك و بەهای ئاوەز گەیشتبین، ئەو دووانە دەکەنە رێنوێنی خۆیان لە پێناو کەڵکوەرگرتن لە ئازدایدا و ئازادی سنووردار دەکەنەوە، بەڵام خەڵك، لەم حاڵەتەشدا، خوازیاری ئازادیی کرمترنین، ئەوان ناخوازن کەسانی دیکە بە ناوی نوێنەر و راڤەکاری ئەم بنەما رێنوێنیکەرانە، ویستی خۆیانیان بە سەردا بسەپێنن. بە پێچەوانە، لە کۆمەڵگەیەکدا کە عەقڵ بە باشی پەروەردە کراوە و ئەرکی کۆمەڵایەتی بەلای خەڵکەوە گرینگی و بایەخێکی زۆری هەیە، تاکەکان لە هەموو جێگەیەك زیاتر ئازادیی چالاکی نواندنیان هەیە. بەو مانایە کە هەر کەسەی بە ئازادی و بە پێی هەستی بەرپرسایەتی، و هەروەها بە پێی یاسا و ئەو سنوورە کۆمەڵایەتییانەی کە ویژدانی خۆی پێی دروستن، هەڵسوکەوت دەکا و دەجووڵێتەوە. ئەو کەسەی سەربەخۆیی شەخسی بە یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی بەختەوەری دەزانێ، ئەم سەربەخۆییە بە بەشێك لە بوونی خۆی دادەنێ. مرۆڤ کاتێك لە سەر خۆی داوەری دەکا، زۆر لەوە جیاوازە کە لە سەر کەسانی



دیکە داوەری بکا و ئەم داوەریکردنەش کە لە عادەتەوە سەرچاوە دەگرێ گەورەترین جیاوازییەکە، کە لە داوەریکردندا دێتە پێش. بەڵام کاتێك دەبیستین کەسانی دیکە سکاڵێیان هەیە لەوەی کە سەربەست نین، واتە لەوەی کە ویست و ورەیان کاریگەرییەکی لە سەر بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان نییە، حەز دەکەین بپرسین لە چ شتێك ناڕاین؟ بە کردەوە چ خەسارێکیان وێ کەوتووە و لە رێکوپێککردنی کاروبارەکانیاندا چ کەموکورتییەك هەبووە؟ و ئەگەر ئەوانەی وەزاڵە هاتوون نەتوانن وەڵامێك بەم پرسیارانە بدەنەوە کە ئێمە قایل بکا، سکاڵێکانیان پشتگوێ دەخەین و بە گلەیی و گازەندەی ئەو کەسانەیان لە قەڵەم دەدەین کە بە هەموو شتێك هاواریان لێ هەڵدەستێ و بە هیچ شتێك قایل نابن. بەڵام کاتێك مرۆڤ دەیەوێ لە سەر خۆی بکەوێتە داوەریکردن، پێوەری داوەریکردنەکەی تەواو جیاوازە. لەم حاڵەدا، تەنانەت، ئەگەر مامۆستایەکی بێوێنە رێنوێنی بکا و بە باشترین شێوە کاروبارەکانی بۆ راپەڕێنێ، دیسانیش هەست بە رزامەندی ناکا، لە بەر ئەوەی کە نەبوونی دەسەڵاتی بڕیاردان زۆر بە توندی ئازاری دەدا و دەنگی هاوار و سکاڵای بەرز دەکاتەوە. بە جۆرێك کە رەخنە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیش دەگرێ و باس لە خراپبوونی بەڕێوبردن دەکا. ئەو مەسەلەیە لە سەر نەتەوەکانیش راستە. ئایا هاووڵاتییانی وڵاتێکی ئازاد ئامادەن بە نرخی وەلانانی ئازادی ببنە خاوەنی بەڕێوەبەرێتییەکی شیاو و لێوەشاوە؟ تەنانەت ئەگەر یەکێك لە سەر ئەو باوەڕەش بێ کە دەکرێ بەڕێوەبەرێتییەکی شیاو لە نێو خەڵکێکدا دەست دەکەوێ کە لە ژێر فەرمانی ویستو ورەی کەسێکی تر دان نەك هی خۆیان، ئایا دیسانیش ئەوە بە باشتر نازانن کە خەڵك بە بەرپرسیارەتییەوە چارەنووسی خۆیان دەسنییشان بکەن و ئەو هەڵنەسەنگێندراوی و کەموکۆڕییانە بە گیان بکڕن کە لە بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵدا پێش دێنەپێش؟ ئیزن بدەن وەها کەسێك دڵنیا کەینەوە لەوەی کە ئافرەتانیش تەواو لەگەڵ ئەو هاوبیرن. تەواوی ئەو قسانەی لە سەردەمی هیرۆدۆتەوە هەتا ئێستا لەمەڕ قازانجەکانی حکوومەتی ئازاد وتراون و نووسراون (بۆ وێنە، ئەوەی کە ئازادی تەواوی تواناکانی

مرۆڤ دەپشكوێنێ، ئاوەز و كەفوكوڵی مرۆڤ لەگەڵ ئامانجگەلێكی گەورەتر و بە نرختر ئاشنا دەكا، ورەی بەكۆمەڵ بە هێزتر دەكا، بەجێهێنانی ئەرك دەخاتە دوورە دیمەنێكی هێمنتر و هەراوتر و تاك وەكو بوونێكی ئەخلاقی و كۆمەڵایەتی و مەعنەوی دەكاتە خاوەن پێگەیەكی بالاتر) هەروەك دەربارەی پیاوان راستە لە سەر ژنانیش هەر راستە. ئایا ئەو قازانجانەی ئازادی بە مرۆڤیان دەبەخشێ كاریگەرییەكیان لە سەر بەختەوەریی ئەو نییە؟ هەر ئەوەندە بەسە پیاوان وەبیریان بێتەوە كە تێپەڕاندنی منداڵی، واتە ئەو قۆناخەی لە ژێر چاوەدێریی و سەرپەرشتیاریی كەسانێكی گەورەتر دابوون (هەر چەندە دڵسۆز و خۆشەویستیش بوون) و هاتنیان بۆ نێو قۆناخی پێگەیشتوویی و بەرپرسیارەتی وەرگرتن چ مانایەكی بۆ ئەوان هەبوو. ئایا وەك ئەوە وانەبوو كە وایان هەست نەدەكرد كە هێزی ژینییان، وەكو مرۆڤێك، دوو هێندە بووە.؟ ئایا پیاوان پێیان وایە ژنان خاوەنی وەها كەفوكوڵێك نین؟ بەڵام ئەوە حەقیقەتێكی راچڵەكێنەرە كە دابین بوون و بریندار بوونی هەستی تاك هەر چەندە بەلای پیاوانەوە زۆر گرینگە بەڵام كاتێك نۆرە دەگاتە خەڵكیتر بە لای زۆربەی پیاوانەوە گرینگی یەكی ئەتۆی نییە و ئەم هەستەوەرییانەش وەكو بوارێك یا پاكانەیەك بۆ ئاكاری تاكەكان، زۆر لە هەستەوەرییە سروشتییەكانی مرۆڤ پتر پشتگوێ دەخرێن و لەوانەیە لە بەر ئەوەش بێ كە پیاوان لە ناخی خۆیاندا هەستەوەرییەكان تێكەڵی شتی دیكە دەكەن و ناوی دیكەیان لە سەر دادەنێن، بە جۆرێك كە خۆیان زۆر جاران نازانن ئەم هەستەورییانە چ كاریگەرییەكیان لە سەر ژیانی تایبەتی خۆیان هەیە؟ دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین كە كاریگەری و هێزی ئەم هەستەوەرییانە لە ژناندا بە هیچ شێوەیەك لە پیاوان كەمتر نییە. ژنان بە چەشنیك پەروەردە دەكرێن كە سروشتیترین و بێ خەوشترین لایەنی دەرەوەیی ئەم هەستەوەرییانە دەشارنەوە، بەڵام وزەی دەروونییان هەروەك خۆی دەمێنێتەوە و بە شێوەیەكی دیكە دەردەكەوێ. هەر زەینێكی بەهێز و چالاك ئەگەر لە ئازادی بێبەری بكرێ، هەوڵدەدا بە دەسەلات بگا، بەو مانایە كە ئەگەر نەهێڵن مرۆڤ بە سەر خۆیدا فەرمانڕەوایی بكا، كەسایەتیی خۆی لەوەدا دەردەخا كە گرینگی



بە زاڵبوون بە سەر ئەوانیتردا. بدات: ئەگەر ئیزن نەدەن مرۆڤەكان بوونێكی سەربەخۆیان هەبێ و ئەوان بتوانن مل بۆ ئۆتۆریتەی ئەوانیتر راكێشن، لەم حاڵەتەدا، ناچاركردنی ئەوانیتر بەوەی كە سەر بۆ ویست و داخوازییەكانیان دانوێنن، پڕبایەخ و گرینگ دەبێ ـ كاتێك كە ناكرێ هیوات بە ئازادی هەبێ، بەڵام دەكرێ بە دەسەلاتت هەبێ، دەسەلات دەبێتە ئامانجی مەزنی مرۆڤ. كەسێك كە ئەوانیتر ئیزن نادەن خۆی كاروبارەكانی خۆی راپەڕێنێ، بۆ گەیشتن بە مەبەستەكانی، دەست لە كاروباری ئەوانیتر وەردەدا (هەڵبەت ئەگەر بتوانێ). هەر بۆیەشە ژنان ئەوەندە گرینگی بە جوانی و جلوبەرگ و رواڵەتی خۆیان دەدەن و تەواوی ئەو چەپەڵییانەی كە بەرهەمی دژەئەخلاقی و رواڵەت پەرەستین لەوەڕا سەرچاوە دەگرن ـ دەسەلات پەرەستی و ئازادی پەرەستی تا هەتایە دژی یەكن. لەو شوێنەی كە خەڵك خاوەنی كەمترین ئازادین، دەسەلاتپەرەستی لە هەموو جێیەك پتر، بە تەوژمترە و لەگەڵ كردەوەی نائەخلاقییە. هۆگریی تاكەكان بەوەی كە بە سەر ئەوانیتردا زاڵبن تەنیا كاتێك گەندەڵیی لێ ناكەوێتەوە كە هەر كام بتوانێ بەبێ زاڵبوون بە سەر ئەویتردا ئاسوودەیی و هێمنی وەدەست بێنێ. ئەوەش تەنیا كاتێك وەدیدێ، كە باوەڕ بە ئازادی لە ناخی هەر كام لە تاكەكاندا بووبێتە بنەمایەكی پتەو.

بەڵام تەنیا ئەو بەها و شان و شكۆیەی كە مرۆڤ لە خۆیدا هەستیپێدەكا، نابنە هۆكاری بەختەوەر بوونی ئەو. سەرەڕای ئەوە، ئەو دەبێ بتوانێ سەربەستانە رێبازی خۆی و تواناكانی خۆی بپشكوێنێ و ئەگەر بەو شتە گرینگە نەگا، هەست بە چارەڕەشی دەكا و ئەوەش شتێكە كە ژنان بە تایبەتی لێی بێ بەشن. بۆ مرۆڤ زۆر گرینگە كە بتوانێ چالاكانە كەڵك لە تواناكانی وەربگرێ و پاش نەخۆشی و هەژاری و جەنایەت، هیچ شتێكی دیكە بە ئەندازەی نەبوونی ئەم تواناییە هەڕەشەی نەمان لە بەختەوەری تاك ناكا. ئەو ژنانەی ئاگایان لە بنەماڵەی خۆیانە، هەتا ئەو كاتەی كە ئەو بەرپرسیارەتییەیان لە ئەستۆیە، وەها دەرفەتێكیان لە بەر دەستە و زۆربەی كات لە كارەكەیان قایلن، بەڵام ئەو ژنانەی وەها دەرەفەتێكیان بۆ نەلواوە، ( ئەو كارەی ئەوانیتر بە گاڵتەوە دەڵێن ژنان تەنیا بۆ ئەوە

خولّقاون) و ژمارەیان رۆژ بە رۆژ لە زیاد بوونە دەبێ چ بکەن؟ ئەو ژنانەی منداڵەکانیان لە دەست داوە یا لە مەودایەکی دوور لە ئەوان دەژین یا منداڵەکانیان ژیانی هاوبەشیان پێکهێناوە و لێیان جوێ بوونەتەوە دەبێ چ بکەن؟ زۆرن ئەو پیاوانەی کە پاش تەمەنێك هەوڵ و تێکۆشان و چالاکی، کاتێك دەست لە کار دەکێشنەوە و هیوادارن پشوو بدەن و چێژ لە ژیانیان وەرگرن، ناتوانن لە بڕی ئەو هۆگرییانەی جارانیان خۆ بە شتی تازە و هۆگری و سەرگەرمیی نوێوە بخافڵێنن هەر بۆیەش ژینیان لە هەر چەشنە چالاکییەك بەتاڵ دەبێتەوە و هەستی بێهودەیی و خەمۆکی و دواجار مەرگی ناوەخت بەرۆکیان دەگرێ. بەڵام هیچ کەس گرینگی نادا بەو هەموو ژنەی لەگەڵ ئەمجۆرە گرفتانە دەستەویەخەن. ئەو ژنە شیاوو فیداکارانەی کە ئەو ئەرکەی بە نیسبەت کۆمەڵگەوە هەیانبووە بە جێیان گەیاندووە، واتە منداڵەکانی خۆیانیان گەیاندۆتە تەمەنی ژنێتی و پیاوێتیی و بنەماڵەیان کە پێویستیی پێیان بووە بەڕێوەبردووە و ئێستا تاق کەوتوونەتەوە و ئیتر ئەو کارەی کە ئەوان شارەزایی زۆریان تێدا دەستەبەر کردبوو پێویست نییە، ئەم ژنانە توانایی چالاکییان دانەبەزیوە، بەڵکو هیچ کارێك نییە بیکەن، مەگەر ئەوەی کە کچ یا بووکەکەیان داوایان لێ بکەن ئێستاش هەمان ئەو ئەرکانە بەڕێوەبەرن کە لە سەردەمی گەنجێتیدا لە ئەستۆیان بوو. بێگومان زۆر ئەستەمە بۆ مرۆڤ کە لە تەواوی ژیانیدا ئەرکێك بەڕێوەبەرێ کە کۆمەڵگە بۆی دەستنیشان کردووە و ئێستاش کە پیر بووە تووشی وەها چارەنووسێك بێ. بۆ ئەمجۆرە ژنانە، هەروەها ئەو ژنانەی وەها دەرفەتێکیان بۆ نەڕەخساوە (و زۆربەیان بە درێژایی تەمەن بەو حەژمەتەوە دیتوویانە کە لە چ ئیشگەل و چالاکیگەلێك بێبەش بوون)، بە گشتی تەنیا لە دوو بواردا دەرفەتی چالاکی هەیە: ئایین و کاروباری خێرخوازی. بەڵام ئایینی ئەوان هەر چەندە لەوانەیە زۆر هەستبزوێن بێ و ڕێوڕەسمەکەی تێروتەسەل بێ. ئایینی بزووتن و چالاکی نییە، مەگەر لە فۆرمی کاروباری خێرۆمەندی و چاکەکاریدا. و سەبارەت بە کاروباری خێرخوازانەش دەبێ بڵێین کە زۆربەی ژنان بۆ ئەو کارە گونجاون، بەڵام بۆ ئەوەی چالاکییەکان بە کەڵك و لە کارتێکەریی خراپ بە دوور بێ دەبێ، لە بوارگەلی جۆراوجۆردا پەروەردە بکرێن و خاوەنی زانیاری و هێزی هزری و کارامەیی بواری ڕێکخستن بن. لە نێو پۆستەکانی بەڕێوەبەرێتیی



حکوومەتدا کەمتر ئیشێك هەڵدەکەوێ کە نەگونجاو بێ بۆ ئەو کەسەی دەتوانێ سەرکەوتوانە کاروباری خێرۆمەندی راپەڕێنێ. لەم بارەوە هەروەها وەك بوارەکانی دیکە (زیاتر لە هەموان لە پەروەردەکردنی منداڵان دا)، ئەو ئەرکانەی دەکەونە ئەستۆی ژنان بە جوانی بەڕێوە ناچن، مەگەر ئەوەی کە ژنان پەروەردەی گونجاو و شیاویان هەبێ، پەروەردەیەك کە لە ئێستادا لێی بێبەرین و بەم هۆیە کۆمەڵگە خەساری گەورەی وێدەکەوێ. لێرەدا دەمەوێ سەرنجتان بەرەو شێوازێك راکێشم کە زۆربەی خەڵك بۆ سەلماندنی کەمتوانایی ژنان پشتی پێ دەبەستن، کە ئەویش خستنەڕووی وێنایەکی گاڵتەجارانەیە لەو شتەی کە ئەو کەسانە کە کەیفیان پێی نایە و ئەوان بە لایانەوە ئەوە هاسانترە کە بە چەکی گاڵتەجاڕییەوە بۆی بێنە مەیدان هەتا ئەوەی کە بە چەکی بەڵگەهێنانەوە. ئەوەش لە راستیدا تەنیا چەکێکە کە، لە زۆربەی ئەو باسو. خواسانەدا بە کاردەهێنرێ کە لە سەر کەمتوانایی ژنان دێنە گۆڕێ. کاتێك ئەم مەسەلەیە دێتە گۆڕێ کە دەکرێ لە توانای بەڕێوەبەرێتیی و بیروبۆچوونی دووربینانەی ژنان لە دامودەزگە حکوومییەکاندا کەڵك وەرگیرێ، ئەم جۆرە کەسانە، هەستی گاڵتەچێتییان دەبزوێ و بە قەشمەرییەوە پەرلەمان یا کابینەیەك دێننە بەرچاو کە، کیژۆڵەی مێرمنداڵ یا ژنانی بیست و دوو ساڵانە تێیدا دانیشتوون، وەك بڵێی هەموانیان پێکەوە لە میوانخانەی پەرلەمانی رەشۆکان (عوام)ەوە گواستۆتەوە ئەوێ. ئەوانە لە بیریان دەچێتەوە کە هیچ کات پیاوان لەوەها تەمەنێکدا لە سەر کورسیی پەرلەمان دانانیشن و بەرپرسایەتییەك لە گۆڕەپانی سیاسیدا وەئەستۆ ناگرن. عەقڵی ساخ بەو کەسانە دەڵێ کە ئەگەر قەرار بێ وەها بەرپرسایەتیگەلێك بە ژنان بسپێردرێ، ئەو ژنانەش ئەوانە دەبن کە ژیانی بنەماڵەییان زۆریان سەرقاڵ ناکا یا ئەوەی کە ئیشکردن و کەڵك وەرگرتن لە تواناکانیان پێ باشترە لە هاوسەرگیری (هەروەکو ئێستاش گەلێك ئافرەت هەن کە ئەوەندە کاروبارە ئابڕوومەندانەیەی دەستیان پێی رادەگا پێیان لە هاوسەرگیری باشترە)، ئەم جۆرە ئافرەتانە لە باشترین ساڵەکانی گەنجێتییدا هەوڵیانداوە بە تواناگەلێك بگەن کە لە بەرپرسیارەتییە دڵخوازەکانیاندا یارمەتیدەریان بێ. سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە زۆربەی ئەو ژنانەی دەستیان بە بەرپرسایەتییە گرینگەکان رادەگا بێوەژنەکان یا ژنانی تەمەن چل یا پەنجا ساڵن کە ئەو ئەزموونی ژیان و

توانای بەڕێوەبەرێتییەی لە بنەماڵەیاندا وەدەستیان هێناوە تێکەڵاوی موتاڵاێ و پەروەردەگەلی شیاو دەبن و بەشێوەی پەرش و بڵاو دەخرێنە بەر دەستی کۆمەڵگە.

هیچ وڵاتێکی ئەوروپایی نییە کە بە تواناترین پیاوەکانی کەڵکیان لە راوێژی ژنانی زیرەك و بە ئەزموونی بوارە گشتی و تایبەتییەکان وەرنەگرتبێ و بە دڵ سوپاسیان نەکردبێت. لە دامودەزگە دەوڵەتییەکانیشدا گەلێك بیاڤی گرینگ هەن کە کەمتر پیاوێك لەبەرێوەبردنیاندا دەتوانێ شان بدا لە شانی ژنان. یەکێك لەم ناوەندانە رێکخستنی وردی گوژمەکانە[1]*. بەڵام ئێمە باس لە پێویستیی کۆمەڵگە بە خزمەتی ژنان لە بوارە گشتییەکاندا ناکەین، بەڵکو باس لە ژیانێکی هیوابڕ و تاڵ دەکەین کە زۆربەی ژنان دەبێ تێیدا بن. ژیانێك کە بە هۆی بێبەشبوونیان لە بەکارهێنانی تواناکانیان لە بوارێکی بەربڵاوتر لە بنەماڵەدا، بە سەریاندا سەپاوە، وێڕای ئەوەش، چالاکیی لە سنووری بنەماڵەشدا بۆ هێندێ کەس بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ و بۆ هەمیشە رێك ناکەوێ. بێگومان هۆگری بەو ئیشەی کە تاك هەموو رۆژێ لەگەڵی دەژی یەکێکە لە گرینگترین فاکتەرە کاریگەرییەکان لە سەر بەختیاریی ئەو. بەڵام بەشێکی زۆری نەژادی مرۆڤ یا هیچ مەرجێکی ئەم بەختەوەرییەیان پێ نەبڕاوە یا بڕێکیان پێ گەیوە و بە نەبوونی ئەم مەرجە زۆربەی ژیانەکان لێوڕێژن لە ناکامی و بێ هیوایی. لە حاڵێکدا لانیکەم بە رواڵەت مەرجەکانی دیکەی بەختەوەرییان لە بەر دەستە. بەڵام ئەگەر هێشتا کۆمەڵگە نەیتوانیوە بە سەر بەشێك لە گرفتەکانیدا زاڵبێ و بەم هۆیەوە هێندێ لە شکست و ناڕێکییەکان مسۆگەرن، گرفتگەلێکیش هەن کە کۆمەڵگە خۆی لە خۆی بار کردوون. زۆربەی پیاوان بە هۆی نەزانیی گەورەکانیان یا بێ ئەزموونیی خۆیان یا لە بەر نەبوونی ئیمکاناتی پێویست تووشی کارێك دەبن کە هەتا مردن بە زۆری دەیکەن، لە حاڵێکدا دەیانتوانی روو لە ئیشگەلێکی دیکە بکەن و ژیانیان بەختەوەرانە بێ. بەڵام ئەوە یاسا و نەریتە هاوتەرییەکانە کە وەها چارەنووسێك بە سەر ژناندا دەسەپێنن. هەروەکو لە وڵاتانی دواکەوتوودا رەنگ و رەگەز و ئایین و لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا "نەتەوە" فاکتەری بێبەشی هێندێ لە پیاوەکانە، بۆ تەواوی ژنان رەگەزایەتی (مێوینە بوون) هۆکاری ئەو

[1] ـ تێچوو، بودجە، هەزینە.



بێبەشیەیە: بێبەشبوونی بێ ئەملاوئەولا لە نزیك بە تەواوی ئیشگەلی ئابڕوومەندانە. جگە لەو کارانەی کە ئەوانیتر ناتوانن بەرعودەی بن یا ئیشگەلێك کە ئەوانیتر لە ئاستی شان و شکۆی خۆیانیدا نابینن. ئەو ئازارانەی لەم رێگەدا بە نسیبی تاك دەبن هاودەردییەکی ئەوتۆ پێك نایەنن، چونکە دەگمەنن ئەوانەی دەزانن کە هەستی بێهودەیی (پووچی) چ خەمێکی دڵتەزێنە. ئەم هەستە هەر رۆژەی ژمارەیەکی زیاتر لە ئافرەتان دەگرێتەوە. چونکە ژنان هەتا زیاتر پێدەگەن، نەگونجاوی و ناکۆکیی نێوان هزر و تواناکانیان لەلایەك و ئەو دەرفەتانەی کۆمەڵگە بۆ چالاکی نواندن بۆیان دەڕەخسێنێ، پتر دەبێ.

کاتێك دەبینین بێبەشیی نیوەی کۆمەڵی مرۆڤ لە مافە مرۆڤایەتییەکانیان چ ئازار و کوێرەوەرییەکان تووش دەکا (لەلایەکەوە لە هیوا بەخشترین و بەرزترین چێژە تاکەکەسییەکان بێبەشیان دەکا و لەلایەکیشەوە ترس و هیوابڕاوی و ناڕەزامەندیی قووڵ لە ژیان لە جێگەیان دادەنێ) هەست دەکەین کە لەنێوان تەواوی ئەو وانانەی دەبێ مرۆڤەکان فێری بن بۆ ئەوەی بتوانن بەرەنگاری ئەو کەموکورتییانە ببنەوە کە بلێی و نەلێی لەم گۆی زەوییەدا تێکەڵی وجودیان بوون، هیچ وانەیەك لەوە گرینگتر نییە کە نابێ بە ئێرەیی و بەرچاوتەنگی و پێشداوەریکردنەکانی خۆیان، چەپەڵییەکی نوێتر بخەنە سەر ئەو چەپەڵی و دزێوییانەی سروشت بە سەر مرۆڤیاندا دەسەپێنێ. ترسە بێجێیەکانی مرۆڤ، تەنیا دەبنە هۆی ئەوەی چەپەڵییە سامناکترەکان جێگەی ئەو شتانە بگرنەوە کە مرۆڤ لە خۆوە لێیان دەترسێ. چونکە هەر ئاستەنگەلێکی بە سەر "هاوڕەگەزەکاندا" بسەپێ، هۆکارێکە، کە بە لرفەترین کانیاوی بەختەوەری هەڵدەچۆڕێنی و بە پیت بوونی تەواوی ئەو شتانەی مانا و بەها بە ژیانی مرۆڤ وەکو تاك، دەبەخشن، تا ئاستێك دادەبەزێنێ کە وەك بلێی هەر نەبوون – هەڵبەت بەرپرسایەتیی تاك لە هەمبەر ئەو خەسارە واقیعییەی کە کردەوەکانی لە کەسانی دیکە دەدات، ئازادیی ئەو سنووردار دەکاتەوە، بەڵام ئەوە شتێکی دیکەیە.

**١٦ی ئۆکتۆبری ٢٠٠٧**

**کۆیە ـ قەڵا**